# خاڵ

گۆڤارێکی هزریی
ڕۆشنبیریی وەرزییە
ژمارە (٢٨) ئایاری
٢٠٢٠




بە سپۆنسەری
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی



خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
**تۆفیق کەریم**
٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
**tofeqkarem@yahoo.com**





**سایتی گۆڤاری خاڵ: www.xallkurd.com**

**تیراژ:** ١٥٠٠

**نرخ:** ١٥٠٠ دینار

# لەم ژمارەیەدا

تەوەری ژمارە: [ناوەندەکانی خوێندن لە کوردستان و کاریگەرییان لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا]





# تەوەری داهاتوو

## شارسازیی و کولتوری شار

رەنگە جۆرێک لە کۆدەنگیی لەنێو پسپۆڕانی بواری کۆمەڵناسیی شار و جوگرافیادا هەبێ لەسەر ئەوەی کە شار ئەو پانتاییە جوگرافییەیە کە خەڵکانێکی زۆری فرە کار و مەشرەب جیاواز و خاوەن بەرژەوەندی و روئیای جیاوازی تێدا دەژین، بازرگانی و پیشەسازیی کاری سەرەکییانە، ئەمەش یەکێکە لە جیاکەرەوەکانی لە لادێ یاخود گوند. لە هەمان کاتدا زەرورەتی پیشەگەلی جیاواز دێنێتە ئاراوە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە جۆراوجۆرەکان، لەمەوە پیشەسازیی سەرهەڵئەدات و هاوکاتیش بازرگانی پەرەئەسێنێ، هەم بۆ دەستخستنی ماددەی خاو و هەم بۆ ساغکردنەوەی کاڵا. لەمەوە چین و توێژی جیاواز سەرهەڵئەدەن و فرەیی و ئاڵۆزیی دەبێتە سیمایەکی دیاری شارنشینان کە پێویستی بە دەزگا و دامەزراوەی سیاسیی و کارگێڕیی هەیە تاوەکو ئیدارەی ئاڵۆزییەکان بکات بەپێی دەستور و قانون، ئەمانە هەمووی لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی سیاسییدایە کە خۆی لە بوونی کەمینەیەکی دەسەڵاتدار و گەلدا ئەبینێتەوە. شار بەو جۆرەی لێی دواین، رەگی لە مێژوودا هەیە و رەنگە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان نموونەی دیار بن لە مێژووی کۆندا، بە دوای ئەواندا بنیاتنانی شار دەبێتە سیمایەکی گرنگی شارستانەتیی ئیسلامیی کە لە ماوەی تەمەنیدا، لە دوای مەدینەی رەسولەوە کە بنەڕەتترین هەنگاوی دامەزراندنی دەوڵەت و شارستانەتیی بوو، چەندین شاری گەورەی وەک دیمەشق و بەغدا و قاهیرە و ئەندەلوس و ئەستەمبووڵ لەبەر رۆشنایی سەرچاوە فیقی و عیمرانی و علمییەکانی ئیسلامدا بنیاتنران.

لە سەد ساڵی رابردوودا شارسازیی و کولتوری شارنشینی لە بەشێکی دیاری جیهانی ئیسلامیدا لە دۆخێکی نەخوازراودان، پێویستە کار بکرێ بۆ سەرلەنوێ ژیانەوەی شار و ژیاری ئیسلامیی.

هێڵە گشتییەکانی ئەم باسە:

- شار چییە؟ چۆن بنیات ئەنرێت؟ کولتوریی شارنشینی چییە؟ - مەترسیی بەلادێبوونی شار چییە و چۆن ئەڕەوێتەوە؟
- مێژووی شارسازیی لە کۆنەوە تا ئەزموونی پانوپۆڕی ئیسلامیی؟
- شارسازیی و کولتوری شار لە ئەزموونی کورددا؟
- ئاستەنگەکانی بەردەم بە شارنەبوونی ژیان و ژیاری کوردی.
- ڕۆڵی شارنشینی لە گەشەسەندنی ئەدەب و هونەر و پێدانی ناوەرۆک و بابەتی نوێ پێیان.
- ئەزموونی کورد لە پرۆسەی بنیاتنانی شاردا، چ لەسەردەمی میرنشینەکاندا، میرایەتی بابان بەتایبەتی، یاخود ئەزموونی هەرێمی کوردستان.

ئەم خاڵانە تەوەری ژمارەی داهاتووی گۆڤاری خاڵ ئەبێت.

تا ٧/١٥ دەتوانن بابەتەکانتان بنێرن بۆمان، داواکارین لەنووسەرانی بەڕێز ڕەچاوی ڕێنماییەکانی گۆڤاری خاڵ تایبەت بەنووسینی بابەت بکەن.

# تەوەری ژمارە

## ناوەندەکانی خوێندن لە کوردستان و کاریگەریان لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا

لە مێژووی گەلی کوردستاندا، وەک مێژووی گەلانی دونیا، خوێندەوارانی کورد ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا، خوێندنگە و ناوەندە زانستییەکان لانکەی پێگەیاندنی ئەو زانا و خوێندەوارانە بوون کە گۆڕانکارییان ئەنجامداوە، بۆیە دڵسۆزان و خەمخۆران هەمیشە هاواریان بۆ پەرەپێدان و خزمەتکردنی ئەم بوارە بووە, هەتاکو لە گەلانی دونیا دوانەکەوین، بۆیە (خاڵ) ئەو ناونیشانەی سەرەوەی کرد بە تەوەری ژمارە و ئەم خاڵانەی خستە بەردەم توێژەر و خوێندەوارەکانمان:

- ڕۆڵی ناوەندی خویندن لە پێشخستنی کۆمەڵگە.
- ناوەندەکانی خویندن لە کوردستان، ئاستیان و ڕۆڵیان .
- کاریگەری تەکنەلۆجیا لەسەر کایەی خوێندن.
- خویندن لە نێوان دوینێ و ئەمڕۆدا .
- پەیوەندی نێوان خویندن و پەروەردە .

ئەم بابەتانە و کۆمەڵێک توێژینەوەی دیکە بوون بە تەوەری ئەم ژمارەیە, بە سوپاسەوە کۆمەڵێک لە مامۆستایان و شارەزایانی بوارەکە هەریەکە بە توێژینەوە و نووسینی تایبەتی زانستی لێکۆڵینەوەی وردیان لەو بارەوە بۆ ناردووین، گۆڤاری (خاڵ)یش بە سوپاسەوە کردوونی بە تەوەری ئەمجارە و لەگەڵ کۆمەڵێک بابەتی گشتیدا دەیخاتە بەر دیدەی خوینەوارن، بەو ئومێدەی تینوێتیتان بشکێنێت.

# سیاسەتگوزاریی پەروەردەیی
## وەك مەرجێكی بنەڕەتیی سەروەریی






**پرۆفیسۆر د. صباح بەرزنجی**

سەرۆكی سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی.

سەرۆكی بەشی پەروەردەی ئیسلامیی لە كۆلیجی زانكۆیی گۆیژە لە سلێمانی.

لە جیهانی ئەمڕۆدا، زۆر قسە لە سەر زانست و لەهەمان کاتدا لە نێوان گەلان و وڵاتاندا، بەراوردی توانا و پێشکەوتنی زانستی دەکرێ. ئەوەی جێگای سەرنجە لەگەڵ بوونی قەناعەتی تەواو بە گرنگیی زانست لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، بە هەڵاواردنی یەک دو وڵات کە خەریکن پێشدەکەون، پێشکەوتنێکی ئەوتۆ لە بواری زانست بەتایبەت زانستی تەکنیکی و سروشتیدا بەرچاو ناکەوێت.

هۆکاری جۆراو جۆر هەیە بۆ ئەم پاشکۆیەتی و دواکەوتنە، رەنگە لە هەمووی کاریگەرتر ئەوەبێت، کە ئێمە هێشتا خاوەنی سیاسەتگوزاریی پێویست و لەبار نین بۆ پەروەردە و فێرکردن و پلانی زانستخوازیی لە وڵاتەکانماندا. بەتایبەت لەو رووەوە کە هێشتا بە باشیی هەست بە مەترسیی ئەم پاشکەوتن و پاشکۆیییە ناکەین، لە جیهانێکدا کە زانست و تەکنۆلۆژیا قسەی یەکەم دەکەن و دەتوانن هەموو شتێک بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و هەر وڵاتێک پشکی باشی لەم رەسیدە مەعریفییە نەبێت، چارەنووسی خراپ و تیاچوون و کوژانەوەی چراکانی چاوەڕێی دەکات.

لە بواری پەروەردەدا، مامۆستا، خوێندکار، پرۆگرام، ژینگەی پەروەردەیی و کارگێریی کارامە هەمووی پێویستن و بە لاوازیی هەرکام لەم توخمانە رەوتی زانست و زانیاریی روو لە شکستە و ئەنجامێکی دڵخۆشکەر ی لێ ناکەوێتەوە. بەڵام لەمانە هەمووی گرنگتر بوونی سیاسەتگوزارییەکی دروست و هاوچەرخ و زانستییە لە وڵاتدا کە چۆن سیستەمی پەروەردەیی بەرەو داهێنان و پێشکەوتن رێنمایی ببەین، بە سوودوەرگرتن لە هەموو ئەو وزە و تواناییانەی بەردەستن، واتە لە مامۆستا وە بگرە تا پرۆگرام و قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگا و سەرچاوەکانی زانست و بەهرە و سەرچاوە سروشتیی و مرۆییەکان و بەڕێوەبەرانی کارامە و بەرچاو روون. لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەم یەک بەیەک باسی رەگەز و توخمە بنەرەتییەکانی سیاستەگوزاریی پەروەردەیی بکەم، بەو بڕوا و متمانەوە کە بوونی هەرکامێک لەمانە لە ئاستە بەرزەکەیدا هەنگاوێک و چەندین پلە لە ئاستی سەروەریی و سەربەخۆییمان بەرز دەکاتەوە.

## یەکەم: سیاسەتگوزاریی پەروەردەیی

سیاسەتگوزاریی پەروەردەیی بریتییە لە هەموو ئەو پرنسیپ و بریارە سیاسییانەی کە حکوومەت سەبارەت بە خوێندن دایدەنێت، وێڕای هەموو ئەو یاسا و رێسایانەی بۆ سیستەمی پەروەردە دانراون. بەم پێناسەیە بێت هەرچی پلان و بڕیار و روانگەی فەرمیی حکوومەتە سەبارەت بە مامۆستا و قوتابی، پرۆگرام و قوتابخانەکان، بەڕێوەبردن و ئامادەسازیی، تەنانەت ئابووریی و بژێوی خێزانەکان و داهاتووی دەرچووان دەچنە ناو سیاستگوزاریی پەروەردییەوە. جگە لە فەلسەفەی حوکمڕانی وڵات کە رۆڵێکی یەکلاکەرەوە دەبینێت لەم پرۆسەیەدا. واتە ئەگەر کاری حکوومەت هەمووی ببەستین بەم لایەنەوە کارێکی ناشایستەمان نەکردووەو حکوومەتیش ئەگەر هەموو هەوڵ و کۆششێکی بۆ دارشتنی سیاسەتێکی فراوان و تۆکمەی پەروەردەیی تەرخان بکات هەڵەی نەکردووە.

ئەنجامی پەروەردەی تۆکمە و زانستییانە و کارگێریی لێهاتوو دوای چەند ساڵێک لە هەموو سێکتەرە زیندووەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵدا رەنگدەداتەوە. لە تەندروستیی و فەرمانگە و بازاڕەوە بیگرە تا مزگەوت و خوێندنگا و کۆمپانیا و حکوومەت و حیزبایەتی و کاری خێرخوازیی. لە هەمو بوارەکاندا پەروەردە باش یا خراپ رۆڵی بنەڕەتی هەیە، پەروەردەی تاکی زانا و دانا و خۆبەکەمزان و و خزمەتگوزار و بەخشەر و داهێنەر پاشان کۆمەڵگای هەڵگری هەمان خەسڵەت و رواڵەت و جەوهەر و مایە، گەورەترین کارێکە کە دەسەڵاتی سیاسیی دەشێت بیکاتە ستراتیژ

و هەموو بوودجەی وڵاتی بۆ تەرخان بکات، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، واتە دەسەڵات بۆخۆی سەرپشکە لەوەی لە کوێوە دەست بەکارەکانی بکات، ئایا کار بۆ مسۆگەرکردنی داهاتووی گەل و وڵات و شکۆفایی توانا و وزە خوداکرد و سروشتییەکان دەکات، یان دەیەوێت درێژە بەمانەوەی دۆخی ئێستا و پاشکۆیەتی و دارمانی یەک لەدوای یەکی بنیاتی هزریی و شارستانیی و ئابووری و پەروەردەیی بدات، ئەمە راستییەکی بێ پێچ و پەنایە و لە واقیعی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کارکردی رۆژانەی سەرکردەکاندا بەرچاو دەکەوێ. هەرکاتێک زۆرینەی بووجەی وڵات سەرفی دەزگا ئەمنی و ئیستیخباریی‌یەکان و دامەزراوە حیزبییەکان کرا ( کە هەڵبەت ئەمانەش لە سنووری گونجاوی یاسایی خۆیاندا دەبێ حسابیان بۆ بکرێ و ببنە دامەزراوەی میللی و نیشتمانی ) ئەوسا بواری پەروەردە و زانست دەبنە تەنها رووکەش و جۆرێک لە یاریکردن بە زانست و پەروەردە و هیچ جۆرە داهێنان و ئەفراندنێکی لێناکەوێتەوە.

### دووەم: مامۆستایەتی

پێگەیاندن و ئامادەکردنی مامۆستای زانا و دانا و کارامە بۆ بەرێخستنی سیستەمی پەروەردەیی یەکەمین و پێویستترین هەنگاوە کە دەبێت سیاسەتگوزارانی پەروەردە لە وڵاتدا دایبنێن و کاری جیددی بۆ بکەن، سەرەتا ئەوەندە گرنگیی بدەن بەم پیشەیە کە زیرەکترین و وریاترین کادێری بۆ تەرخان بکەن و پیشەی مامۆستایەتی ببێتە پیشەیەکی بایەخدار و گرانبەها کە خەڵکی بە هۆشیارییەوە هەوڵی بۆبدەن، نەک وەکوو حالی حازر لە هەرێمی کوردستان مامۆستایەتی پیشەیەکە لە خواری خواری پەیژەی گرنگیپێدانی خەڵک و دەسەڵاتدا خۆی دەبینێتەوە، هەرچەندە وەک پروپاگەندە و ئیعتیباری کۆمەڵایەتی بە زارەکی زۆر گرنگ و بایەخدار ناوزەد دەکرێ، بەڵام لە بەر ئەوەی ژیانی مامۆستایان وەکوو پێویست نییە و رەفاهو خۆشگوزەرانیی لێناکەوێتەوە، لەکاتی دابەشکردنی دەرچووانی ئامادەیی بەسەر لق و پسپۆرییە زانکۆییەکاندا کەمترین میانگینی نمرەی بۆ دەچێت و بەناچاریی نەبێ کەس خوازیاری پیشەی مامۆستایی نییە هەر چەند لە دڵیشەوە ئارەزووی بکات. بۆیە دەبێ وەک وڵاتانی پێشکەوتووی لە سیاسەتگوزاریی پەروەردەییدا کار بۆ باشتر و نموونەیی کردنی بژیوی مامۆستا بکرێ و پاڵنەری واقیعی و عەمەلیی دابنرێ بۆ ئەوەی خاوەن نمرە و توانستە هزرییە باڵاکان رووبکەنە ناوەندەکانی پێگەیاندنی مامۆستایان، بە جۆرێک ئەگەر دەرچوویەکی ئامادەیی سەرپشک بکرێت لە نێوان پزیشکیی و ئەندازیاریی و پارێزەریی و مامۆستایەتیدا، زیاتر مەیلی بەلای مامۆستایەتیدا بچێت نەک بە پێچەوانەوە لێی بێزار بێ و بە کەمی بزانێت. لەلایەکەوە پیشەی مامۆستایی لەسەر ئاستی باڵای زانیاری و هۆشیاریی راوەستاوە، لەلایەکی ترەوە لەسەر هەستی بەرزی ئەمانەتداریی و متمانە و دڵسۆزیی وەستاوە، جگە لەوەی پیشەیەکە پیویستی بە هونەری لێزانین و وردەکاریی هەیە لەگەیاندنی پەیامی پەروەردە و بارهێناندا.

### سێیەم: پرۆگرام

مامۆستا هەر چەند زانا و دانا و هۆشیار و وردەکار و دڵسۆز بێت، بەبێ فەراهەمبوونی پرۆگرامی زانستیی و هاوچەرخ ناتوانێت کار لە سەر خوێندکارەکانی بکات، واتە بۆ کەوتنەرێی رەوتی پەروەردە بوونی پرۆگرام و مەنهەجی یەکانگیر لەگەڵ تازەترین پێدراوی زانستیی مومکین نییە، بۆیە دابینکردنی پرۆگرامی پەروەردەیی و فێرکاری لە ئاستی نێودەوڵەتی و بەپێی ستاندارەدە جیهانییەکان ئەولەویەتێکی دیکەی سیاسەتگوزارانی

لە بواری پەروەردەدا، مامۆستا، خوێندکار، پرۆگرام، ژینگەی پەروەردەیی و کارگێڕیی کارامە هەمووی پێویستن و بە لاوازیی هەرکام لەم توخمانە ڕەوتی زانست و زانیاریی ڕوو لە شکستە.



پەروەردەیە لە وڵاتدا، هەموو دەبێ بوودجە پێویستی بۆ تەرخانبکەن، هەم دەبێ بەردەوام کار لە سەر نوێکردنەوەی بکەن، لە ڕووی فۆرم و ناوەرۆکەوە، ئەمەش کاتێک دەستەبەر دەبێت کە کارگێڕانی پەروەردە، پەیوەندییەکی ڕاستەقینەیان بە ناوەندە پێشکەوتووەکانی زانستەوە هەبێت لە ناوەوە، لە دەرەوەش و بەردەوام موتابەعەی تازەترین زانیاریی بکەن لە ڕێی پسپۆڕەکانەوە، لە هەموو بوارەکانی مەعریفەی هزریی و ئاینی و فەلسەفی و زانستی و مرۆیی و پزیشکی و شارستانی و ماتماتیک و هونەر و ئەدەبیاتەوە.

سسیاسەتگوزاریی پەروەردەیی لە بابی پرۆگرامدا دەبێ خاوەنی دیدێکی فراوانی زۆر کراوە و هەڵگری پەیامێکی زانستیی پوختە و بێلایەن بێت، بۆ ئەوەی بەدەردی سیستەمە ئایدۆلۆجییەکان نەچێت کە جۆرێکی تایبەت لە زانستیان قەبووڵە کە زیانی بۆ ئایدۆلۆژیای دەسەڵات نییە یان لانی کەم بێدەنگە لە گەمە و کایەی سیاسیی و سەبارەت بە جۆرێکی مەعریفەش کە بەمەزاقیان ناخوات هەڵوێست وەردەگرن، نموونەشمان زۆرە بۆ ئەم مەبەستە، وەک ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران خوێندنی یاساکانی مەندل لە زانستی ژینەتیک یاساغ بوو، چونکە لەگەڵ بیرۆکەی ئیلحادییدا یەکی نەدەگرتەوە، یاخود هەنووکە لە هەندێک ناوەندی خوێندنی ئیسلامیی جیهانی ئیسلامدا زانستی مەنتیق وکەلام ناخوێندرێ و تەنانەت بەشێک لە نووسینەکان لە زانیارییە مەنتیقییەکان خاڵیی دەکەنەوە، لەبەر ئەوەی مەنتیق جۆرێک لە کرانەوەی فیکر و موحاکەمەی ئازاد دەخولقێنێت.

دانانی پرۆگرام بە بڕوای من بەشێکی دانەبڕاوە لە ئاسایش نەتەوەیی و زامنی داهاتووی وڵات، بۆیە پێویستە زۆر بە وریایی و دانایی و هەستیارانە کاری بۆ بکرێت و تا دەکرێ پشت بە پسپۆڕانی خۆماڵی ببەسترێ. جگە لەوەی دەبێ ئەو پرۆگرامە گشتگیر و فراوان و قوڵ و لە ئاستی ئەرکی قۆناغبەند کراوی گەل و وڵات بێ.

وێڕای بابەتەکانی وەک ماتماتیک و لۆجیک و سروشتناسی و فیزیک و کیمیا و زیندەوەرناسی و زانیارییە گشتییەکان و مێژوو و جوگرافیا و زمان و ڕێزمان و هونەر و ئەدەبیات و وماقی مرۆڤ و ئاکار و پەروەردەی مەدەنی و نیشتمانیی و کۆمەڵایەتی، گرنگییەکی زۆر بە پێکهاتەی فکر و هزر و خەیاڵدانی داهێنان و ئەفراندن بدرێ. کار لەسەر وروژاندنی فیکری خوێندکاران بکرێ، توانستی زمان و دەربڕینیان، توانای وتاردان و قسەکردنیان بەهێز بکرێ، بۆ ئەوەی خاوەنی عەقڵ و بیرکردنەوەی خۆیان بن و فێری ئەتەکێتی پرسیار و وەڵام و گفتوگۆی ئازاد بکرێن، بۆ ئەوەی خۆشیان بەدوای مەعریفەدا بگەڕێن و دیدی ڕەخنەیی و شیکارییان بۆ دروست ببێ.

پەروەردەی هزریی لایەنێکی لەبیرکراوی پرۆگرامی پەروەردەییە لە وڵاتی ئێمەدا و نەریتی تەلقینکردن و پێلەبەر کردن و کەمتەرخەمیی لە وروژاندنی فیکری قوتابیی بە جۆرێک چەسپیوە کە قوتابی پۆلی دوازدە ئەبێ دارشتنی بۆ بنووسرێ و لەبەری بکات بۆ تاقیکردنەوەی بەکەلۆریی و نەیانهێشتووە بۆخۆی ڕستەیەک دابڕێژێ، لە



رۆح و جەوهەری سیستەمی پەروەردەیی بریتییە لە کارگێڕییەکی کارامە و لێهاتوو کە هەموو فاکتەرەکانی مامۆستا و خوێندکار و پرۆگرام و ژینگەی پەروەردەیی پێکەوە گرێ دەدات.

حاڵێکدا ئەو رستەیەی دەرهاویشتەی فیکری خۆی بێ زۆر بەنرخترە لەو لاپەڕەیەی بۆیان نووسیوە و لەبەری کردووە !

بوونی پرۆگرامی تێر و تەسەل و پڕ لە زانیاریی تازە بۆ ئەوەی کاریگەریی لەسەر خویندکار دابنێ پێویستی بەوەیە جگە لە لایەنە تیۆرییەکە کار لەسەر پراکتیزەکردنیشی بکرێ، بۆ ئەوەی زانست و پەروەردە پەیوەست بن بە واقیعی ژیانی رۆژانەی خوێندکارانەوە، واتە هەفتانە رۆژێک دیاری بکرێ بۆ پراکتیزەکردنی بابەت تیۆرییەکان و بینینی ئەنجامی یاساکان لە سەر موفرەداتی ژیانی رۆژانە، کە ئەمەش بە بوونی مامۆستای کارامە و بەرنامەیەکی کارگێڕیی ورد و تۆکمە کارێکی ئاسانە. چونکە قوتابی ئەگەر ڕاستییە زانستییەکانی ناو کتێبی بەشێوەیەکی بەرجەستە و هەستپێکراو بینی، زەحمەتە فەرامۆشیان بکات و باشتر لێیان تێدەگات و کار بۆ وەرگرتنی زیاتریش دەکات.

### چوارەم : قوتابی و خۆیندکار

رەگەزێکی دیکەی گرنگە بۆ سیاسەتگوزاری پەروەردەیی، چونکە هەموو پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە پێناوی توێژی قوتابییان و خویندکاراندایە، ئەگەر ئەم توێژە نەبێ چ پێویستمان بەم هەموو مامۆستا و پرۆگرام و قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگایە هەیە، چ پێویستمان بە کتێب و نووسین و تاقیگە هەیە !

بەڵام خودی ئەو پرسیارە زۆر گرنگە کە قوتابی و خویندکار کێیە؟ چییە؟ ئایا دەکرێ سنوورێک بۆ خوێندکار و ناخوێندکار دابنێین؟ لە حاڵێکدا بڕوایەکی جێگیرمان هەیە بەوەی کاری فێربوون وەرگرتنی زانست و ئەدەب و زانیاری پرۆسەیەکی بەردەوامی جێگیرە و کۆتایی نایەت، رەنگە لەتەمەنێکدا لە ئاستێکدا لە قۆناغێکدا بوەستێت بەڵام بۆ ئەوانەی کە تامی زانست دەچێژن هەرگیز کۆتایی نایە.

تەنانەت لە ڕوانگەی هزری عیرفانیی ئیسلامییەوە فێربوون لە ژیانی بەرزەخییشدا بەردەوامە! کە دیارە پرسەکە پاساو و بەڵگەی خۆی هەیە.

لە سیاسەتگوزاریی پەروەردەییدا رەچاوکردن و بەهەند وەرگرتنی قوتابیان و خوێندکاران رۆڵێکی کاریگەری هەیە لەسەرخستنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردندا، چونکە ساڵانە ژمارەی قوتابییان لە ئاستە جیاجیاکاندا بەرەوژوور هەڵدەکشێ و لە ئەنجامدا نیازمەندییەکانیان زیاتر دەبێ. مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابیان پێویستە گەلێک زووتر لە رۆژژمێری خوێندن دەست پێبکات، بۆ ئەوەی هەموو پێداویستیی و نیازمەندییە ماددی و مەعنەوییەکانیان بۆ دابین بکرێ، مامۆستا و راوێژکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی، پۆل و قوتابخانە و فەزای خوێندن و کتێب و کاغەز و کتێبخانە و خۆراک و دەرمان و یاریگا و هەرشتێکی تر کە هەنووکە لە قوتابخانەیەکی نموونەییدا هەیە. لە گەڵ ئەمانەدا میدیایەکی نیشتمانیی و پەروەردەیی ژیر و کارامە و دڵسۆز، کە یارمەتیدەر و ڕێنمایان بێت بۆ راستکردنەوە و پێداچوونەوەی بابەتەکان. پێویست دەکات کار بۆ کەناڵی پەروەردەیی تایبەت بکرێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاست و فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەیان.

ئەگەر بووجەی وڵات لەم بوارەدا بە ئەمانەتەوە سەرف بکرێت دەتوانین لە داهاتووی نەوەکانی داهاتوومان دڵنیابین. چونکە هەر قوتابییەک بۆخۆی پرۆژەی بنیاتنەرێکی بوارێکی زیندووی ژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی هزریی و پەروەردەیی و کەلتووریمانە.

قوتابیی جگە لە پرۆگرامی خوێندن پێویستی بە ناسینی توانا و بەهرەکانیەتی، پێویستی بە دیاریکردنی پلەی زیرەکیی و هۆشە، بۆ ئەوەی لە رێگای خوێندنەوە پەرەی پێبدرێ و رێنمایی بکرێ بۆ ئەو پسپۆڕییەی دەتوانێت تیایدا داهێنان بکات. بەبێ بوونی وێستگەیەکی لەم چەشنە زۆر لە وزە و توانا و بەهرەکانمان بەفیرۆ دەچن، وێڕای بەزایەدانی بووجە و کاتی زۆر بەنرخ لە پەروەردەکردنی کەسێکدا کە هیچ ئامادەیی و ئارەزوویەکی بۆ ئەو خوێندنە نییە، سەرەنجام بەبێ هیچ دەسمایە و هەگبەیەکی پەروەردەیی دەچێتە شوێنێک کە شایانی نییە، ئەمە ئەگەر دواتر مایەپووچ و دەستبەتاڵ نەبێ.

سیاسەتگوزاری پەروەردەیی دەبێ لە ئاستێکی بەرزی بەپرسیارێتیدا بێت، حساب بۆ ناوچە جیاجیاکان و ئاستە جیاجیاکان و پسپۆڕییە پێویست و بنەڕەتییەکان بکات. چونکە ئەوەی پێی دەوترێ : گەشەپێدانی هەمەلایەنە، کاتێک دەبێتە واقیع کە بەرنامەیەکی گشتگیر ی هەبێ و کار لەسەر سیستەمێکی پەروەردەیی وابکات کە جیاوازیی چینایەتی لەناو قوتابییان نەهێڵێت و رێگا بگرێت لە بازرگانیکردن بە خوێندن و زانستەوە.

تازەترین تیۆریی پەروەردەیی جەخت لەوە دەکاتەوە کە هەر قوتابییەک لەبارییایەتی لە بوارێکدا سەرکەوتوو بێت، جا ئەو بوارە رەنگە زانستیی بێت یان وێژەیی یان پیشەیی یان خزمەتگوزاریی ، گرنگ ئەوەیە رێگای خۆی بدۆزێتەوە یان هاوکاریی بکرێ بۆ دۆزینەوەی رێگا و گرنگ ئەوەیە بدرێتە دەستی کەسانی زانا و مامۆستایانی کارامە.

## پێنجەم: قوتابخانە و ژینگەی پەروەردەیی

قوتابخانە واتە ژینگەی پەروەردەیی، واتە هەر جێگایەک مرۆڤ تیایدا فێری شتێکی تازە دەبێت. بەم پێناسەیە باوەشی دایک، حزووری باوک، مەجلیسی خێزان و خزمان، کۆڕی میوان و ناسراوان، جومعە و جەماعەت، حەج و عەمرەکردن، کۆڵان و بازاڕ و مۆڵەکان، فەرمانگە و شوێنی کار، تەنانەت ناو پاس و تاکسی، شانۆ و سینەماکان، ئینجا دایەنگە و باخچەی ساوایان و قوتابخانە و پەیمانگە و کۆلیج و کۆبوونەوە زانستییەکان هەمووی دەبنە ژینگەی پەروەردەیی، لەوەش زیاتر گەردوون و نیشانەکانی، ئاسمان و زەویی ، بەرزایی و نەویی، تێکڕا دەبنە فێرگە و ژینگەی خۆناسین و خەڵک ناسین و خواناسین.

کەواتە هەموو ئەم شوێنانە لە سیاسەتگوزاریی پەروەردەییدا پێکەوە هەماهەنگ و تەبا بن بۆ پێگەیاندنی تاقە یەک قوتابی، ئەگەر لە وڵاتدا تەنها یەککەس قوتابی بێت، خۆ ئەگەر رێژەیەکی زۆر قوتابیمان هەبێ، دەبێ ئەم هەماهەنگییە زۆر زیاتر و وردتر و خێراتر بێ.

کەواتە لەسەرەتاوە دەبێ حسابی تایبەت بۆ دایکان و باوکان و خێزان و کۆمەڵگا و ژینگەی راستەوخۆی خوێندن بکرێ، کە بە پێی توانا دوور بێ لە پشێویی و ژاوەژاو و بیرو هزری نامۆ و خراپ. باوک ودایکی ساغ و تەندروست و خوێندەوار و هەستیار و تێگەیشتوو رەگەزێکی سەرەکین بۆ سەرخستنی پرۆسەی پەروەردە و بۆ خەملاندنی کەسێتی قوتابی.

هەنووکە لە کوردستان ئێمە پێویستمان بەوەیە قوتابخانەی نموونیی و سەردەمیانەی زۆر دروست بکەین، بۆ ئەوەی دیاردەی دوو دەوامی و سێ دەوامی نەمێنێت و قوتابییەکانمان زۆربەی کاتیان لە قوتابخانە بەسەر بەرن و کە دێنەوە ماڵ بۆ پشوو وەرگرتن و بەسەربردنی کاتێکی کامەران بێنەوە و زۆرینەی مەشق و خوێندنیان لە

ناو پۆلەکان و قوتابخانەکاندا بێ، لە ژێر چاودێریی مامۆستاکانیاندا.

قوتابخانەکانمان پێویستە بەدیزاین و نەخشەیەکی جوان و پێشکەوتوو بنیات بنرێن و هەموو پێداویستییەکی خوێندن و پەروەردەیان تێدا بێ، بەدووربن لە قەرەباڵغی و مەترسییە ژینگەییەکانی وەک ئالوودەبوونی ئاوو هەوا و تەپ و تۆز و کارخانە و سەربازگەکان و شوێنە هاوچەشنەکانیان. دەکرێ لەقوتابخانەکاندا سوود لە هونەرمەندان وەربگیرێ بۆ نەخشاندنی هوڵ و ڕێڕەوەکان بە وێنەی شانازییە میللی و نیشتمانییەکانی وەکوو زانایان و شاعیران و قارەمانانی میللی و هونەرمەندان خۆشناوی گەلەکەمان.

لەهەمان کاتدا هەوڵ بدرێ لە نەخشە و دیزاینی قوتابخانەکاندا جیاوازییەکی وا نەبێ کە جیاکاری لە نێوان ناوچە جیاجیاکاندا بکرێ، مەگەر ئەو جیاکارییانەی هەل و مەرجی جوگرافی و ئاوو هەوا پێویستی دەکەن.

## شەشەم: کارگێڕیی پەروەردەیی

ڕۆح و جەوهەری سیستەمی پەروەردەیی بریتییە لە کارگێڕییەکی کارامە و لێهاتوو کە هەموو فاکتەرەکانی مامۆستا و خوێندکار و پرۆگرام و ژینگەی پەروەردەیی پێکەوە گرێ دەدات و بەبەهرەگیریی لە رەگەزی کات دەرهاویشتەی باش و پێشکەوتوو لە خویندکار و قوتابی سەرکەوتوو بەدەست دەهێنێت، کارگێڕ یان باشتر بڵێین بەڕێوەبەر لایەنی جێبەجێکاری سیاسەتگوزاریی پەروەردەییە لە وڵاتدا هەر بۆیە لە بەر رۆشنایی یاسا و رێسا و وزە و توانا و ئیمکاناتی مرۆیی و تەکنۆلۆژیەکاندا دەبێ ئاگاداری رەوتی پرۆسەی پەروەردەیی بێت لەو بەستێنەی کە بەرپرسە لێی.

کارگێڕیی هەنووکە بووەتە بوارێکی مەعریفیی زۆر جیددی و لق و پۆپی زۆر و زەوەندی لێکەوتۆتەوە، لە ناویاندا کارگێڕیی پەروەردەیی ئەو بوارە مەعریفییەیە کە ڕێگای بەڕێوەبردنی دامەزراوەکانی خوێندن و فێرکردن فێری بەڕێوەبەران دەکات بۆ ئەوەی ئامانجە پەروەردەییەکان دەستەبەر بکات، یا باشتر بڵێین :

بریتییە لە کۆی ئەو بیرۆکە و بۆچوون و چالاکیی و ئاراستە مرۆییانەی دەگیرێنەبەر بۆ روونکردنەوەی ئامانج و نەخشە و پلاندانان بۆیان، هەروەها بۆ دۆزینەوەی ئەرک و فرمان و پەیکەربەندیی پێویست لە دامەزراوە پەروەردەییەکاند. بەرەچاوکردنی قۆناغ و ئیمکاناتی بەردەست و ڕاهێنانی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی پەروەردە و فێرکردن.

بە کورتی کارگێڕیی پەروەردەیی هەموو کارێکی رێکخراو دەگرێتەوە کە خزمەت بە پرۆسەی خوێندن دەکات لە وڵاتێکدا بە هەماهەنگیی لەگەڵ فەلسەفەی باوی خەڵکەکەی و ئەندێشە و خولیای دەستە جەمعیی ئەوان.

لەم ڕوانگەوە ئێمە لە هەرێمی کوردستان پێویستە گرنگییەکی زیاتر بدەین بەم رەگەزە ئێجگار گرنگە و کارگێڕیی پەروەردەیی لەم بارو دۆخە بارگاوییە بە بارگەی حیزب و ئایدۆلۆژییایە دەرباز بکەین. کە زۆرینەی بەڕێوەبەرانی پەروەردە لەسەر بنەمای حیزبایەتی تەسک و بەرژەوەندیی هێڵە دەست رۆیشتووەکان دیاری دەکرێن و بووەتە هۆی لاسەنگبوونی تەرازووی دادگەریی کارگێڕیی و هیچ مانایەکی بۆ پسپۆڕیی و لێهاتوویی نەهێشتووە.

سیاسەتگوزاریی پەروەردەیی دەبێ زۆر وەستایانە هەوڵی بەدیهێنانی کارگێڕییەکی پەروەردەیی لێوەشاوەی بەدوور لە کایە سیاسیی و حیزبییەکان بدات، بۆ ئەوەی پرۆسەی پەروەردە ئامانجە میللی و نیشتمانیی و ژیارییەکانی بپێکێت و دوور بکەوێتەوە لە ئایدۆلۆژیای حیزبی، شۆڤینی و مەزهەبگەرایی و تائیفی و توندڕەوانە و پەرگیر، واتە پەیوەست بێ بە گیانی دەستەجەمعی کۆمەڵی

کوردەواری و ئەزموونیی مێژوویی و قووڵایی ئینتیمای فەلسەفیی و بڕوایی خەڵکی کوردستان.

ئەوەی کە زۆر گرنگە لەم میانەدا ئاماژەی بۆ بکەین، ڕەچاوکردنی ڕەگەزی کات و دەرفەتی ڕەخساوە بۆ بەدەستهێنانی تازەترین دەستهاوردی مەعریفە و زانستی سەردەمیانە، کە هەر جۆرە کەمتەرخەمیی و ساردی نواندنێک لەمبارەوە زەبری گورچکبڕ لە پرۆسەی خوێندن دەدات، بۆی هەیە ئیفلیجی بکات و لەوەش زیاتر دوای بخات. بەکارخستنی کات و قۆستنەوەی دەرفەتە ڕەخساوەکان یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی کارگێڕییەکی سەرکەوتوو. لەو دەرفەتە مێژووییانەدا لێوەشاوەیی و بەهرەکانی گەلێک دەردەکەون و بەکار دەهێنرێن بە ئەفراندن و کاریگەریی دانان لەسەر جومگەیەکی مێژووی مرۆڤایەتی. بەڵێ داهێنانەکانی بواری زانست و تەکنۆلۆژیا زۆربەیان کاری تاکەکەسی بوون و لە ئەندێشەیەکی تاقانەوە بەرهەمهاتوون، بەڵام دواتر ئیدارەی سەرکەوتوو و دەرفەتناس هاتووە تەوزیفی کردوون بۆ پرۆسەی پەروەردەیی و نەوەکانی دواتری لەسەر بارهێناون و کردوونی بە سەکۆی سەرکەوتنی خۆ دۆزینەوەیان بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ.

## حەوتەم: ڕوانگەی دووربین و جیهانبین

هەموو ئەو ڕەگەزانەی باسمان کرد کاتێک ئەنجامیان دەبێ کە سیاستگوزاری پەروەردەیی خاوەنی ڕوانگەیەکی دووربین و جیهانبینییەکی کراوەی ئینسانیی بێت، خۆی لە جوغزی فەلسەفە و جیهانبینییەکی دەستکردی تۆتالیتاردا حەشار نەدابێت. واتە لە ئاستێکی بەرزی بیرکردنەوە و تێگەیشتندا بێ و بیر لە خەمە گەورە و گرانەکانی گەل و مرۆڤایەتی بکاتەوە. خاوەنی عەقڵێکی گەورە و باکگراوندێکی مەعریفیی وابێ کە بتوانێت باڵانسی نێوان فێرگە و ئایدیا جیاوازە قەومی و مەزهەبی و ئەتنییەکان رابگرێت، بە تایبەتی لە وڵاتێکدا کە فرە ئایین و فرە مەزهەب و فرە ئایدیایە و هەر ساتێک ڕێی تێدەچێ هەستیارییە قەومی و مەزهەبییەکان درز بخاتە ناو پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنەوە.

لە غیابی سیاسەتگوزاری لەو چەشنە ڕەوتی پەروەردە بە لاسەنگیی بە بێ پشتیوانیی دەستەجەمعی و ناوخۆیی بەڕێوەدەچێت و ناتوانێت داهاتوویەکی ڕۆشن و پێشکەوتوو بۆ خەڵک دەستەبەر بکات و دەرهاویشتەی سیستەمی پەروەردە کەسانی دۆگم و خۆپەرست و هەڵپەرست و دووڕوو دەبێ.

## ئەنجامگیریی:

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نموونەی سیاسەتگوزاری پەروەردەیی سەرکەوتوو لە کەسێتی پێغەمبەری ئیسلامدا بە ڕۆشنی و بەروونی دەبینین، کە بە بڕیاری قورئان و بە ڕەوشتی ڕۆژانەی خۆی کاری کرد بۆ ئەوەی پەروەردە و خوێندن ببنە تان و پۆی کەسایەتی تاک و کۆمەڵ، قودسییەت و پیرۆزییەکی وای دا بە خوێندن کە لەمافەوە کردی بە واجب، لە واجبەوە کردی بە خەسڵەتی کەسی بڕوادار، لە قورئاندا فرمان بە خوێندن و خوێندەواریی کەوتە پێش هەموو فرمانێکی شەرعی ترەوە. لەم بزاڤە مێژووییە دەگەمەنەوە مسوڵمانان بوونە خاوەنی گەنجینە و کەلەپوورێکی مەعریفیی ئێجگار دەوڵەمەند کە دەکرێ ببێتە سەرچاوەی شارستانێتی ئەمڕۆ لە گۆڕانکاریی و تەواوکاریی مەعریفیدا.

ڕشتەبەندیی زانستیی لە ئیسلامدا پشت بە یەکبوونی زانستەکان و تەواوکاریی لقە مەعریفییەکان دەبەستێت لەسەر بنەمای پەیوەستبوونی زانستی و ئەخلاقیی نێوان نەوە زانستییەکان گەشە بە خۆی دەدات. بەناوی خودا دەست پێدەکات و بە خزمەتی مرۆڤ کۆتایی دێت، لەم سەرووبەندەدا هیچ مەقوولەیەکی مەعریفی یاساغ و قاچاخ نابێ و هیچ زانایەک لەسەر دەرخستنی تیۆرییەکی تازەی

دژەباو تۆمەتبار ناکرێ، تەنانەت ئەگەر لە قۆناغێکی کورتدا بیرمەندێکی وەکوو سوهرەوەردی، حەللاج، ئیبن عەرەبی، ئیبن تەیمییە، ئیبن روشد و مەلا سەدرا و کەسانێکی دیکە ئازار بدرێن یا بکوژرێن، پاش ماوەیەک لەلایەن زانایانی ڕاستەقینەی مەعریفەتخوازەوە ئیعتیباریان بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەمە مایەی شانازییە بۆ ئوممەتی هەڵگری مەعریفەی قورئانی و نەبەویی کە فێربوون واجبێکی بەردەوام و کۆتایی نەهاتووە، هیچ زانایەک نییە تا کاتی مردنی لە پرۆسەی زانستخوازیی بەردەوام بەشداریی نەکات و هەوڵی وەرگرتنی زانیاری زیاتر نەدات. لێرەوە ڕەوایەتی ئەو قسەیە بەرجەستە دەبێ کە زانست و زانستپەروەریی مەرجی یەکەمە بۆ هەموو سەربەخۆیی و سەروەرییەکی سیاسی و ئابووریی و لە خۆڕا نییە کە لە کتێبێکی گەورەی وەک سەحیحی بوخاریدا دەروازەی چوونە ناو سوننەتەکانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێت ) بریتییە لە دەروازەی (زانست)، زانست لە ڕوانگەی هزری ئیسلامییەوە ئەو سپاردەیەی خودایە کە ڕێگای بەزایەدانی نەدراوە و ئەو نهێنییە گەورەیە کە مرۆڤی کردە سەرداری مەخلووقات. ئەم زانستە درەختێکە رەگ و ریشەی لە ناخی گەردوون داکوتاوە، لق وپۆپیشی بە ئاسماندا بڵاوبۆتەوە، تۆوە بنەڕەتییەکەی بریتییە لە ناوی خودای ئەفرێنەر و میوە و بەرووبوومەکەی بریتییە لە بەرهەمە هزریی و زانستیی و ئەدەبی و هونەرییەکان کە پێکەوە جیهان ئاوەدان دەکەن و شەرحی ناوە جوانەکانی خودا دەکەن و دەبنە ئاوێنەی دەرکەوتنی سیفەتەکانی خودای بەدیهێنەر.

زانستەکانی ئیسلام لە ڕاستیدا دەرخەری ئەم نەخشەیەن کە بە تێفکرین لە بناغە و نما و دەرهاویشتەکانی، فەلسەفەیەکی ورد و جیهانبینییەکی ڕەوان و بێ تەم و مژ نمایان دەبێ. ئەم زانستە لە زمانەوە دەست پێدەکات کە دەربڕی فیکری مرۆڤە، لەوێوە دەچێتە کەوناراکانی عەقڵ و نەقڵ و لە دەقەکان رادەمێنێ بۆ تێگەیشتن لە سەرەتا و لە چارەنووس، بۆ تێگەیشتن لە مێژوو، لە ناخی مرۆڤ، لە کۆمەڵگاو گۆڕانکارییەکانی، لە سروشت و لە دەوروبەر، لە ئاسۆکانی دەرەوەی بەرچاومان، لە میتافیزیک و وردەکارییەکانی بوون و لە رەوشی ئاکار و رەفتار و هۆگربوون بە نووری موتڵەقی خوداوەندیی و عیرفان و گەیشتن بە مەقسوودی ڕاستەقینە.

ئەم زانستانە دەریا و ئۆقیانووسی بێسنوورن و مەلەوانگەلێکی نەفەس درێژ و بە ئەزموون بەرهەمیان هێناوە. ئەو زانایانە بەرهەمیان هێناوە کە لەو دیوی دیاردەکانەوە دەستی جوانکاریی خودا و بڕیاری حەکیمانەی ئەویان دەرکپێکردووە و لەگەڵ ئایەتەکانی خودا هێندە ئاوێتەبوون و جۆشیان خواردووە کە سینەیان بووەتە ئاوێنەی تەواو نومای حەقیقەت و پێکەوە هارمۆنییەکی ناوازەیان لە تەکامولی مەعریفی سازداوە کە تائێستاشی بەسەرەوە بێت مێژوونووسانی فەلسەفە و عیرفان و زانست و ئەدەبیاتیان سەرسام کردووە.

ئەم کاروانی زانستە ئیسلامییە رەنگی نەژادێکی تایبەت، گەلێکی تایبەت، مەزهەبێکی تایبەتی نەگرتووە، هی هەموو گەلانی زیندووی سەرزەوییە، هی هەموو مەزهەبەکانە تەنانەت هی ئایینەکانی تریشە، چونکە هەموویان بە فەرمی دەناسێت و بۆ ئاسوودەیی هەموویانە. بەڵێ دەکرێ زمانی عەرەبی زمانی یەکەمی ئەم زانستانە بێ بەڵام هیچ ڕێگرێک نییە لەوەی کە زمانەکانی تریش بێنە مەیدان و ئیبداع و بلیمەتیی خۆیانی تیا نمایش بکەن.

پوختەی قسەم ئەوەیە زانست بەم سیاسەتگوزاری و تێڕوانینی لەم چەشنە پایەیەکی گەورە و بنەڕەتییە بۆ سەروەریی و شکۆی میللی هەر گەلێکی زیندووی جیهان.

# ئامانجەکانی زانکۆ

## لە ژینگەی شێواوی هەرێمی کوردستاندا





**پ.ی.د.یەحیا عومەر ڕێشاوی - مامۆستای زانکۆ**

نووسەر و مامۆستا لە زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی،

خاوەنی ١٠ کتێبی چاپکراو.



یەکێک لە پێوەرەکانی پێشکەوتنی هەر گەلێک بە ژمارە و ئاستی زانکۆکانیەتی، ژمارەی زانکۆکان و کوالێتی خوێندنیان بەڵگەن لەسەر پێشکەوتن و گەشەسەندنی هەر وڵاتێک، حکومەت و دەسەڵاتە سیاسیەکان لەسەرتاسەری دونیا بودجەی گەورە بۆ بواری بونیادنان و گەشەپێدان بە زانکۆکان تەرخان دەکەن، زۆر جار ئەم زانکۆیانە دەبنە سەرچاوەیەک بۆ داهات و گەشەدان بە بواری ئابوریی و گەشت  و گوزار و پێدانی سومعەیەکی نێودەوڵەتیی بە وڵاتێکی دیاریکراو، هەر بۆیە بایەخدان بە زانکۆکان خزمەتێکی گەورە بە کۆمەڵگە پێشکەش دەکات و دەبێتە بنەمابەک بۆ پێگەیاندنی کادیر و برەودان بە توێژینەوەی زانستیی.

لەم نووسینەدا دەمانەوێت باس لە گرنگی زانکۆکان بکەین لە خزمەتکردنی کۆمەڵگە و تیشک دەخەینە سەر بارودۆخی زانکۆکان لە هەرێمی کوردستاندا لە رێگەی ئەم تەوارانە:

یەکەم : پێناسە وبایەخی زانکۆ
دووەم: ئامانج و بنەماکانی سەرکەوتنی زانکۆ
سێهەم: کێشەکانی زانکۆ لە هەرێمی کوردستاندا
چوارەم: چۆن گەشە بە زانکۆکانمان بدەین؟

## یەکەم : پێناسە وبایەخی زانکۆ

زانکۆ دامەزراوەیەکە بۆ فێرکردنی باڵا کە لە چەند کۆلێژێک پێک دێت، ئەرکی رێکخستنی خوێندنە لە چەند بوارێکدا، مافی پێدانی بروانامەی هەیە، یاخود زانکۆ شوێنی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیە و بروانامە دەبەخشێت و چەند کۆلێژێک و هەندێ جار رەنگە پەیمانگەش لە خۆ بگرێت.

دەستەواژەی زانکۆ university لە وشەی universitias  وەرگیراوە و بەمانای ئەو یەکێتیە دێت کە گشت هێزە خاوەن هەژمونەکانی نێو دونیای سیاسەت دەگرێتە خۆ، کە بۆ (سیاسەتکردن) کار دەکەن. هەروەها (زانکۆ) گردبوونەوەی زانستیانەی نێوان مامۆستایان وخوێندکارانیش دەگەیەنێت.

وشەی عەرەبی (جامعە)ش وەرگیڕانێکی وردی وشەی ئینگلیزی هاوشێوەکەیەتی، واتا عەرەبیەکەی کۆکردنەوە و کۆبوونەوە دەگەیەنێت.

زانکۆ دەزگایەکی خوێندنی باڵایە، دەکرێت کەسێک وەربگرێت کە خوێندنی دواناوەندی تەواو کردبێت، چونکە تێیدا پرۆگرامی فێرکاریی و ڕاهێنان لە چەندین پسپۆڕیی تیۆریی و پراکتیکیدا پێشکەش دەکات، لەماوەیەکدا کە زۆر جار چوار ساڵە، هەندێ جاریش دەگاتە شەش ساڵ و هەندێ کۆلیژ هەن کە خوێندنی زانکۆیی تێیاندا تەنها ٣ ساڵە. یاخود بە پێناسەیەکی دیکە زانکۆکان دامەزراوەی زانستی کۆمەڵایەتی ئەکادیمیین، کار بۆ پێدانی ئەو زانیاری و شارەزایی و کارامەییانە بە خوێندکاران دەکەن کە لە ژیانیاندا پێویستیانە، کە دەبێتە هۆی کارلێکیان لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیان و دەیانخاتە سەر رێگەی برەودان و گەشەدان بە تواناکانیان.

زانکۆکان هەر لە کۆنەوە شوێنگەیەکی پێشەنگیان لە نێو کۆمەڵگادا هەبووە، چونکە زانکۆ سەنتەری تیشکدانەوەی گشت نوێیەکە لە دونیای فیکر و زانست و زانیاریدا، هەروەها ئەو دوانگەیەیە کە بیروبۆچوونی بیریاران و زانایان و فەیلەسوف و پێشەنگانی چاکسازی و پێشکەوتنی لێوە بڵاو دەبێتەوە. زانکۆکان سوودی گەورە بە کۆمەڵگە دەگەیەنن و پێوەرێکن لە پێوەرەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵگەکان، دیارە رۆڵی زانکۆکان تەنها لە بواری فێرکردن و پێشکەشکردنی توێژینەوەی زانستیدا خۆی نابینێتەوە. بەڵکو  رۆڵیان پەیوەست دەبێت بە کۆی کۆمەڵگە و چارەسەرکردنی قەیران و کێشەکانی، دیارە ئەمەش پەیوەستە بە تێگەشتنی دروست لە رۆڵی زانکۆ و بەهەند سەیرکردنی لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە.

جگە لەوە زانکۆکان کولتوور و فەرهەنگی کۆمەڵایەتی و شارستانی کۆمەڵگە لە نەوەیەکەوە دەگوازنەوە بۆ نەوەیەکی تر تا لە دەروونی خوێندکاراندا بیچێنن و بە هۆیەوە بتوانن رەفتاری کۆمەڵایەتی شیاو بنوێنن، هەروەها زانکۆکان کار لەسەر پەرەپێدانی توانا و بەهرە خودیەکانی خوێندکاران دەکات و هانیان دەدات بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە تا بتوانن رووبەرووی پێشهات و مەترسیەکان ببنەوە. وێرای ئەمانە زانکۆکان رێگە خۆش دەکەن تا خوێندکاران تێکەڵ بە ژینگە گەورە کۆمەڵایەتیەکە ببن، چون هەلی ئاشنا بوون بە کولتور و فەرهەنگ و ئەزموونی گەلانی دیکەیان بۆ دەرەخسێنێت، هەروەها کێشە و گرفتەکانی خوێندکاران دەخاتە روو، لە پێناو دۆزینەوەی رێگە چارە بۆیان، هەروەها خوێندکاران رادەهێنێت لە سەر رەچاوکردنی یاسا و سیستمە جۆراجۆرەکان و دوا جار پێکهێنانی کەسایەتیان لە رووی دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە.

### باشترین (١٠) زانکۆکانی جیهان بۆ ساڵی ٢٠٢٠

| ناوی زانکۆ | وڵات | رانکینی نیودەوڵەتی |
|---|---|---|
| پەیمانگە ماساتشوستس بۆ تەکنەلۆجیا | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ١ |
| زانکۆی ستانفۆرد | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٢ |
| زانکۆی هارفارد | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٣ |
| زانکۆی ئۆکسفۆرد | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٤ |
| پەیمانگەی کالیۆفۆرنیا بۆ تەکنەلۆجیا | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٥ |
| پەیمانگەی فیدراڵی سویسری بۆ تەکنەلۆجیا | سویسرا | ٦ |
| زانکۆی کامبرج | بەریتانیا | ٧ |
| کۆلیژی (لەندەن)ی زانکۆیی | بەریتانیا | ٨ |
| کۆلیجی ئیمپریالی لە لەندەن | بەریتانیا | ٩ |
| زانکۆی شیکاگۆ | ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ١٠ |

### باشترین (١٠) زانکۆکانی وڵاتانی عەرەبی بۆ ساڵی ٢٠١٨

| ناوی زانکۆ | وڵات | رانکینی نیودەوڵەتی |
|---|---|---|
| زانکۆی مەلیک فەهد بۆ پیترۆل و کانزاکان | شانشینی عەرەبی سعودی | ١٧٣ |
| زانکۆی مەلیک سعود | شانشینی عەرەبی سعودی | ٢٢١ |
| زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت | لوبنان | ٢٣٥ |
| زانکۆی مەلیک عەبدولعەزیز | شانشینی عەرەبی سعودی | ٢٦٧ |
| زانکۆی قەتەر | قەتەر | ٣٤٩ |
| زانکۆی ئیماراتی عەرەبی | ئیمارات | ٣٩٠ |
| زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە | میسر | ٣٩٥ |
| زانکۆی ئەمریکی لە شاریقە | ئیمارات | ٤٢٠ |
| زانکۆی کەنداوی عەرەبی | بەحرەین | ٤٢١ |
| زانکۆی خەلیفە | ئیمارات | ٤٦٠ |

دووەم: ئامانج و بنەماکانی سەرکەوتنی زانکۆ

لە سەرتاسەری دونیا بە هەزارەها زانکۆ هەن کە دەیانەوێت ئامانجی جۆراوجۆر جێبەجێ بکەن، هەندێک لەو ئامانجانە:

١- پەرەپێدان بە توانا عەقڵی و جەستەییەکانی فێرخوازان و خستنە رووی خواستەکانیان و پەیرەو کردنی شێوازەکانی بیرکردنەوەی زانستیانە.

٢- جەختکردنەوە لەسەر لایەنی تیۆری و پراکتیکی فێرکردن، بە جۆرێک پرۆگرامەکانی خوێندن تەواوکەری هەردوولایەنەکە بن.

٣- پەیوەست کردنی خوێندنی زانکۆیی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و کێشەکانی کۆمەڵگە، بە هاندانی رۆحی هاوڵاتیبوون و خزمەتکردنی کۆمەڵگە.

٤- راهێنانی خوێندکاران لەسەر سوود وەرگرتن لە کات و کاری خۆبەخش و بیرکردنەوەی ئیجابیانە.

٥- چارەسەرکردنی هەندێک لە گرفتە دەرونی و کۆمەڵایەتیەکانی خوێندکاران لە رێگەی بەشداریکردن لە چالاکیە جۆراوجۆرەکان.

٦- ڕاهێنانی خوێندکاران لەسەر ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگە.

٧- بەرزکردنەوەی ڕۆحی ڕەخنەگرانە و توانای فێرکردنی خودی بەردەوام لە ناو زانکۆ و دەرەوەی زانکۆ.

٨- چاندنی بنەماکانی ڕەفتار و ڕەوشتی جوان و ڕاهێنانی لەسەر هەستی بەرپرسیارێتی.

٩- ئامادەکردنی خوێندکار تا هەلی کاری دەستکەوێت، لە ڕێگەی ڕاهێنانی لەسەر کاراماییەکانی کارکردن و چۆنیەتی پێشکەشکردن بۆ کار.

١٠- پێشکەشکردنی توێژینەوە و ڕاوێژ لە بوارە جیاجیاکانی پەیوەست بە دەوڵەت و سیستمی حوکمرانی و داهێنانکاریی لە پێداویستیەکانی کۆمەڵگە.

دیارە تەنها ئەوە بەس نییە بە ژمارە زانکۆت هەبێ و ساختمانی گەورە و فراوانی بۆ تەرخان کەیت، بەڵکو ئەوانەی زانکۆکان دەکەنەوە، پێویستە گۆشەنیگایەکی روونیان لە ئامانجی کردنەوەی ئەو زانکۆیە هەبێت، دەرک بەوە بکەن کە ئەم زانکۆیە چۆن دەتوانێت پێداویستییەکانی تاک و کۆمەڵگە تێر بکات، زانکۆکان پێویستە توانای ئەوەیان هەبێت خەرجی بۆ بواری نوێکردنەوەی زانیاری ستافی مامۆستاکانیان تەرخان بکەن، زانکۆکان دەبێت بەردەوام وۆرک شۆپ و سیمینار و کۆنفراسی بەردەوامیان بۆ چۆنیەتی گەشەدان بە پروگرامەکانیان و هەڵسەنگاندن و فیدباک هەبێت، جگە لە بوونی کۆنفراسی زانستیی بۆ بەشە جیاجیاکانیان و چالاکی کۆمەڵگەیی.

زانکۆکان دەبێت ببنە مەڵبەندی بەرهەمهێنانی مەعریفە و وەک چۆن پسپۆرێک سێ وەزیفەی بۆ زانکۆکان داناوە، ئەوانیش: یەکەم، گواستنەوەی مەعریفە لە ڕێگەی فێرکردنەوە و دووەم، بەرهەمهێنانی مەعریفە لە ڕێگەی توێژینەوەی زانستی و سێهەم، پەرەپێدانی کۆمەڵگە.

زانکۆ پێویستە ژینگەیەکی لەبار و گونجاو بۆ خوێندن دروست بکات، لەبار و گونجاو بۆ ستافی مامۆستایان بۆ کارمەندان و بۆ خوێندکاران، لەبار و گونجاو لە ڕووی تاقیگە و هۆڵەکانی خوێندن و کتێبخانە، لە لایەکی دیکەوە پێویستە ئەو ژینگەیە بنەماکانی دیموکراسیەت لە ڕووی ڕەخنەگرتن و پڕکردنەوەی پۆست و بەرپرسیارێتیەکان فەراهەم بهێنێت، بە جۆرێک ئەم ژینگەیە ڕەنگدانەوەی لە ژینگە کۆمەڵایەتیەکەدا هەبێت، تەنانەت پێویستە زانکۆ ژینگەیەکی سیاسی بۆ خوێندکارانیش دروست بکات، ژینگەیەکی سیاسی نەک حیزبیی، بەمانا خوێندکاران ڕابهێنێت لە سەر کێبرکێ و ئەنجامدانی پرۆسەکانی هەڵبژاردن لە نێوان خۆیاندا بۆ دیارکردنی نوێنەران و دەستە خوێندکارییەکان دوور لە دەستێوەردانی سەرۆکایەتی زانکۆ و ڕاگرایەتیەکان، کە پاشتر ئەم کەش و هەوای هەڵبژاردن و کێبرکێ سروشتیانە لە داهاتووی ژیانی سیاسی و ئیداریی و بەرپرسیارێتی خوێندکاراندا ڕەنگ بداتەوە.

## سێهەم: کێشەکانی زانکۆکان لە هەرێمی کوردستاندا

ئەمرۆ لە هەرێمی کوردستاندا (٣٠) زانکۆی حکومی و ئەهلی هەن کە ژمارەی زانکۆ حکومیەکان (١٥) زانکۆیە و ئەهلیەکانیش (١٥) زانکۆ و ساڵانە ئەو ژمارەیە لە هەڵکشاندایە، بە داخەوە ئەو زانکۆیانە بە کۆ و پاش نزیک لە ٣٠ ساڵ لە حوکمرانی خۆماڵی، نەیانتوانیوە ئامانجە حەقیقیەکانی زانکۆ جێبەجێ بکەن و ڕانکینی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لە ئاستی جیهاندا دڵخۆشکەر نین. لەو کێشانەی ئەم زانکۆیانە بەدەستیەوە دەناڵێنن:

- زانکۆکانی هەرێمی کوردستان نەیانتوانیوە سەربەخۆیی خۆیان لە ئەجێندای دەسەڵاتی

سیاسی و حزبە دەسەڵاتدارەکان بپارێزن، هەر لەسەرەتای دروستبوونی زانکۆکان دەستێوەردانی حزب بە ئاشکرا لەم زانکۆیانە، کاریگەری سلبی لەسەر گەشەکردنی زانکۆکان دروست کرد، وێرای دابەشکردنی زانکۆکان لە نێوان ناوچەکانی هەژموون و دەسەڵاتی هەردوو حزبی دەسەڵاتدار، کولتووری دانانی بەشێکی زۆر لە راگر و سەرۆک بەشەکان بە پشتگیری مەڵبەند و لقە حزبیەکان و دەستێوەردانی رێکخراوە حزبیەکانی سەر بە هەردوو حزب، تا ئێستەش بەرۆکی پرۆسەی خوێندنی زانکۆیی بەرنەداوە. تەنانەت هەندێک لەو زانکۆیانە دۆسیەی گەندەڵیی و بە هەدەردانی داراییان لەسەرە و لەبری خەون و ئامانجە گەورەکان، هەندێک لەو زانکۆیانە لە کاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا بوو بوونە بارەگای حزبێکی دیاریکراو و کۆبونەوە و بانگەشەی حزبیان تێدا ئەنجام دەدرا !، بەشێک لە سەرۆکایەتی و بەرپرسانی زانکۆکان لە پێناو مانەوەیان لە پۆستە ئیداریەکانیاندا ئامادەن هەموو بریارێکی حزبیی جێبەجێ بکەن، ئەگەرچی رەنگە نەتوانن زانکۆکان بەرەو پێشەوە ببەن و شایستەی ئەو پێگە و بەرپرسیارێتیەش نەبن، بەڵام دەبینیت بۆ چەندین ساڵ لە پۆست و شوێنێکدا دەمێننەوە و زانکۆ و پرۆسەی خوێندن و گەشەپێدان دەبنە قوربانیی.

– سوود وەرنەگرتن لەو توێژینەوەی زانستیانەی ساڵانە لەم زانکۆیانە لە لایەن خوێندکارانەوە پێشکەش دەکرێن، گرفت و کێشەیەکی دیکەی زانکۆکانی هەرێمی کوردستانە، بە جۆرێک توێژینەوەکان تەنها وەک رۆتینێک لە لایەن خوێندکارانەوە پێشکەش دەکرێن و لە بوارە جیاجیاکانی پێداویستیەکانی حکومەت و کۆمەڵگە سوودیان لێ وەرناگیرێت، نەک بە تەنها توێژینەوەکانی خوێندکاران، تەنانەت ئەو توێژینەوانەی لە لایەن مامۆستایان لە گۆڤارە زانستیەکاندا بڵاو دەکرێنەوە و لە کۆنفراسە زانستیەکاندا پێشکەش دەکرێن، نارژێنە خانەی پرۆسەکانی گەشەپێدان و دەستنیشان کردنی گرفتەکان و دۆزینەوەی چارەسەر. هاوتەریب بەم کێشەیە توێژینەوەکان زۆربەیان توێژینەوەی (تاک)ین و کولتووری تیمی توێژینەوە لە زانکۆکانی کوردستاندا بە کەمی دەبینرێت و ئەوانەی پلەی زانستی بەرزیان هەیە لە بری سەرقاڵبوون بە توێژینەوە کاتەکانیان زیاتر بە وانە وتنەوە خەرج دەکەن و چەندین کێشەی دیکە.

– تاقیکردنەوەی ئەزموونی خوێندنی زانکۆیی جۆراوجۆر لە زانکۆکاندا، بە جۆرێک زانکۆکان و کۆی پرۆسەکە بووەتە تاقیگە بۆ ئەزمونی وڵاتانی دیکە، لەگەڵ گۆرانی وەزارەتێک و هاتنی وەزیرێکی نوێ، شێواز و ستراتیجیەتێکی نوێ لە پرۆسەی خوێندنی زانکۆیی بەسەر زانکۆو مامۆستایان و خوێندکاراندا تاقی دەکرێتەوە، هەندێک لەو پرۆسانە ئەزموونی ئامادە و لە قاڵبدراوی وڵاتانی دیکەن و بە بێ رەچاوکردنی ژینگەی هەرێمی کوردستان، بە ئامادەیی لێرە تاقی دەکرێنەوە، هەموو ئەمە بە زیان بۆ سەرکۆی پرۆسەی خوێندنی شکاوەتەوە و بەرەو ئیفلیج بوونی بردووە.

– قەیرانە سیاسی و ئابووریەکانی هەرێمی کوردستان کاریگەرییەکی نێگەتیڤانە و خراپی لەسەر خوێندنی زانکۆیی دروست کردووە، بەجۆرێک ئەم قەیرانانە نەیانهێشت جۆرێک لە سەقامگیریی بە هەندێک لەو هەوڵانە بدەن کە لێرەو لەوێ دەدران بۆ برەودان بە خوێندنی زانکۆیی، شەرو ململانێ سیاسیە ناوخۆیی و درەکییەکان و قەیرانە ئابووریە یەک لە دوای یەکەکان لە هەرێمی کوردستاندا گورزی کوشندەی لە زانکۆکان داوە و تا ئەم ساتانەش ئەو قەیرانە بەردەوامە و زانکۆکان لە بری بیرکردنەوەی

ستراتیجیانە و نەخشەدانان، سیاسەتی ڕۆژ و مانگ بەڕێ دەکەن و ڕەنگە خەونی گەورەی مامۆستایەکی زانکۆیی ئەوە بێت کە چۆن لە کاتی خۆیدا و بێ دواکەوتن مووچە مانگانەکەی وەرگرێت!

– کۆچی بەشێکی زۆر لە توانا ئەکادیمیەکان و کەمی هاندانی مادی و مەعنەوی بۆ مامۆستایان وخوێندکاران و شێوازی تەقلیدیانەی وانە وتنەوە و هەژاری کتێبخانەکان و لاوازی پەیوەندی و کارلێکی خوێندکاران لەگەڵ ژینگەیی زانکۆییدا و چەندین هۆکاری دیکە.

## زانکۆ حکومیی و ئەهلیەکانی هەرێمی کوردستان

| زانکۆی حکومی | زانکۆی ئەهلی |
|---|---|
| زانکۆی سەلاحەدین | زانکۆی ئەمریکی لە سلێمانی |
| زانکۆی سلێمانی | زانکۆی کوردستان |
| زانکۆی دهۆک | زانکۆی تیشک |
| زانکۆی هەڵەبجە | زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی |
| زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی | زانکۆی جیهان لە سلێمانی |
| زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر | زانکۆی کاسۆلیکی لە هەولێر |
| زانکۆی پۆلیتەکنیکی دهۆک | زانکۆی کۆمار |
| زانکۆی ڕاپەڕین | زانکۆی بەیان |
| زانکۆی گەرمیان | زانکۆی جیهان لە دهۆک |
| زانکۆی چەرموو | زانکۆی جیهان لە هەولێر |
| زانکۆی زاخۆ | زانکۆی لوبنانی فەرەنسی |
| زانکۆی سۆران | کۆلیژی زانکۆیی گۆیژە |
| زانکۆی هەولێری پزیشکیی | زانکۆی نۆلیج |

## ڕانکینی (١٠) زانکۆی حکومیی هەرێمی کوردستان لە سەر ئاستی جیهان بۆ ساڵی ٢٠٢٠ بە پێی سایتی
(Ranking web of universities)

| ناوی زانکۆ | شار | ڕانکینی نێودەوڵەتی |
|---|---|---|
| زانکۆی سلێمانی | سلێمانی | ٣٨٤٩ |
| زانکۆی سەلاحەدین | هەولێر | ٤٠٦٨ |
| زانکۆی هەولێری پزیشکی | هەولێر | ٥٣٩٠ |
| زانکۆی دهۆک | دهۆک | ٥٨٠٩ |
| زانکۆی سۆران | سۆران | ٦٥٥٣ |
| زانکۆی کۆیە | کۆیە | ٩٠٢٢ |
| زانکۆی زاخۆ | زاخۆ | ١١٠٠٤ |
| زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی | سلێمانی | ١١٧٣٩ |
| زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر | هەولێر | ١٥٨٩٠ |
| زانکۆی ڕاپەڕین | ڕانیە | ١٦١٩٣ |

## چوارەم: چۆن گەشە بە زانکۆکانمان بدەین؟

بە درێژایی ئەم چەندین ساڵە لە ئەزموونی زانکۆکان، لە لایەن دڵسۆزان و چاودێرانی خوێندنی زانکۆیی و هەندێک لە وەزیر و بەرپرسانی خوێندنی باڵا، سەدان پرۆژە و پێشنیاز بۆ چارەسەکردنی ڕەوشی زانکۆکان پێشکەشکراوە، بەداخەوە نەتوانرا وەک پێویست سوود لەو پێشنیاز و تێڕوانینە دڵسۆزانە وەربگیرێت و تەنها وەک مرەکەبی سەر کاغەز مانەوە، لێرەدا و بەحوکمی ژیان لە نێو کایەی زانکۆییدا و لە پێناو بەجێهێنان و گەیاندنی ئەرکی بەرپرسیارێتی ئەخلاقیانە بە رامبەر بە زانکۆ و خوێندنی باڵا ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو:

– پێش هەموو شت پێویستە زانکۆکان ببنە سەنتەری بیرکردنەوە و پلاندانی حکومەت و

دەسەڵاتی سیاسی، ئەگەر حکومەت گەشەدان و برەودان بە زانکۆکان نەخاتە ریزبەندیە یەکەمەکانی ئەجێندای کاری، هەرگیز زانکۆکان گەشە ناکەن و ناتوانن رۆڵی راستەقینەی خۆیان ببینن، دیارە ئەمەش پەیوەستە بە بوون و تەرخانکردنی بوودجەی پێویست و سەقامگیریەکی سیاسی و ئابووری لە هەرێمدا، لە وڵاتانی هاوشێوەی ژینگەی حوکمرانی و کۆمەڵایەتی وەک ئێمە حکومەتەکان بەم ئەرک و بەرپرسیارێتیە هەستاون و توانیویانە زانکۆکان بخەنە ریزبەندی پێشەوەی زانکۆکانی جیهان، مالیزیا و سعودیە و قەتەر وەک نموونە.

– پێویستە بە تەواوی دەستی حزب لە زانکۆکان دەربهێنرێت و زانکۆکان ببنە دامەزراوەی ئەکادیمی و زانستیی بە تەنها، بە بێ ئەم بریارە، هەرگیز زانکۆکان ناتوانن ئامانجەکانیان لە پەرەپێدان و چارەسەکردنی ئاریشە و کێشەکانی کۆمەڵگە جێبەجێ بکەن و هەمیشە لە کۆتایی لیستی رانکینە نێودەوڵەتیەکاندا دەبن.

– سوود وەرگرتن لە ئەزموونی وڵاتانی هاوشێوە، لەوانە بۆ نموونە وڵاتی (مالیزیا) کە زانکۆکانی بوونەتە دوانگەی زانستیی و ئەکادیمیی زۆر گەورە و بەناوبانگ و سەرچاوەیەکی داهاتی گرنگ بۆ وڵاتی مالیزیا، دەکرێت شاندی جۆراوجۆر بۆ ئەو وڵاتە (یان هەر وڵاتێکی دیکە) بنێردرێت و بانگهێشتی شارەزایان و بەرپرسانی زانکۆکانی ئەو وڵاتە بکرێت بۆ هەرێمی کوردستان بۆ گواستنەوەی ئەزموونیان.

– رێگە نەدان بە کردنەوەی زانکۆی نوێ و بەرزکردنەوەی کوالیتی زانکۆکانی ئێستە، بە مانا پێویستە چاودێری و پارێزگاری لە کوالیتی و ئاستی خوێندنی ئەم ژمارەیە لە زانکۆ حکومیی و ئەهلیەکانی کوردستان بکرێت و بەرنامەیەکی ستراتیجیان لە لایەن حکومەتەوە بۆ دابنرێت بۆ پاڵپشتیکردن و برەوپێدانیان.

– ناردنە دەرەوەی ستافی مامۆستایان و خوێندکاران بۆ دەرەوە بۆ وەرگرتنی شارەزایی و سوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەڵەکەبووی زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهان.

– کردنەوەی سەنتەرێکی نیشتیمانیی بۆ توێژینەوە و خوێندنی باڵا کە کۆمەڵێک لە پسپۆرانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیی لە خۆبگرێت و کاری چاودێری پرۆسەی خوێندنی باڵا و پێشکەشکردنی توێژینەوە و دانانی میتۆدی خوێندنی زانکۆکان و دروستکردنی پردی پەیوەندی لەگەڵ زانکۆکانی دونیا و پێشکەشکردنی پێشنیازی جۆراوجۆر بۆ گەشەپێدان بەم بوارە.

## بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


1- http://www.webometrics.info/en/search/Rankings/iraq%20type%3Amundial
رانکینی زانکۆکانی عێراق

٢. أية عبد الله أحمد النويهي – المركز الديمقراطي العربي، https://democraticac.de/?p=1905

٣. پۆلینی زانکۆکان لە سایتی ویکیپیدیا
https://ar.wikipedia.org/wiki/%D8%AC%D8%A7%D9%85%D8%B9%D8%A9

٤.جيفري ساكس، الجامعات وأهداف التنمية المستدامة في المنطقة العربية،
https://www.eda.ac.ae/docs/default-source/Publications/eda-reflection_sdg-universities_ar.pdf?sfvrsn=2

٥. ژمارەی زانکۆ حکومی و ئەهلیەکانی کوردستان لە سایتی http://www.nur-krg.net/

٦. ساجد شرقي، دور الجامعات في تطوير و تنمية المجتمعات، مركز الدراسات الايرانية

٧. عەلی راشید، زانکۆو فێرکردنی زانکۆیی، وەرگێرانی: یەحیا عومەر رێشاوی، بەرێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ١٥

٨. موفق الحسناوي، الجامعات و تطوير المجتمع،
http://www.alnoor.se/article.asp?id=46538.

# ڕۆڵی زانکۆ و پێگەی لە جێبەجێکردنی گەشەپێدانی بەردەوامدا






پ.ی.د.هاشم عومەر ئەحمەد

مامۆستا لەزانکۆی هەڵەبجە




## دەروازە:

زانکۆ لەئەمڕۆدا بەشێوەیەکی بەرچاو پێگە ورۆڵێکی گرنگی مەعریفی وهزری وچاکسازی هەیە بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگەکان- جیاواز لەپێشتر- بۆ گەشتن بەباڵایی و ترۆپک لە گەشە و پێشرەفتی شارستانی وژیاری وسەرجەم بوارەکانی ژیاندا، بوەتە سەنتەر و ڕوگەی هزری مرۆڤایەتی و سەرچاوەی گۆڕانکاریی بۆ گەشەسەندن وپەرەپێدانی تاک وکۆمەڵ-بەمەرجێک ویست وخواستی گۆڕانکاری هەبێت- ئەمەیش لەڕێگەی ئەو هێز وتوانا مرۆیی و پسپۆڕانەوە کە هەوڵی توێژینەوە و میکانیزمی زانستی گونجاو دەدەن بەپشت بەستن بەتەکنەلۆژیا و بازاڕی کار و هونەری بەڕێوەبردن و کارگێڕی و پەیوەندیی بەرفراوان و واقیع بینی ئەمڕۆی ژیان.

– گرنگی و ئامانجی ئەم بابەتەش لەوەدایە کە هەوڵدانێکی زانستیانەوە و هەنگاونان بۆ دۆزینەوە و چارەسەرکردن و بەرەنگاربونەوەی کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگە و بازاڕی کار و پێدانی پرۆژەی تەندروستی و زانستی وئابووری هەنوکەیی و داهاتوویی گرنگ بۆ دەوڵەت، هەرچەندە ئەم کارە بۆ زانکۆ نێوخۆیی و هەندێک لە زانکۆکانی ڕۆژهەڵاتی نێوین زەحمەتە جێبەجێکردنی وەک گەشەی بەردەوامی لەئان وساتدا، بێ پلان و ڕەچاوکردنی بارودۆخی ئەمڕۆ و ستراتیژیەتێکی دوور مەدا، چونکە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک لەو بەربەست وئاستەنگانەی کەهەیە بۆ تێکەڵبوون و گرێدانی مەعریفی و هزری وئابووری و ڕۆشنبیری و چەمکەکانی دیکەی پێشکەوتن لە نێوان زانکۆ وکۆمەڵگە و دەزگاکانی دەوڵەتدا، کە نەدەبوو وابوایە بەتایبەت بۆ کۆمەڵگە وبازاڕە نوێکانی کار و وڵاتە تازە پێگەشتووەکان.

– بۆیە ئەم تێڕوانینەش دەمانباتە ئەوەی چەند پرسیارێکی هەنوکەیی و گرنگ بکەین:

ئایا زانکۆکانمان دەتوانێت گۆڕانکاری و پێشکەوتنێکی بەرچاوی خودی و بابەتی و دەرەکی ئەنجام بدات بۆ هەستانەوەی زانست وفێربون لەپێناو گەشەی بەردەوامدا؟ یان دەتوانێت هۆکارێکی ئەرێنی بێت بۆ گەشەسەندنی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی و ڕۆشنبیری ووڵات لەپێناو بەدیهێنانی دادگەری کۆمەڵایەتی؟ یان دەبێت زانکۆ دوای کۆمەڵگە بکەوێت وئەو ڕێنوینی بکات؟

یان ئەوەیە زانکۆ خاوەن پرۆژەیەکی گشتگیر و هەمەلایەنەی زانستی هاوچەرخ بێت بۆ بونیادنانی داهاتویەکی زانستی پێشەکەوتو بەردەوام بۆ نەوەکانی ئێستاو داهاتوومان، وەگەڕخستنی توانای کەسانی پسپۆڕ وبەتوانا بۆبەشداریکردنیان چالاکانە لەدامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی دامەزراوەیی دەزگایی وسیستەماتیکی پێشکەوتو لەسەرجەم بوارەکاندا؟

لێرەوە پێویستە بڵێین زانکۆ چ هەنگاوێکی هەڵگرتوە تاوەکو ئێستا بۆ گەشەپێدانی بەردەوامی بۆ نەوەی داهاتوومان ئەگەر نا چۆن بتوانێت تێڕوانین و دیدگای داهاتووی خۆی بخاتە خزمەت ئەم پرۆژە نەتەوەیی ونیشتمانییەوە بۆ داهاتوی نەوە و ووڵاتمان، بۆیە پێویستە جددیتر و ڕێکخراوتر کار لەسەر ئەم بابەتە بکرێت و زانکۆ بەڕۆڵی هەنوکەیی و داهاتوی خۆی هەستێت وەک دەزگا و ناوەندێکی ئەکادیمی پرۆفیشنال و هاوچەرخانە، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە کار لەسەر چەند تەوەرەو چەمکێکی گرنگ بکرێت بۆ ئاشنابوونی زیاتر لەم بابەتە، ئەوانیش:

## تەوەری یەکەم:
## گەشەپێدانی بەردەوامی... چەمك وگرنگی

ئەوەی گرنگە بیزانین گەشەپێدانی بەردەوامی یانی چی، گرنگی ئەم بابەتە لەم ڕۆژەدا چییە و چۆن لێی تێبگەین؟ چۆن بتوانین کار لەسەر ئەم چەمکە بکەین؟:

**یەکەم: پێناسەی گەشەپێدانی بەردەوامی:**

چەندین پێناسەی جۆراوجۆر و جیاواز کراوە بۆ ئەم چەمکە لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە وەک فاکتەرێکی کاریگەر لەکۆمەڵگەدا ئەویش بەپێی ئەو قۆناغانەی کەپێیدا تێپەڕیوە، لەگرنگترین ئەو پێناسانەی کە کراوە بۆ ئەم بابەتە بریتییە لە:

– (دادگەری کۆمەڵایەتی لەباشکردنی ژیانی مرۆڤایەتی بۆ نەوەکانی ئێستا و داهاتوو لەگشت لایەنەکاندا: ئابووری وکۆمەڵایەتی و رۆشنبیری وژینگەیی، کە گرنتی جۆریک لە ژیانی خۆشگوزەرانی بەردەوام لە خۆ بگریت)(١).

– (هەموو ئەو توانا و ووزە مرۆڤانەیە کە بەگەڕ دەخرێت لەپێناو گەشە و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بۆ هاونیشتمانیان وکۆمەڵ) و (هەموو کارێکی مرۆیی بونیادنەرانەیە لە گشت کەرتەکاندا و لە سەرجەم بوارە جیاواز وگشت ئاستەکان)(٢).

–(پرۆسە وستراتیژیەتێکی گۆڕانکاری تۆکمەیە بۆ باشترکردنی جۆر وشێوازی ژیانی مرۆڤایەتی وپارێزگاریکردن لەسەرچاوە مرۆیی و سروشتییەکانی گەردوون و باش سوود لێوەرگرتنیان، هەوڵدانی بەردەوام بۆ زامنکردن و بیرکردنەوە لەژیانی نەوەی ئێستا و داهاتوو بەرەچاوکردنی توانا وهێزو توانایی دامەزراوەیی وسیستەمی سروشتی ژیان)(٣).

– (بریتییە لەو گەشەپێدانەی کە بەدەم پێداویستییەکانی ئەمڕۆوە دێت بەبێ دەستوەردان و سازشکردن لەسەر توانای نەوەکانی داهاتوو لەسەر پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیان)(٤).

**دووەم: گرنگی وئامانجی گەشەپێدانی بەردەوام:**

لەسایەی ئەو گۆڕانکارییە خێرایەی کە ئەمڕۆ جیهان و مرۆڤایەتی پێیدا تێدەپەڕێت لەسەرجەم بوارە جیاوازەکانی ژیاندا لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە ئەوشۆڕشە تەکنەلۆژیی و زانیارییە بێسنور و دوابەدوایەکەی کە دونیامانی تەنیوە وەکو پەتی جاڵجاڵۆکە و کردویەتی بەدونیایەکی بچوک، ناکرێت لەم نێوەندەدا زانکۆ بێباکانە و دوورە پەرێز بێت و تەنها سەیری ڕووداوەکانی چواردەوری بکات، بەڵکو پێویستە بەشدارییەکی کارا وچالاکی هەبێت ئەویش لەرێگەی: (ئامادەکردنی تاک وکۆمەڵگە و هۆشیارکردنەوە و ناساندنیان بەچەمک و رۆشنبیری گەشەپێدانی بەردەوامی لە گشت ئاستەکاندا و، چاندنی رۆحی ئاشتی و پێکەوەیی و بەها باڵاکان و مافی مرۆڤ بەشداریکردنی ڕاستەقینە و دروستانە لە سەرجەم بوارەکانی بەردەوامی ژیاندا، ئەویش لەپێناو ژیانێکی مرۆیانە و خوشگوزەرانەی سەربەرز و رێزلێگیرا و وشکۆمەند مرۆڤانەدا).

کەواتە گەشەپێدانی بەردەوامی تێڕوانین و بینینێکی دوورمەدای زانستی و پەروەردەیی و فێرکردنە و هەوڵدەدات بۆ دۆزینەوە و دانانی ستراتیژییەکی هاوسەنگ لەنێوان خۆشگوزەرانی مرۆڤ و گەشەو و رەفاهیەتی ئابووری و کلتووری و رۆشنبیری، لەنێوان بەردەوامیەتی سەرچاوە مرۆییی و سروشتی و ژینگەییەکان لەپێناو فەراهەمکردنی ژیانێکی ئاسودە و بەختەوەر و گەشەسەند و بۆ نەوەی ئێستا و داهاتومان، چونکە بێ ئەم هاوسەنگییە گرنگە لە گەشەپێدانی بەردەوامی زۆرجار دەبێتە هۆی کێشە و گرفتی سروشتی و ژینگەیی وئابووری و تەندروستی و زانستی لەگشت ئاستەکاندا، دواجار کۆمەڵ و دەسەڵاتێکی وێران و ژینگەیەکی تێکچوو زانکۆی نازانستی دروست دەبێت، لەبریدا پەنا دەبرێتە بەر گەندەڵی و ناشەفافیەت لەبەکارهێنان و وەدەستخستنی زانیاری و زانست و سامان و کەرەستەکان لەسەرجەم بوارەکاندا، ئەمەش بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو بۆشایی و ناجێگیری و بێ متمانەییەی کە لەئەنجامی ئەو ناهاوسەنگییەوە دروست دەبێت.

لێرەوە رەهەندە دوورمەدا وتایبەتمەندییەکانی گەشەپێدانمان بۆ دەردەکەوێت، هەندێک لەوانە:



گەشەپێدانی بەردەوامی ڕەهەندی ئاوەدانکردنەوەی زەوی و گەشەی مرۆڤایەتی کردوەتە ئامانجە سەرەکییەکانی و مرۆڤی کردووەتە چەقی کارلێك و گۆڕانکاری بۆ ژیاندۆستی.

- کار و کردەیەکی مەبەستدار و پلان بۆ داڕێژراوە.

- پێویستە بۆ گۆڕانکاریی بەشێوەیەکی سیستەماتیکی و گشتگیری نەک پارچەیی.

- کردەیەکی خودی و ناوخۆییە واتە پایە و بنچینەی سەرهەڵدانی گەشەپێدانی بەردەوامی هەڵقوڵاوە لەنێو ئەندامانی خودی کۆمەڵەکە نەک دەرەکی بێت.

- کردەیەکی بەردەوامی هەرەوەزی سەرجەم پێکهاتەکانە، بەتایبەت زانستخوازان لەزانکۆکان و کەسانی پسپۆری دەرچوو لەزانکۆکان کە ئەمانە دەبنە هەوێنی کاری دەستەجەمعی نێو کۆمەڵ.

- لەگەشەپێدانی بەردەوامدا ڕەچاوی سەرجەم بوارەکانی ژیان دەکرێت چ بواری گەشەی ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان زانستی یان تەندروستی.

**تەوەری دووەم: ڕەهەندەکانی گەشەی بەردەوامی و زانکۆ:**

بەرمەبنا و ئەو تێڕوانینەی پێشوتر باسمان کرد بۆمان دەردەکەوێت گەشەپێدانی بەردەوامی ڕەهەندی ئاوەدانکردنەوەی زەوی و گەشەی مرۆڤایەتی کردوەتە ئامانجە سەرەکییەکانی و، مرۆڤی کردووەتە چەقی کارلێک و گۆڕانکاری بۆ ژیاندۆستی، ئەویش لەسەر بنەمای چەند ڕەهەندێکی سەرەکی هەڵقوڵاو لەدیدگا و بەرمەبنای گەردوون دۆستی و مرۆڤ دۆستی بۆ خزمەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، گرنگترین ڕەهەندەکانیش:

**یەکەم: ڕەهەندی مەعنەوی مرۆڤایەتی:**

واتە جەخت کردنەوە لەسەر بونیادی مرۆڤ و گەشەی خودی مرۆڤەکان، ئەویش بەپەروەردەکردنی لەڕووی ئایینی و ڕۆحی و خو و ڕەوشت و بەها و زانستەوە، لەم گۆشەوە ڕۆڵی زانکۆو زانستخوازەکان زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت بۆ جێبەجێکردنی ئەم گەشەیە، چونکە هەر دوور کەوتنەوەیەکی زانکۆ و ئیهمال کردنێکی لەم بەرپرسیاریەتیە پرۆژەکانی گەشەی بەردەوامی دەخاتە بەردەم لەناوچوون، بەرپرسیار دەبێت لەبەرامبەر نەوەی داهاتودا، هەرچەندە هەندێک لەزانکۆکانی دەرەوە بەئاستێکی زۆرباش توانیویانە ڕووە گەشە مادییەکە بەرجەستە بکەن و بەرەوپێشچونێکی زانستی بەدی بهێنن

بەڵام بەهۆی گوێنەدان بەلایەنە ڕۆحی و مەعنەوییەکەی مرۆڤ-کە پێویستیەکی ئانی و داهاتووی مرۆڤە- بووەتە هۆکاری بڵاوبونەوەی پاوەنکاری و بەرژەوەندخوازی و ناجێگیری تەندروستی و بەکارهێنانی زانست بۆ دەسخستنی داهات وسامان نەک خزمەتی مرۆڤ وکۆمەڵگە(٥)، هەر ئەم ئاوەدانییە مەعنەوییە بۆ دەروونەکانی مرۆڤ بناغە و بنچینەن بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و گەشەی شارستانی بەشێوەیەکی دادگەر و تەندروست، چونکە بەبێ پاكژكردنەوەی دەروون و باڵایی بەهاکان مەحاڵە شارستانیەت و ژیارێکی دروستمان بۆ بێتە دی، وەک خوای گەورە دەفەرمێت: {أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ} (سورة الروم:٩)، هەرکاتێک چەمکەکانی زانست وکاری


پێویستە ناوەندە ئەکادیمییەکان بەتایبەت زانکۆ ڕۆڵ و پێگەی خۆی بزانێت لە هۆشیارکردنەوە و پێگەیاندنی تاکی و سەرچاوەی مرۆیی وادانانی ستراتیژیەت وپلانی گونجاو بۆ گەشەپێدانی بەردەوامی کۆمەڵگە.

وەرگرتن وپێدانی فێربون زانانین گونجاو بوو بۆ بونیادی مرۆڤ -چونکە خودی مرۆڤ بنەمایە بۆ گەشەپێدانی بەردەوامی-و هاوتەریب بوو لەگەڵ بنەما و بەرژەوەندییە دروستەکانی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی، ئەوا جێبەجێکردنی گەشەی بەردەوامی ڕێڕەوێکی دروستی وەرگرتووە، لەسەر ئەم بنەمایە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) مژدە بەو جۆرە کەسانە دەدات کە ژیانیان بۆ خزمەتی زانست و مرۆڤایەتی تەرخان کردووە دەفەرموێت:

{من سلك طريقا يلتمس به علما سهل الله له طريقا إلى الجنة}(٦).

لەگەڵ ئەوەی زۆر لەزانکۆکان هەوڵ دەدەن لەڕووی دڵنیایی جۆرییەوە پێشڕەفتی زیاتر و ئاستی زانکۆکان بەرەو باڵاتر ببەن، بەڵام ئەوەی کە گرنگترە و ستراتیژیەتە بۆ تاک و کۆمەڵگە لەڕووی گەشەپێدانی بەردەوامیەوە -ئەویش تێکەڵکردنیەتی بە پرۆگرامەکانی خوێندن و جێبەجێکردنیەتی بەپراکتیزەکردنی وسوود وەرگرتن لەو زانکۆیانەی کە پەیڕەوی دەکەن- کە جێبەجێی بکەن زۆر هەژارن ولاوازانە بیر لەو بابەتە گرنگە دەکەنەوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەو جۆرە زانکۆیانە هەم ئاوێتە نەبووە لەگەڵ ناخ ومەعریفەی مرۆڤایەتیدا هەم نەیتوانیوە هەست بەکێشەی تاک وکۆمەڵگە بکات لەئێستا و داهاتوودا، ڕەنگە هۆکاری دیکەش هەبێت وەک دوورکەوتنەوە لەبەها باڵاکان و پەروەردەیەکی تەندروست، لایەنگیری ودانەنانی کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو... .

**دووەم: ڕەهەندێکی مادی ئاوەدانی:**

مەبەست لەم ڕەهەندە ئاوەدانکردنەوەی زەوییە لەسەرجەم بوارە جیاوازەکاندا و سوود وەرگرتنە لەگشت توانا و کەرەستە مادیەکان، بەتایبەت زانست و زانین بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیی لەسەر بنەمای جێنشینێتی مرۆڤ لەسەر زەوی وەک خوای گەورە دەفەرمێت: {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً} (سورة البقرة:٣٠)، بەڵام جێنشینی ئاوەدانی نەک وێرانکاری، وەک خودا دەفەرمێت: {وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ} (سورة الأعراف:١٠) و: {هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا} (سورة هود:٦١) واتە: خوای گەورە ئێوەی کردوەتە جێنشین و ناز و فەڕ و نیعمەتێکی زۆری پێ بەخشیون، چ ئەوەی لە زەویدایە یان لەئاسمانەکاندا، تاوەکوو بەکاری بهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆتان و سوودی لێ ببینن، بەڵام بەشێوەکی دروست وتەندروست(٧)، لەگەڵ ئەم جێنشینەشدا خوای گەورە مرۆڤی واز لێ نەهێناوە و بیداتە دەست ڕۆژگار و سروشت و زەمەن، سەربەخۆ بێ بەرنامە کاری جێنشینی بکات، بەڵکوو هەموو پایە و کەرەستە و هۆکار و ڕەگەزەکانی کاری جێنشینی بۆ فەراهەم کردووە و خستویەتییە خزمەتییەوە ئەگەر پەی پێ ببات، کە پێکهاتووە لە دوو بەخششی زۆر گرنگ(٨):

١. توانای ژیری و جەستەیی لەگەڵ ئامرازەکانی مرۆڤی بوون: کە بتوانێت سوودی تەندروست ببینێت لەگشت ئەو سامان و دەسەڵات و کەرەستە و خزمەتانەی کە خودا پێی بەخشیوە لەسەر زەویدا،

وەک خودای گەورە دەفەرمێت: {أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ} (سورة البلد:١٠)، واتە: خوای میهرەبان ناز و نیعمەتانێکی زۆری پێ بەخشیویت لەوانە ئەو نیعمەتە جەستەییانەی– وەک چاو زمان و لێوەکان دەست وقاچ و...- کە وەکوو ئامراز و ئامێرێکی تەندروست بەکاربهێنیت لەپێناو گەشتن بەچاکخوازی وکامڵ بون و زانست و زانیاری و بەرژەوەندیەکانی دیکەی مرۆڤایەتی، هەروەها ڕێنمونیمان کردووە بۆ چاکە و ڕێگای چاکە و خراپەیشمان نیشانداوە، لە گەڵیدا سروشت و فیترەتمان پێدراوە بۆ جیاکردنەوەی چاکە و خراپە لەڕێگەی ژیری و ویژدانەوە(٨).

٢.هۆکار و ئیمکانیات و کەرەستە گەردوونییەکان: ئەو هەموو هۆکار و ئیمکانیاتانە دراوە بەمرۆڤ تاوەکوو بتوانێت و هەوڵ بدات زەوی پێ ئاوەدان بکاتەوە، وەک خودای گەورە دەفەرمێت: {وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ} (سورة النحل:١٢)و{ وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ} (سورة النحل:١٤)، لەچەندین ئایەتی دیکەدا خوای گەورە باسی ئەو ئامراز و هۆکار و کەرەستە گەردوونیانە کردووە کە مرۆڤ سوودیان لێ ببینێت بۆ ئاوەدانی وخۆشگوزەرانی خۆیان.

مەبەست لەباسکردنی ئەم ڕەهەندە (جێنشین): گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە لەبواری گەشەپێدانی بەردەوامدا، ئەویش لەڕوانگە و مەبنای ئەوەی کە خوێندنەوەی مرۆڤ بۆ گەردوون و خودی نابێت تاکڕەوییانە و بەرژوەندانەی نادروست و پاوەنخوازانە بیر لەبوون و خود و گەردوون بکاتەوە، تەنها کارەکانی لەسەر بنەمای زەمەن و مەکانی ئێستا بونیاد بنێت، ئەمەیە پێچەوانەی هزری جێنشینی، چونکە لێرەدا مرۆڤ سەنتەرە، بەڵام تاک و ئێستا نییە، بەڵکو داهاتوو و کۆمەڵگە و نەوەیەکی دی و ژینگەیەکی دیکەیە کە هەموویان پێکەوە گەردوون جوانتر دەکەن و مانا دەبەخشنە ژیان و نەوەکانی داهاتوومان، ئەمەش مانای خزمەتی زانستە بۆ ژینگە و ژیان و نەوەی داهاتوو، بۆیە پێویستە زانکۆ سەرمەشقی ئەم پرۆسە مرۆڤدۆستی و پانۆرامایەی ژیان بێت بۆ بەردەوامیەت و گەشەی زیندوو لەگەردووندا، ئەگەر نا داهاتومان ڕوون نابێت و وەرچەرخانی پێچەوانە ڕوودەدات لە هزر و فیکری مرۆڤەکاندا و دواجار مرۆڤ دەبێتە قوربانی کارە نازانستییەکان.

**سێیەم: ڕەهەندێکی فرە لایەنی (ئابووری- ژینگەیی- کۆمەڵایەتی):**

ئەم ڕەهەندە چەند تەوەرەیەکی گرنگ لەخۆ دەگرێت-هەرچەندە ئەم ڕەهەندانە بونیان هەیە لەوانەی پێشودا بەڵام بەپرش وبڵاوی- کە لە ڕێگەی گەشەپێدانی بەردەوامەوە یارمەتیدەر دەبن بۆ کارکردن لەسەر پێشترینی پێویستییەکان و بەرەنگاربونەوەی بەربەست و ئاستەنگەکانی کۆمەڵگە لە هەموو ڕوویەکەوە: ( ئابووری- تەندروستی- ژینگەیی- کۆمەڵایەتی- کارگێڕی- تەشریعی یان ژێرخانەکانی دیکەی کۆمەڵگە).

- گرنگە ئەوە بڵێین تەوەری ئابووری: کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر بوژانەوەی بژێوی تاک و کۆمەڵگە و دەستەبەرکردنی پێداویستیە سەرەکییەکانی مرۆڤ و خۆشگوزەرانی و ڕەفاهیەت و بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەم و هەناردە و کەمکردنەوەی بێکاری، ئەگەر بەشێوەیەکی دروست و ڕێکخراو و دادگەرانە مامەڵە لەگەڵ دابەشکردنی سامان و داهاتی وولات بکرێت، بەشێوەیەک لەپێناو باشترکردنی گوزەرانی تاکی هەژاردا بێت و سەرچاوەکانی دارایی و کار و پیشەوە ڕێکخراوتر بکرێت، بەجۆرێک کار لەسەر جۆرێتی کاڵا و بەرهەم بکرێت، نەک چەندێتی بەپێی تیۆری گەشەی ئابوری باڵا و نموونە و باشتر، چونکە بواری ئابووری سەرجەم کەرتەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی....هتد دەگرێتەوە، کە ئەمانە

بۆ خۆیان زانست و زانکۆ کاریگەری زۆری دەبێت لەسەریان بەپاڵپشتیکردنی پرۆژەکان لەڕێگەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی و کاری تاقیگەیی پێشکەوتوو وپێدانی ڕاویژەوە(٩)، دەکرێت ببێتە بەشدارێک و پردێکی مەعریفی و ئەزموونی بۆ تاک لە کۆمەڵگە و بازاڕی کاردا، ئەمەش گەشپێدانی بەردەوامی بەشێوەیەکی کاریگەر بەشدار پێ دەکات لەبڕیار و ڕێنماییە پەیوەستدارەکان بە ئابووری وولاتەوە، نەک تەنها چینێک ودەستەیەک کاربکەن لەسەر ئابووری وولات بێگوێدانە داهاتووی نەوە و وولات، کە دواجار کارەساتی جەرگ بڕی ئابووری و گەندەڵی لێ دەکەوێتەوە و وولات ونیشتمان نوقمی خراپەکاری و پاوەنخوازی دەبێت.

– ڕەهەندی کۆمەلایەتی: لەگەڵ ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنە گەورەی ئەمڕۆ دەیبینین لەبواری گەیاندن و تەکنەلۆجیا و گەشەی ئابووریدا، بەلام هەستکردن بە نائارامی و نائاسودەیی لای تاک و کۆمەڵگە زیاتر دەبێت، ئەویش بەهۆی جێبەجێنەکردنی گەشەی کۆمەلایەتی، هەر ئەمەش بوو وایکرد لە نەتەوە یەکگرتووەکان چەندین کۆنگرە و کۆنفرانس ئەنجام بدەن لەبواری گەشەی کۆمەلایەتی. ئەوەتا لە ساڵی (١٩٩٥ز) لە دانیمارک گەورترین کۆنگرەی نێودەوڵەتی ئەنجام دەدات بەناوی (لوتکەی جیهانی بۆگەشەی کۆمەلایەتی) کە تیایدا نوێنەری (١٨٨) وولات بەشداربوون، بابەتە گرنگەکەی ئەم لوتکەیەش «دانانی گەشەی کۆمەلایەتی لەناو چەقی گرنگیپێدراوەکانی سیاسەتی جیهانییدا»، ئەمەش لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشە کۆمەلایەتییە سەرەکییەکانی جیهان.

ئەم ڕەهەندە زیاتر هەوڵ و بانگەشەی بۆ گرنگیدانی زیاتری مرۆڤ بووە لەناو کۆمەڵگەدا، مرۆڤی کردوەتە چەقی کار و چالاکییەکانی ئێستا و داهاتوو کەخۆی بینیوەتەوە لە:

– دادگەری لەدابەشکردنی سامان و داهات... .

–دانانی سیستەمێکی دروست بۆ پارێزگاریکردن لەژیانی کۆمەلایەتی.

– پێدانی ماف و پاریزگاریکردن لەمافی مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی.

– تاک توانای بەدەستهێنانی کار و بژێوی و خزمەتگوزاری تەندروستی و بیمەی کار و چاودێری تەندروستی هەبێت بەبێ جیاوازی.

– باشترکردنی ئاست و جۆری خوێندن و فێرکردن، سوود وەرگرتن لەسەرجەم هۆکارەکانی پێشکەوتن بۆ خزمەتکردنی تاکی خوێنەوار و ناوەندەکانی خوێندن.

– بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و پەرەپێدانی گەشەی مرۆیی.

– ڕێکخستنی هەڵسوکەوتی بەکاربەری و مامەڵەکردن لەلای کەسی بەکاربەر، بەکارهێنانی باشترین جۆری کەرەستە وسەرچاوە مرۆییەکان.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ڕەهەندەکانی دیکەی وەک تەندروستی و ژینگەیی و کارگێڕی تەشریعی کاریگەریان کەمتر نییە لەوانی دیکە و پەیوەستدارن پێکەوە، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو ئەمانە کاریگەری سەرەکی و ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر پرۆسەی گەشە و پەرەپێدانی کۆمەڵگە و هۆکارن بۆخۆشگوزەرانی مرۆڤەکان بەگشتی و بەشێوەیەکی بەرفراوان، بە پێچەوانەوە لە ئەنجامی جێبەجێ نەکردنی هەریەک لەمانە کۆمەڵگەیەکی نەخۆش و ناتەندروست، ژینگە و هەوای پیس و تێکچونی کەش و هەوا و کەم ئاوی و بەبیابانبوون و... هتد دروست دەبێت، یان بەڕێوەبردن و کارگێڕییەکی بەرەو گەندەڵ و نا شەفاف و بەشبەشێنە وکەسی نەشیاو لەشوێنی گرنگدا دەبینرێت.

ئەمەیە کە دەڵێین پێویستە ناوەندە ئەکادیمییەکان بەتایبەت زانکۆ ڕۆڵ و پێگەی خۆی بزانێت لە هۆشیارکردنەوە و پێگەیاندنی تاکی و سەرچاوەی مرۆیی ودانانی ستراتیژیەت وپلانی گونجاو بۆ گەشەپێدانی بەردەوامی کۆمەڵگە، کە دواتر زیاتر باسی لێوە دەکەین.

## تەوەری سێیەم: ڕۆڵی زانكۆ لەجێبەجێكردنی گەشەپێدانی بەردەوامدا:

لەم چەند ساڵەی دواییەدا لەلایەن ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان و هەندێک لەناوەندەكانی خوێندنەوە -زانكۆكان بەتایبەت- گرنگی زیاتر درا بەناوەڕۆكی چەمكی گەشەپێدانی بەردەوام وجێبەجێكردنی، بەمەبەستی بونیادنانی مرۆڤایەتی مرۆڤ و پەرەپێدانی گەشە و تواناكانی نەوەی ئێستا و داهاتوو، كە بتوانن مامەڵەیەكی دروست لەگەڵ گشت چەمک و تەوەرەكانی گەشەپێدانی بەردەوامدا بكەن، چونكە لەسەردەمێكدا دەژین كە گۆڕانكارییەكانی ژیان بەشێوەیەكی خێرا دەگۆڕێت و وێنا و ستراتیژیەتی جیهان بەشێوازێكی جیاواز وێنادەكێشێت كەزانست تیایدا بەشدارییەكی چالاک و بەرچاوی هەیە،

بەرمەبنای ئەمەیە دەڵێین پێویستە جارێكی دیكە دارشتنەوە و گۆڕانكاری لە پرۆگرام و هەیكەلیەتی كاری زانكۆ و پەروەردە بكرێت، بەپێی پێویستییەكانی ڕۆژ و سەردەم نەک بەپێی حەزی كەسی وتایبەتی....، ئەم گەشەیە پێویستە بگونجێت لەگەڵ ئەو گۆڕانكاریی و پێوەرە زانستی و كارگێری وتەكنیكی و ئیعلامی و تەكنەلۆژیایەی سەردەم و ئەو واقیعەی تیایدا دەژین، نەک هاوردە كردنی دیدگایەكی گەشەیی و سیستەمێک دوور لە ئەتەكێت و واقیع وخوێندنەوەی دروست بۆ ڕێكار و هۆكارەكانی گەشە و گۆڕانكاری و دید و تێروانینەكانی تاكی كوردی پێداویستییەكانی.

ئەگەر ئامانج لەگەشەی بەردەوامی دەرخستنی توانا و ویست و گەشەی مرۆڤ بێت، ئەوا زانستیش مەبەست و ئامانجیەتی كە مرۆڤایەتی مرۆڤ بەدی بهێنێت و توانا و هێز و ووزەی هزری و مەعریفی و جەستەیی وەگەڕبخات وسوودی لێ ببینێت، ئەمەش لەڕێگەی فێربوونی زانست و زانینەوە بەمانا فراوانەكەی، ئەمەش بۆ جێبەجێكردنی گەشەپێدانی بەردەوامییە(١٠)، زانكۆش وەک ناوەند و بزاڤێكی زانستی و فێربوون و ڕۆشنبیری و پێگە مەعریفییەكەی لەڕێگەی ئەو بنەما و سومبولە زانستییەی هەڵیگرتووە و بانگەشەی بۆ دەكات دەتوانێت هاوكارێكی باش و كاریگەر بێت بۆ یارمەتیدانی ئێستا و داهاتووی هاوڵاتییان و نەوەی ئێستا و داهاتوو لەسەرجەم بوار و لایەنە جیاوازەكانی ژیاندا، لەڕێگەی:

١-زانكۆ وەک پێگە زانستیەكەی بۆ جێبەجێكردنی گەشەی بەردەوامی ڕوویەكی دیكەی نوێ و دەلاقەیەكی تازە و ژێرخانێكی تەواو دەبەخشێتە زانست و فێربون و پەروەردە بۆ هەموان، ئەویش: (بە برەودان و كاركردن بۆ فێربونی زانستێكی باش و تۆكمە و واقعیانە لەجۆر و چۆنیەتی كەرەستە و ناوەڕۆک و دڵنیایی جۆریدا) كە هەمووان سودی لێ ببینن و توانای وەرگرتنیان هەبێت لەلایەک، لەلایەكی دیكەوە لەناخیدا هەڵگری تۆوی نوێگەری بێت، بەردەوام وزە و توانا و داهێنانی شاگردانی بەدەربخات بۆ بونیادنانی كۆمەڵگەیەكی زیندوو بەتوانا، بەڵام ئەمە پاڵپشت بە بەها و ئاكار و بنەما جوانەكانی مرۆڤایەتی، نەک بەدوور خستەوەیان لەو بەها باڵایانە و گۆشكردنیان بەهەڵسوكەوت و بیر و هزری نابەجێ و نامۆ بەكلتوری زانكۆ و ئادابی گشتی كۆمەڵگە و داب و نەریتەكانی، دواجار كۆمەڵگەیەكی بەكاربەری نوستوو نامۆ و نائارام و ناسەقامگیری هزری و زانستی دروست دەبێت.

٢-لە ڕێگەی زانست و فێربونەوە -بە بەردەوامی ژیان- زانكۆ دەتوانێت جۆرەكانی ژیانی مرۆڤایەتی پتەو و سەقامگیر و بەردەوامتر بكات لەڕێگەی دادگەری كۆمەڵایەتی و ئابووری و دابەشكرنی دروست و ئاسایشی خۆراک و ژینگەی دروستەوە بۆ هەموو تاكێكی كۆمەڵگە بەبێ جیاوازی، ئەمەش بەدانانی پرۆژەیەكی دوورمەدا و ستراتیژیەتێكی گشتگیر—بەتایبەت كەزانكۆ كارەكتەر وفاكتەرێكی گرنگە بۆ بونیادنانی سەرمایەی مرۆیی-.

بە جێكردنەوەی ئەو بابەتانەی كە پێویست و

گرنگن و دەسپێشخەرن بۆ ڕێکخستن و پێشکەوتنی مەعریفە و زانست بۆ خزمەتکردنی پێداویستییە گرنگەکانی کۆمەڵگە لە پرۆگرامەکانی خوێندندا، بەتایبەت بۆ گۆڕان و ڕووودانی پێشکەوتنی زانستی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بەجۆرێک کە ببێتە بناغە و بنەما بۆ دانان و دامەزراندنی پلان و ستراتیژیەتی گەشەی بەردەوامی.

٣- زانکۆ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە (دیاریکردنی دیدگا و ڕوانگە و ڕێگای داهاتوو بەهەردوو مەوداوە - نزیک ودوور- کە لەڕێیەوە نەوەی داهاتوو دەتوانن زانست و زانین و ئەزموونەکان وەربگرن بەهۆی جێبەجێکردنی گەشەی بەردەوامی، لەپاڵ ئەمەشدا بەردەوام توێژێکی ئامادەکراوی خاوەن بەهرە و لێهاتوو وەک هاوڵاتییەکی باش و بەرپرسیار لەبەرامبەر داهاتوو بخاتە کۆمەڵگەوە، بۆ ئەوەی ئەمانە بەردەوامیەت و گەشەیان هەبێت پێویستە زانکۆ هەستێت بە هۆشیارکردنەوە و زیندوکردنەوەی ئەو هەست و بەرپرسیاریەتییە مێژووییە لەلایان، بەسوود وەرگرتن لەو هەل و کات و توانایەی ئەوانی تیادایە، ئەویش بەپراکتیزەکردن و وەبەرهێنانی ئەو توانایانەیان بە هاوبەشی بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگە و بەرەنگاربونەوەی ئەو ئەگەرانەی کە ئێستا و داهاتووی خۆیان و نەوەی داهاتوو دەخاتە مەترسییەوە.

٤-زانکۆ وەک دەزگا و ناوەندێکی توێژینەوە و دایگەیەکی مەعریفی و ڕێپێدراوی ئەکادیمیی پێویستە (ڕۆڵی تەواوکاری و پێکەوەیی) هەبێت:

بەمانای ئەوەی زانکۆ وەزیفە و کاری خزمەتکردن و چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگەیە، بۆیە دەبێت تێڕوانین و ڕوئیای ڕوونی هەبێت بۆیان، کاری تەواوکاری و پێکەوەیی بکات لە نێوان خۆی وەک دەزگایەکی ئەکادیمی لەگەڵ دەزگا کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەندروستییەکاندا، نەک لێکترازان و دابڕان، کە مەوداکان دوردەخاتەوە، پەرەپێدان و گرنگیدان بەزانکۆ تەسکتر دەبێتەوە و گەشەی بەردەوامیش لاواز دەبێت یاخود هەر نامێنێت، چونکە دەبێت لەکۆتادا ئەوە بزانین کە زانکۆ هەوڵ و تێکۆشانێکی کۆمەڵگەییە و لەسەر کاری جیاوازی کۆمەڵگە و کارلێکی ئەندام و خێزانەکانی کۆمەڵگە وەستاوە.

بۆیە بەرمەبنای ئەمە پێویستە زانکۆ وەک فاکتەرێکی مەعریفی بەهێز و پێگەیەکی زانستی و ڕۆشنبیری ببێتە پێویستیەکی گرنگ و هەنوکەیی ئێستا و داهاتووی کۆمەڵگە بەهەموو دەزگاکانیەوە -حکومی و ئەهلییەکانیش- هەستی پێ بکرێت، توانای ڕاکێشانی ڕای گشتی و بڵاوکردنەوەی هزری زانستی و پەروەردەیی و ڕاوێژکاری هەبێت و ببێتە تەواوکاری کۆمەڵگە(١١)، بۆ نموونە: لە چین کۆلێژەکانی پەروەردە بە هاوکاری دەزگاکانی کۆمەڵگە لەوانە بەڕێوەبەرایەتیەکانی پەروەردەی ناوخۆیی هەستان بەپێشکەشکردنی چەندین وانە سیمینار لەسەر تەندروستی گشتی و خورەوشت و ئەخلاقناسی و زانستی دەروونی منداڵان، لەگەڵ ئەمانەشدا کاریان دەکرد لەسەرسەرپەرشتیارانی خوێندکاران،وە هەمان کار لە٥٠٠ کۆلێژی زانکۆکانی وڵاتی یابان بۆ ماوەی یەک ساڵ کاری هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵگە ئەنجامدرا، چەندین زانکۆی دیکەی وڵاتانی پێشکەوتوو وەک ئەمریکا و سەنگافورە .... هەموویان تەواوکاری کارەکانی کۆمەڵگە بوون(١٢).

٥-پێکهێنانی دەزگا و نێوەندێکی کارا و تایبەت بە (پرۆگرام وڕێگاکانی وانەوتنەوە و گواستنەوەی زانیاری نوێ لەچوارچێوەی گەشەپێدانی بەردەوامدا لەنێوان زانکۆکاندا) گرنگی بدات بە پەرەپێدانی پرۆگرامی خوێندن وفێربونی بەردەوام و زانیارییە سەردەمیەکان لەسەر ئاستی نێو خۆیی، چونکە بوونی وەها دەزگایەک گرنگە بۆ داڕشتنەوەی (سیاسەتێکی پەروەردەیی زانستی بەردەوام) لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە بۆ دانانی

(پرۆگرامێکی زانستی فێرکاری نێوخۆیی) ڕاوەستاو لەسەر پایە جێگیر و تایبەتمەندەکانی ناوخۆ، بەڵام لەچوارچێوەی کاری زانستی نێودەڵەتی هاوبەش و بەسوود وەرگرتن لە ئەزموون و شارەزایی پسپۆرانی نێودەوڵەتی بەتایبەتی لەبواری گەشەپێدانی بەردەوامیدا.

٦- زانکۆ هەوڵ و توانا کەسی و دەستە جەمعییەکانی بدات بۆ پەیوەندییەکی قووڵی زانستی هاوبەش و هاوکاریەکی تەواو لە نێوان زانکۆ و دەزگا و ناوەندە ئەکادیمی و کۆمەڵەی مەدەنییە ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەکاندا و، پاڵپشتێکی جددی ئەم پرۆسە بێت لەپێناو گەشە و پەرەپێدان و هۆشیارکردنەوەی تاک و کۆمەڵگە بۆ:

- ڕێکخستنەوەی هەیکەلیەتی بازاڕی کار و بوژاندنەوەی ئابورییەکی سەقامگیر و پاراستنی ژینگە و فەراهەمکردنی تەندروستییەکی باش بەشێوازێکی زانستی و هاوچەرخانە.

- بەدوادا چوون بۆ دەرچووەکانی زانکۆ بەمەبستی دۆزینەوەی هەلی کار و پاڵپشتیکردنی پرۆژە وەبەرهێنەکانیان، هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی توانا و ووزەکانیان و ئامادەکردنیان لەڕووی زانستی و کارگێرییەوە.

- پاڵپشتیکردنی پرۆژە بچوک و گەورەکانی تاک و کۆمەڵگە و بازرگانان لەڕێگەی ڕاوێژ و ئەزموون و کاری هاوبەشەوە.

- دامەزراندن و داهێنانی بەش و پسپۆری و تایبەتمەندی نوێ کە هاوتەریب و گونجاو بێت لەگەڵ زانستی نوێ کە داخوازی وپێداویستییەکانی کۆمەڵگە بەرجەستە بکات.

- دوور خستنەوەی زانکۆ لە ململانێ بێ بنەما و بەشبەشێنە نازانستی و ناجۆرەکان.

-کاری جددی بکرێت بۆ دابینکردنی پسپۆر و شارەزایان لەسەرجەم بوارەکاندا، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵ بدرێت سوود وەربگیرێت لەخاوەن ئەزموونەکان لە پیشەوەران و ئەوانەی تەمەنێکی زۆرە کاری پیشەوەری دەکەن، وەک ئەزموون و کاری چەند ساڵەیان وانەی پراکتیکیان پێ بوترێتەوە.

• دواجار دەڵێین لەسەر زانکۆیە وەک پێگە ئەکادیمییەکەی و لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی و جێبەجێکردنی گەشەپێدانی بەردەوامی و سەرکەوتنی زیاتری پرۆسەی خوێندن و، ئەدای ئەو ئەرکەی ئەمڕۆ لەسەر شانیەتی بەرامبەر بەتاک و کۆمەڵگە و نیشتمان و مێژوو بوونی:

پلان و ستراتیژیەتێکی زانستی و توێژینەوەیی و پیشەیی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی دوورمەدا بۆ کاری پێکەوەیی و دەستەجەمعی پێویستە ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

گەر دەیەوێت هاوتەریب و هاوئاڕاستە و ئاوێتانە لەگەڵ پێشکەوتنە خێراکانی سەردەمدا بگونجێت، ئامادەیی فیعلی هەبێت لەناو چەقی پرۆژە و کارەکاندا، پەرە بەئەزموون و لێهاتویی و کەرەستە و تواناکانی تاک و کۆمەڵ بدات و فاکتەرێکی گرنگ بێت لەبەرەوپێشچونی ژیانی کۆمەڵگەدا و تەنها ناو و ژمارە بوونی کارتۆنی نەبێت، پێویستە:

+ بەدواداچوون و چاوخشاندن بکرێت بە پرۆگرامی خوێندنی زانکۆیی و پەروەردەییدا بەشێوەیەک زیاتر پەیوەندار و گونجاو بێت لەگەڵ داواکاری و پێداویستییەکانی بازاڕی کار و کۆمەڵگەماندا، واتە:

خاوەنی هزری پرۆگرامی و پەروەردەیی خۆمان بین بۆ ئەوەی توانای چارەسەری هەبێت بۆ کێشەی: لاوازی گونجان و لێکچوون و وەکیەکی لەنێوان (قوتابیان ودەرچوانی زانکۆ و لق وبەش و کۆلیژەکانی زانکۆ وکار و چالاکییەکانیدا) لەگەڵ (پێداویستیەکانی بازاڕی کار و پیشە و گەشەپێدانی بەردەوامی نیشتمانی)، توانای کەمکردنەوەی ئەو درز و بۆشاییەی هەبێت لەنێوانیاندایە.

+ هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئاڕاستە و ئامراز و

شێوازی گونجاو و دروست بۆ زیاتر تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی زانکۆ لەگەڵ کۆمەڵگەدا لەڕێگەی وەڵامدانەوە و کارلێک بوون لەگەڵ ژیان و کێشە و پێداویستییەکانی تاک و کۆمەڵگەدا، لەپێناو باشترکردنی جۆر و شێوازی ژیان و ئابووری و تەندروستی و هەڵسوکەوتیان و گرنگیدانی باشتر و تۆکمەتر بە بوارەکانی مەعریفە و بەها و ژینگە و لایەنەکانی دیکەی گەشەی بەردەوامی.

+ پێویستە پراکتیزەکردنی ئەو زانست و زانیاری و فێربونانەی وەردەگیرێت و دەوترێتەوە و بوەتە پرۆگرام لەزانکۆدا ببێتە بەشێک لە: پرۆگرامی (گەشەپێدانی بەردەوامی)، بۆ ئەمەش پێویستمان بە دارشتنەوەی بناغە وستراتیژیەتێکی زانستی و توێژینەوەیی هەمەلایەنەی نێوخۆیی دیار و ڕوونە، کە بەشێک بێت لە سیستەم و تۆڕی جیهانی زانستی کە مەبەستی گەشەپێدانی بەردەوامییە لەجیهاندا.

+ پێویستە گەشەپێدانی بەردەوامی جێبەجێ بکرێت لە زانکۆکاندا و گرنگییەکی تەواوەتی و مەعریفی و فەلسەفی پێبدرێت، بۆ ئەوەی لەبەرامبەردا ئەو کار و کردەوە و هەڵسوکەوتانەی کەد ژە گەشەپێدانن و هۆکارن بۆ دارمانی زانست و پەروەردە و تاک و کۆمەڵگە پەرە نەستێنن، کە ئەمەش بۆ خۆی ستراتیژیەت و سەرکەوتنێکی گرنگ و هەونگاوی گەورەی زانستییە بۆ زانکۆکان.

+ کارکردن لەسەر ئەکتیڤکردن وچالاک کردنی هۆکار و ئامرازەکانی پێشکەوتنی زانکۆ کەخۆی لە مامۆستا وخوێندکار وپرۆگرام و دابینکردنی پێداویستییە هەنوکەیی وسەرەتایی وسەرەکییەکاندا دەبینێتەوە، ئەویش بە پێگەیاندن وتێگەیاندن هۆشیارکردنەوە و ئەزموونپێدانیان لە ڕێگەی کردنەوەی خول و ئاڵوگۆڕی کولتوری و ڕۆشنبیری وشاندکردن و بەستنەوەی زانکۆ بە بازاڕی کار و کۆمپانیا و کارگە و تاقیگەکانەوە.

+ کارکردن لەسەر کەمپەسی زانکۆ (١٣):

– ئەویش بەسەوزکردنی کەمپەس کە ببێتە هاوڕێی ژینگە.

– گرنگیدان بەچۆنیەتی دروستکردنی کەمپەس و شوێنەکەی و کەرەستەکانی دروستکردنی لەشێواز و ستایلدا، کە بە شێوازێک دروست بکرێت مامۆستایان و فەرمانبەران و خوێندکار تیایدا هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکەن.

– فەراهەمکردنی هۆکارەکانی ساردی و گەرمی و پێداویستی و خزمەتگوزارییەکانی دیکە بۆ هۆڵ و مامۆستا و قوتابی و فەرمانبەران.

– کردنەوەی تاقیگەی زانستی و دەنگی مۆدێرن بەکەرەستەکانییەوە.

–بوونی کتێبخانەیەکی مۆدێرن و شوێنی خوێندنەوەیەکی گونجاو و ناوەندێکی ڕۆشنبیری.

– بوونی چەندین هۆڵ بۆ کۆنفرانس و کۆبونەوە گشتییەکان.

+ بوونی ستراتیژیەت وسیاسەتێکی زانستی نیشتمانی دڵسۆزانە لەپێناو(١٤):

–پەرەپێدانی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و توێژینەوە و مامۆستا و خوێندکار لەنێوان زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمییەکان لەگشت بوارەکاندا، بەشێوەیەک کە کارئاسانی بکرێت بۆ کاری هاوبەش لەنێوان زانکۆ و توێژەرەکان و دەزگاکانی وەبەرهێنان و تاقیگە زانستییە نێودەوڵەتییەکاندا.

– نووسینی توێژینەوەی زانستی پراکتیتکی و تیۆری، چونکە توێژینەوەی زانستی دادەنرێت بە: کەرەستە و بنەمایەکی سەرەکی بەرهەمهێنان و پەروەردەیی مەعریفی ڕشتەبەند، هەروەها چالاکییەکی زیندوو ووزە بەخشی ئامانجدارە بۆ گەشە وپرکردنەوەی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە.

– بەدەستهێنانی سەرچاوە و داهاتی دارایی زیاتر بۆ زانکۆ، بۆ زیاتر پاڵپشتیکردنی توێژینەوە زانستییەکان، تاوەکو لەڕێگەیەوە زانکۆ بتوانێت ئەو ڕۆڵە گرنگ و گەورەی کە لەسەر شانیەتی ئەدای بکات لەپێناو پێشکەوتنی زانستی وت ەکنەلۆژی وئابووری..

هتد، بۆ بەدیهێنانی گەشەپێدانی بەردەوامی.

–پارێزگاریکردن لەسەرچاوە مرۆیی و سروشتییەکانی نیشتمان و پتەوکردنی بنەماکانی هێشتنەوە و فراوانکردنیان لەڕێگەی توێژینەوەی زانستی و کار و چالاکی ئەکادیمییەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی زیاتر بدرێت بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە و ووزەی جێگرەوە بۆ گەشەپێدان و دانانی بەرنامەی کاری نوێ و سوودوەرگرتن لە بوارە جێگرەوەکانی بەردەست لەپێناو گەشەپێدانی بەردەوامدا لەڕێگەی توێژینەوەی زانستییەوە(١٥).

+ دارشتنەوە و هەموارکردنەوەی یاسا و ڕێنماییەکانی تایبەت بە پرۆسەی خوێندنی زانکۆیی حکومی و ئەهلییەکان کە بگونجێت لەگەڵ واقیع و سەردەم و پرۆسەی گەشەپێدانی بەردەوامدا، کە ئەمە پێویستی بە هەنگاوی باشتر و زیاتر هەیە، پێویستە لێرەدا ڕەچاوی پەیماننامە و بنەما یاساییەکانی ڕێکخراو و دەزگا نێودەوڵەتییەکان بکرێت، تاوەکوو زانکۆکانمان بگەنە ئاستێکی بەرز و توانای کێبڕکێیان هەبێت لەگەڵ زانکۆکانی دیکەی جیهاندا.

## کۆتایی و دەرئەنجام:

بەر مەبنای ئەوەی باسمان کرد لەسەرەوەدا:

زانکۆ ڕۆڵ و ڕوئیا و پێگەیەکی گرنگ و هەستیاری زانستی و مەعریفی و پەروەردەیی هەیە بۆ ئێستا و دوارۆژی نەوەکانمان، خاوەن سیاسەت و بەرنامە و پلانی زانستی و ڕۆشنبیری خۆیەتی لەپێناو بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤەکان و جێبەجێکردنی هاوسەنگی لە سروشت و ژینگەدا، ئەمەش بۆ زیاتر خزمەتکردنی کۆمەڵگەیە لە چوارچێوەی بنەماکانی گەشەپێدانی بەردەوامدا، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە زانکۆ کە ناوەندێکی ئەکادیمی و مەڵبەندێکی ڕۆشنبیرییە، ئاڕاستە و ڕەهەند و تێڕوانین و میکانیزمی تایبەتی خۆی هەیە بۆ جێبەجێکردنی گەشەپێدانی بەردەوام، بۆیە ئەو ئەرک و وەزیفە سەرەکییەی کە دەبێت ئەنجامی بدات و بەردەوام لەخەمیدا بێت بەتایبەت لەم نیشتمانەدا، بریتییە لەو پاکێج و ئامانجە گرنگانەی خوارەوە تاوەکوو گۆڕانکاریی و گەشە و پەرەپێدانەکان لە ئاستی تاک و کۆمەڵدا بەردەوام بێت، ئەوانیش بریتین لە:

–دامەزراندنی سەنتەری گەشەپێدانی بەردەوام و ئامادەکردن و سوودوەرگرتن و پێگەیاندنی دەستی کار و سەرچاوەی مرۆیی و، دۆزینەوەی ووزە و سەرچاوەی جێگرەوە لەبوارەکانی زانستی ومرۆییدا تاوەکو ببنە ڕەگەزێکی کاریگەر و کردەیی لەجێبەجێکردنی گەشەپێدانی بەردەوامدا.

– بەشداریکردنی چالاکانە لە پرۆسەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئاڵوگۆڕکردنی ڕۆشنبیری و کلتوری و توانا مرۆییەکان، بەمانای وەرگێڕانێکی کردەیی وەزیفەکانی زانکۆ لەکۆمەڵگەدا و گونجان لەگەڵ گۆڕانکارییە خێراکانی زانست وتەکنەلۆژیا.

– هەوڵدان بۆ دانانی ستراتیژیەت و پلانی زانستی تۆکمە بۆ ئاسانکردن و هاوکاری کۆمەڵگە لەپێناو جێبەجێکردنی هاوسەنگی لەنێوان بازاڕی کار و کاری وەبەرهێنان و بازرگانی لەگەڵ ئەو شوێنەوارە ژینگەیی و دەرهاوێشتانەی کە لە ئەنجامیانەوە دروست دەبێت، ئەمەش لەڕێگەی توێژینەوەی زانستییەوە ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی کاریگەری نەرێنی نەبێت لەسەر گەشەی بەردەوام و سەرچاوە مرۆییەکانی ژینگەی کۆمەڵگە.

–هەوڵدان بۆ چاندنی تۆوی خۆشەویستی لێبوردەیی و قبوڵکردنی یەکدی و بەها باڵاکان، و دۆزینەوەی پاکی و جوانیەکانی خودی مرۆڤ و وەرگرتنی جوانییەکانی کولتور و ڕۆشنبیری و تەکنەلۆژیای ئەوانی دیکە، هۆشیارکردنەوەی تاک لە هەڵسوکەوت و نەریتە باوە خراپەکان کە دەبێتە هۆی لەباربردنی زانست و هۆکارەکانی پابەندبون پێوەی.

–هەوڵدان بۆ نەهێشتنی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە دەبنە هۆی لەدەستدان و سڕینەوە و زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی ئەو سەرچاوە مرۆیی و سروشتیانەی

کە پێویستن بۆ خۆشگوزەرانی تاک و کۆمەڵ لە ئێستا و داهاتویاندا، بۆیە پێویستە لەسەر زانکۆ زانست و خوێندن و پرۆگرام و ئاراستەی پڕۆژە و توێژینەوە و کارەکانی بگونجێنێت لەگەڵ گەشەپێدانی مرۆیی بەردەوامدا بۆ هێشتنەوەی ژینگەی زەوی و دەوروبەری بەپاکی و ئاوەدانی و ژیانیش لەسەر ئەم هەسارەیە بەردەوام بێت.

-کاری جددی بکات بۆ فەراهەم کردنی ژینگەیەکی گونجاو و تەندروست و سەرنج ڕاکێش لەناو زانکۆ و دەزگا و سەنتەرە ئەکادیمییەکاندا، لەپێناو ئامادەکردن و پەرەپێدانی مامۆستا و خوێندکار، پێدانی زانیاری و ئەزموون پێیان، تاوەکوو لەو جۆرە کارکردن و خوێندنە نەگونجاوە (کلاسیکیە)ی کە هەیە تێی پەڕێنن بتوانن کار لەسەر پەیوەستی خوێندنەوە بکەن بە بازاڕی کارەوە، ئەمەش پێویستی بەڕوئیا و دیدگایەکی فەلسەفی ڕوون هەیە کە سیستەمی خوێندن بگونجێنێت لەگەڵ ئەو مەبەست و ئامانجە گەورانەی کە زانکۆ و گەشپێدانی بەردەوامی هەڵیان گرتووە و گونجاوە لەگەڵ پێداویستی و ئامرازەکانی سەردەمدا، لەپێناو خزمەتی تاک و کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی بەگشتی.

لێرەوە پێویستە هەموومان، بەتایبەت عەقڵیەتی کارەکتەرە سەرکار و سەرپەرشتیارەکان لە زانکۆ ودەرەوەی زانکۆدا، ئەم پرسیارانە بەردەوام لەخۆمان بکەین، تاوەکوو هەڵسەنگاندن بۆ کار و ستراتیژیەت و پلانی کار و ئەنجامەکانمان بکەین، سەرکەوتووانە بووە یان نا، ئەنجامی گەشبینم هەبووە یان نا، پێویستە لەهەردوو حاڵەتدا ئەوە فێرببین و بزانین کە دیارە وەڵام و شوێنەکەی من وپێگەکەم بۆ ئەو کارە دروستە یان هەڵەیە وتوانیومە یان نەمتوانیوە ستراتیژیەتی گەشەپێدانی بەردەوامی بەرجەستە بکەم وجێبەجێی بکەم کە ئەرکی سەرشانم بووە... هتد، دیارە هەریەک لەو پرسیارانەش پرسیارانێکی سادە و سانان بەڵام لە ناوکرۆک و مەغزا فیکری و فەلسەفییەکەیەوە زۆر گرنگ و قوڵ وبەبەهان و وەڵامی زۆر هەڵدەگرن:

من چی دەکەم؟ چوارچێوەی کاری من چییە؟ تائێستا چ کار و چۆن کارێکم ئەنجام داوە؟

ئەی ئەو کارانە چین ئەنجامم داوە-خودی و دەستە جەمعی-؟ کێ لەگەڵم بووە لەم پرۆسەدا؟

چۆن و چ کارێکیان کردووە؟ ئەو کارە ئەوە بوو من بۆی هاتم؟ سەرکەوتوو بووم یان نا؟ هەنگاو و پلانی کاری داهاتووم چییە؟ بۆ خودی کار هاتووم یان هۆکارگەلێک بوون تا ئەم کارە بگرمە ئەستۆ؟ ئەگەر سەرکەوتوو بووم، ئەو فاکتەر و هۆکارانە چی ببون تاوەکوو زیاتر پەرەی پێ بدەم؟ ئەی ئەگەر شکستم خوارد و سەرکەوتو نەبوم پێویستە چی بکەم؟..... ئەمانە و چەندین پرسیاری کۆنکرێتی هەن بۆ بەرەو پێشچونی خودی و زانکۆ کە پێویستە فەرامۆش نەکرێن.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:


١. السيوبي، طالب بن علي، التنمية وأثرها في المجتمعات الإسلامية لتحقيق التنتمية المستدامة،مجلة الدراسات الإسلامية والفكر للبحوث التخصصية،مجلد٣،ع ٤، ٢١٠٧ :١٠٢.

٢. أبوالنصر،مدحت وآخرون،التنمية المستدامة:م فهومها،أبعادها،مؤشراتها،المجموعة العربية للتدريب والنشر- القاهرة، ط١/٢٠١٧ :٦٧.

٣. سەيرى:جمعة،مصطفى عطية،الإسلام والتنمية المستدامة،شمس للنشر-القاهرة، ط١/ ٢٠١٧م: ١٧٨.

٤. پەيجى فەرمى كۆمەڵەى گشتى نەتەوەيەكگرتووەكان، /https://www.un.org/ar/ga/ president/٦٥/issues/sustdev.shtml

٥. سەيرى: سبقاق، فطيمة، أبعاد التنمية المستدامة في المنظور الإسلامي، موقع الآلوكة، سەردانيكردن ٢٠٢٠/٣/٢١، https://www.alukah.net/ culture/0/126508.

٦. رواه الترمذي في سننه، الترمذى، محمد بن عيسى، الجامع الصحيح سنن الترمذي، ت: أحمد محمد شاكر وآخرون، دار إحياء التراث العربي-بيروت، (٢٦٤٦):٥/٢٨.

٧. سەيرى: السعدي، عبدالرحمن بن ناصر، تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ت: عبد الرحمن بن معلا اللويحق، مؤسسة الرسالة، ط١ /٢٠٠٠م:٣٨٤.

٨. سبقاق:سەرچاوەى پێشوو.

٩. سەيرى:القاسمي، محمد جمال الدين، محاسن التأويل، ت:محمد باسل، دار الكتب العلميه – بيروت، ط١/١٤١٨ هـ:٩ /٤٧٧ .

١٠. سەيرى: مرزوق، فاروق جعفر، البحث التربوي وعلاقته بالتنمية المستدامة دراسة حالة على جامعة القاهرة، بحث منشور في مجلة العلوم التربوية، القاهرة، ع٣/م٣/ ٢١٠٧ :٧٤-٧٦، وأبوجودة، إلياس، التنمية المستدامة وأبعادها الاجتماعية والاقتصادية والبيئية، مجلة الدفاع الوطني، ع٧٨/تشرين الأول/٢٠١١م.

١١. سەيرى: رجب، مصطفى، التعليم من أجل التنمية المستدامة؟، جريدة الشرق، سەردانيكردن ٢٠٢٠/٣/٢١ ، /https://al-sharq.com ، opinion/٢٠١٢/٠٦/١٦/ ، والمشعل،يوسف حامد،التعليم من أجل التنمية المستدامة،جريدة الوطن، سەردانيكردن 21/3/2020. /https://alwatannews.net article/817548/Opinion

١٢. سەيرى: رجب، سەرچاوەى پێشوو.

١٣. سەيرى: مكتب التربية العربي لدول الخليج، تطور التربية في الصين، الرياض،١٩٨٧: ٦٥-٦٦، وەرگيراوە لە: أ.د.عزي، الأخضر، وأ.م.د.إبراهيمي، نادية، دور الجامعة في تحقيق التنمية المستدامة (دراسة لواقع الجامعة الجزائرية)، المؤتمر العربي السادس لضمان جودة التعليم العالي: ٤١٣- ٤١٤.

١٤. سەيرى: معلا، وائل، أهداف التنمية المستدامة لا مكن تحقيقها دون مساهمة التعليم العالي التحديات المعرفية والثقافية تحتاج أجيالا من الأكاديميين الجدد والمهنيين المهرة، جريدة الوطن -سورية، /http://alwatan.sy archives/208066، سەردانيكردن: ٢٨/ ٣ /٢٠٢٠.

١٥. سەيرى: يعقوب، ابتهاج اسماعيل، وعباس، زينة خضر، الجامعة المستدامة خارطة الطريق لتحقيق التنمية المستدامة دراسة تحليلية لآراء عينة من الاساتذة الجامعيين في البيئة العراقية، بحث منشور في مجلة كلية بغداد للعلوم الاقتصادية الجامعة، عدد خاص بالمؤتمر الدولي الثامن ٢٠١٩ : ١٢ .

١٦. عزي، الأخضر وآخرون، سەرچاوەى پێشوو:٤١٤.



دەمەتەقێ گرووپی گوڵنار لەگەڵ

## مامۆستا سادق ڕۆستایی

## ناتوانین بەر لە خوێندنی ئایینی لە مزگەوت و حوجرەکان باسی شتێکی بەرجەستە بکەین.

(١)

**گوڵنار: ڕۆڵی ناوەندەكانی خوێندن لە پێشخستنی كۆمەڵگەدا چییە؟**

سادق ڕوستایی: بێگومان خوێندن و پەروەردەكردن، بریتییە لە ئامادەكردن و بنیاتنانی تاكێكی لێوەشاوە و ئەندامێكی ژیر و كارامە بۆ ئەوەی وەڵامدەرەوەی داخوازی و پێویستییەكانی سەردەم بێت بۆ نواندن و كاركردن پێشڕەوی لە كۆمەڵگەدا، وەك: كەسێكی ژیر و كارا و زانا. بەپێی سەردەم و ڕۆژگار بە درێژایی مێژوو ئەمە ئەرك و بەرپرسیاریەتی بنەڕەتیی ناوەندەكانی خوێندن بووە و لەگەڵ هەموو گۆڕانكاریی و پەرەسەندن و پێشكەوتنە ئابووری، سیاسی، كۆمەڵایەتی، دەروونی و فەرهەنگییەكانیش پێ بە پێ لە ئایندەدا ئەو ڕۆڵ و ئەركەی خۆی درێژە پێدەدات و بەردەوامدەبێت. كەواتە بەپێی ئەو فەلسەفەیەی كە پەروەردە فێركردنی لەسەر بنیاتدەنرێت و تاكی پێ پەروەردەدەكرێت كۆمەڵگە شەقڵدەگرێت و ئایندەی لەسەر بنیاتدەنرێت.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە چاكی دەزانم، بەخێرایی چاوێك بە مێژووی سەرهەڵدان و دامەزراندنی ناوەندەكانی خوێندن لە جیهاندا بخشێنینەوە، بۆ ئەوەی لە ئامانج مەبەستەكانی خویندن تێبگەین. مێژووی دامەزراندنی یەكەمین قوتابخانە بۆ (٥٠٠٠) ساڵ واتا سەردەمی سۆمەریەكان لە میزۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە، لە سەرەتادا زمانی سۆمەری دەخوێندرا، لەدوایدا بابەتی تریشی لێدەخوێندرا ، ئامانجی خوێندنەكەش، ئامادەكردنی فەرمانبەر بوو بۆ بەڕێوەبردنی كاری دیوانی. لە میسریش ڕۆمانەكان (١٧٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا خوێندنگەیان كردووەتەوە و خوێندن تیایدا بە زمانی یۆنانی بوو، چونكە لەو سەردەمەدا ڕۆمانەكان حوكمی میسریان دەكرد و ژووری خوێندنی بۆدانراوە كورسیان بۆ داناوە لە نووسینی سەر دیوارەكانیشی ماوە وەك بەڵگەیەك بۆ میكانیزم وبابەتی خوێندن، ئامانجیشیان هاندانی خەڵك بوو بۆ كاركردن و فێربوونی نووسین و ڕاهێنانیان پێدەكردن و فێری گوتارنووسین و گوتاردانیان دەكردن. یەكەمین قوتابخانەش جگە لە مزگەوت لە سەردەمی ئیسلام (دارلئەرقەم) بوو لە مەكە پێغەمبەر(د.خ) لەوێ لەگەڵ موسڵمانانان دادەنیشت و زانست و ئەركە ئاینیەكانی بۆ ڕاڤەدەكردن و شیدەكردنەوە.

لە سەردەمی عەباسیەكانیش بۆ یەكەمجار خەلیفە موستەنسیر باللە، قوتابخانەی موستەنسیریەی لە ساڵی (١٢٣٣)ز لە پایەتەختی خەلافەت بنیاتنا كە ئەو ڕۆژە بە ناوەندێكی زانستی و ڕۆشنبیری گەورە و كارێكی ناوازە دانراوە.

(٢)

**گوڵنار: مێژوو و پێگەی قوتابخانە و زانایان لە كۆمەڵگەی كوردیدا چی بووە؟**

سادق ڕوستایی: بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت بەوە دەستپێبكەین كەی؟ چۆن؟ كام فەلسەفەی پەروەردە قوتابخانەی پێكراوەتەوە و زانایانی كوردی پێ پەروەردە و گۆشكراون؟ لێرەدا ئێمە ناتوانین بەر لە خوێندنی ئایینی لە مزگەوت و حوجرەكان باسی شتێكی بەرجەستە بكەین و لەبەردەستماندا بێت، هەرچەندە لە هەموو زەمان و سەردەمێك پەروەردە و ڕاهێنان هەر هەبووە، جا چ پەروەردەی ئایینی بووبێت، یان ڕاهێنان بووبێت، بەمەبەستی ڕاوشكار و جەنگ لەبەرامبەر دڕندە و ناحەزان یان هونەری تەلارسازی و دروستكردنی قەڵا و قولە و چەكسازی یان پزیشكی و دەرمانسازی بووبێت، ئاستی پەروەردەكردنەكەش بەپێی توانا و توانستی پەروەردەكاران بوو پێداویستییەكانی كۆمەڵگە بووە. كەواتە دەبێت باسی ڕۆلی حوجرە و خانەقا و ئەو كەڵە پیاوانەی كورد بكەین كە ئەو دوازدە زانستانەیان (فیقە، شەریعە، تەفسیری قورئان، تەفسیری فەرموده،

بیرکاری، مەنتیق، فەلەک و کەلام.......) لە حوجرە و خانەقاکان خوێندووە و زۆربەشیان زانستی ئایینین، بەڵام ئەو حوجرانە و خوێندن تیایاندا تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆی هەبووە و بوونەتە زانستگەیەک بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری لە لایەک و بنیاتنانی کەسایەتی زانا و پێشڕەوی و ژیر و خاوەن پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و ئایینی لە لایەکی ترەوە، جا لەبەرئەوە ڕۆڵەکەی ئەوەندە گەورە و کاریگەربووە کە دەتوانین بڵێین خوێندنی حوجرە و خانەقاکان کۆڵەگەی ڕاگرتنی کۆمەڵی کوردەواری بوو، ڕامان و هزرین و ڕوانین و لێکدانەوەی دەرچووانی حوجرە لە زانا و داناکان بۆتە مۆرک و نەقشێک بە تێکڕایی جومگە و کایە (سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، دەروونی، ژیاری، کارگێڕی و کشتوکاڵی.......) کانی ژیانەوە ماوەتەوە.

(٣)

**گوڵنار: گەڕیدەیی و کۆچی زانایانی پێشوو و شاعیرانی ئێمە بە وڵاتە جیاوازەکان و شار و دێهاتەکانی کوردستاندا بۆ فێربوونی زانست، چ ڕۆڵێکی هەبووە لە دەوڵەمەندکردنی ناوەندەکانی خوێندنی ئێمەدا و لە ڕێگەی ئەوانیشەوە پێشخستن و بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگەی کوردیدا؟**

سادق ڕوستایی: سروشتی خوێندنی حوجرە و خانەقاکان وابوو، خوێندن بەخۆڕایی و بە باروبووی خەڵکی خۆشگوزەران سەخاوەتمەند بوو، خواردنی فەقێیەکان ڕاتبە بوو(جەمەخواردن) کە لە ماڵەکان داوا دەکرا و ئارەزوومەندانە بە فەقێیان دەدرا و کاتی فراڤین وشیڤ فەقێ دەچوو لەو ماڵانەی ڕاتبەیان دەدا، داوای دەکرد و دیگووت (ڕاتبێ فەقێیان ڕەحمەتی خوداتان لێبێت) و خواردنەکەی وەردەگرت. مانەوە و خوێندن و خەوتنیشی هەر لە حوجرە بوو، ئەگەر جارجارە مۆڵەتیکی چەند ڕۆژی وەربگرتایە، یان ڕۆژی هەینیان فەقێ دەچوونە جومعانێ و دەیانگووت ( جومعانێ فەقێیان ڕەحمەتی خوداتان لێبێت) خەڵکیش گیسکێک یان بڕێک پارەی دەدانێ فەقێیەکانیش ئەو برە پارەیان بۆ کتێب و پێداویستیەکانی تری ڕۆژانەی خۆیان خەرجدەکرد، ئیدی ژیانی فەقێ و خوێندنەکەی ئاوا بەڕێوەدەچوو، ئەم سیستەمە لەلایەک سەختبوو، بەڵام لە لایەکی تریشەوە خوێندن ژیانێکی تا بڵێی خۆش و ڕۆمانسی بوو بۆ فەقێیان و جۆرێک لە ئازادیشی بە فەقێ دەدا، بۆئەوەی بەدوای مامۆستای پڕ زانست و بەهرەدار و حوجرەی باش و گونجاو بۆ خۆی بگەڕێت، جا بۆیە فەقێ تاکو خوێندنی تەواودەکرد، چەندین گوند و شار و وڵاتی بە پیادەڕۆیی دەکرد، ئەم گەڕان و دونیا دیتنەش سەرباری ئەوەی ئاستی زانستی و خوێندنی بەرزدەکردنەوە، چاویشی دەکردنەوە و شارازییان لە داب و نەریتی کۆمەڵگە پەیدا دەکرد، هەروەها زمانیان دەپژا و دەوڵەمەند دەبوو بەزار و بنزارەکانی زمانی دایک، سەرباری ئەوەش فێری زمانەکانی (عەرەبی و فارسی و تورکی دەبوون) ئەو تەڤلیبوونەیان لەگەڵ خەڵکی جیاواز و بڕینی هەوراز و نشێوی شاخ و کێوەکان پەڕینەوەیان لە سنوورەکان و چەند ڕۆژ ڕۆیشتن کەسایەتییەکی بەهێزی نیشتیمانی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ئایینی سەرکەشی لێد روستدەکردن و دەئافراندن، لەم ڕێگەیەشەوە دەبوونە خاوەنی سەلیقەیەکی جوانی نووسینی شیعر و ئەدەبیات و شاعیر و ئەدیبی گەورەیان لێ بەرهەم دەهات، بۆ نموونە (نالی و سالم) لە دوو چامەکەیان لە شێوەی ئاڵوگۆڕکردنی دوو نامەی شیعری چ نموونەیەکی بەرزی شیعریان بۆ یەکتر ناردووە کە تا ئێستاش جێگەی گفتوگۆ و دەمەتەقێ و لێکدانەوەی سیاسەتمەدار و ئەدیب و زمانەوانانی کوردە، کە بارودۆخی ئەو ڕۆژە خراپ و شومەی کوردستان و سلێمانیان خستۆتەڕوو، کە بەدەستی لەشکری عوسمانی تێیکەوتوون لە سات و کاتی شەڕ ودوای ڕوخاندنی میرنشینی بابان و داگیرکردنی



حوجرەی کوردی تایبەتمەندی مۆرکی کوردی پێوە دیارە و سەرەڕای ئەرکە ئایینیەکان بنکەی بزووانندنی تاسە و هەستی نیشتیمانی و نەتەوایەتی و شەڕەشیعر و ئەدەبیات نووسینیش بوون.

پایەتەختی میرنشینەکە بێگومان دونیادیتن و تاران و ئەستەنبۆڵ و گەشت و گەڕان بە دوای زانست کات گوزەراندن و کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر وشیاربوونەوە و جولاندنی هەستی نەتەوایەتی و نیشتیمانیان و ئاگاداربوونیان لە پێشکەوتن و پەرەسەندنەکانی جیهان سەفەری حەج سەردانی ئەزهەر و ناوەندەکانی تری خوێندن لە بەغدا کاریگەری ئەرێنی کردۆتە سەر بیرکردنەوە و تێڕوانینیان بۆ ژیان، بە تایبەت ئەستەنبۆڵ کە پایەتەختی سەڵتەنەتی عوسمانی بوو، هەروەها پردی پەیوەندی بەیەکگەیشتنی خۆرهەلات و خۆرئاوایە، بۆ نموونە (حاجی قادری کۆیی) لە ئەستەنبۆڵ، کە مامۆستای منداڵەکانی بنەماڵەی بەدرخانییەکانیش بوو و دەکەوێتە ژێر کاریگەری غەزەل و قەسیدەکانی (مەلای جزیری) و مەم و زینی (ئەحمەدی خانی) و دوور نییە ئاگاداری بارودۆخی ئەوروپاش بووبێت. لەوێوە بە نامە شیعرەکانی ڕەوانی باشووری کوردستان و کۆیە دەکات و کوردی باشوور وشیار و ئاگاداردەکاتەوە و هەستێکی پاکی نەتەوایەتیان بۆ باسدەکات، داوای دروستکردنی بنەما و سەروەرییەکانی پێکهێنانی دەوڵەت دەکات و سنووری کوردستان بە هۆنراوە دەکێشێت. نموونەیەکی تری بەرز و کارا (مەولانا خالیدی نەقشەبەندیە) بەمەبەستی خوێندن و عیرفان و تەریقەتەوە ڕوو لە هیندستان دەکات و تەواو پێدەگات و دێتەوە وەک شێخێکی گەورە و بە تێڕوانینێکی جیاواز لەو دینداری و ئایینناسییەی لەو سەردەمە لە سلێمانی و کوردستان و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست باو بووە دەست بە ئیرشاد دەکات و دەتوانێ گۆڕانکاری گەورە لە بیرکردنەوە و بۆچوونی ئایینی و کۆمەڵایەتی و زمان و فەرهەنگی خەڵک بکات و بە دەیان خەلیفە و مورید و سۆفی دروستبکات و خانهقا دروست بکات و ببێتە جەمسەرێکی (قوتب ) تەریقەتی نەقشەبەندی و لە هەرچوار پارچەی کوردستان و وڵاتانی دەوروبەر خەڵکی کارانگاز بکات بەهزر و بۆچوون و تێڕوانینە نوێیەکانی، هەروەها ئەو زاتانە خزمەتی زۆری زمانی کوردیان کردووە چ بە نووسینی بەرهەمی شیعر و ئەدەبیات بێت، یان گشت بوارەکانی تر ، هەروەها بۆ یەکەمجار مەولانا خالید ڕێگەدەدات و بۆ خۆشی وتاری ڕۆژی هەینی بە کوردی دەخوێنێتەوە، بێگومان ئەمانە و چەندین نموونەی تر کە وەچەرخانیانکردووە لە باشووری کوردستان، بۆ نموونە حوسێن حوزنی موکریانی کە بۆ یەکەمجار لە ئەڵمانیا چاپخانەیەک دەکڕێت و دێنێتە باشووری کوردستان، دەکرێت بڵێین گۆتەنبێرگی کوردانە. چەندین ناوی گەورەی تر لە بابەتی شێخی خاڵ و عەلائەدینی سەجادی و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس کاریگەری لە ڕادەبەدەریان هەبووە لەسەر خوێندنی حوجرە و پێشکەوتنی سیستەمی خوێندن، چونکە وەک پێشتر باسمانکرد، حوجرەی کوردی تایبەتمەندی مۆرکی کوردی پێوە دیارە و سەراری ئەرکە ئایینیەکان بنکەی بزووانندنی تاسە و هەستی نیشتیمانی و نەتەوایەتی و شەڕەشیعر و ئەدەبیات نووسینیش بوون.



زانایانی کورد دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەشەکردن و بەرەو پێشبردنی سیستەمی کلاسیك، دەیان نووسەر و موفەسیر و زمانناس و زمانزانی وەك (مەولانا و ئیبن ئادەم و مەلا کەریمی مودەڕیس و.....)ی تیادا هەڵکەوتووە.

دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بە ناوی هەندێک زانا و پایەداری تریش بکەم، کە بۆ خوێندن یان کاری وەزیفی چوونەتە ئەستەنبوڵ و لە دەوڵەتی عوسمانی پلەو مەقامی وەزیفی وسەربازی و دپلۆماسی و کارگێڕیی گەورەیان بینیوە، وەک: ( توفیق وەهبی، پیرەمێرد، ئەمین زەکی بەگ و موستەفا پاشای یاموڵکی......)، لە دوای ڕوخان و لەبەریەک هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی وەک دەستەبژێرێکی مۆدێرن دەگەڕێنەوە بۆ باشووری کوردستان و هەر یەکەیان لە بوارێک کارو بەخششی گەورە پێشکەشی نەتەوەکەیان دەکەن و زۆر بەگەرمی کارو خەبات دەکەن، لە پێناوی وشیارکردنەوە و دروستکردنی قەوارەیەکی نەتەوەیی ، چونکە ئەو ڕۆژگارە واتا دوایی جەنگی یەکەمی جیهان بۆ زۆریک لە نەتەوە ژێردەستەکانی جیهان سەردەمی بێداربوونەوەی نیشتیمانی و نەتەوەیی بوو، زۆربەشیان گەیشتن بە مافی خۆیان بەداخەوە کورد نەیتوانی سوود لەو بارودۆخە وەربگرێت، هەرچەندە لە ڕووی یاسایی و ڕیکەوتنی نێوان هاوپەیمانانی براوەی جەنگ لە پەیماننامەی سیڤەر تا ڕادەیەکی باش مافەکانی گەلی کوردی تێدا سەلمێنراوە.

(٤)

**گوڵنار: کاریگەری خوێندنی حوجرە و خانەقاکانی ئێمە لە کوندا و لەدوای پێشکەشکردنی سەدان نموونەی گەش و جوانی وەک مەولانا خالیدی نەقشەبەندی ومەحوی و مەولەوی و نالی و سالم و لە ئێستادا بەسەر کۆمەڵگەی کوردیەوە چییە؟ تا چەند ئەو کاریگەرییە ماوە؟**

سادق ڕوستایی: بە حوکمی ئەوەی زۆربەی خەڵکی کوردستان بە ئایین موسڵمانن، هەروەها پەیڕەوی چەند مەزهەب و ڕێبازێکی سوفی و عیرفانیش دەکەن، پابەندن بە ئایین و مەزهەبەکانیان. لە کوردستان تاکو ئێستاش ژمارەی مزگەوت و خانەقا و تەکییەکان. ئەگەر لە ژمارەی قوتابخانە و خوێندنگە و زانکۆکان زیاتر نەبن کەمتر نیین، خەڵکێکی یەکجار زۆر بۆ جێبەجێکردنی سروت و بۆنەکان و دینداری ڕوویان تێدەکەن، گوێڕایەڵ و پابەندبوویەکی چاکیشن بە ڕێنمایی و ئامۆژگاری وتاری زانا و شێخەکان. جا لەبەرئەوە کاریگەری یەکجار زۆریان بەسەر شێوازی ژیان و بیرکردنەوە و دونیابینی کۆمەڵگە و ژینگەی کوردستانییەوە هەیە، ئیسلام ئایینی فەرمییە لە عێراق و هەرێمی کوردستان و زۆربەی یاساکان لە شەریعەتی ئیسلامی وەرگیراون، بۆنە کۆمەڵایەتی و ڕەسمییەکان بەدەر نین لەو کاریگەرییە، مۆرکی خوێندنی ئایینی بە دابونەریت و جلوبەرگ و ڕەفتاری ڕۆژانەی زۆربەی خەڵکەوە دیارە، هەروەها ئەم کەڵە شاعیر و نووسەرانە خزمەتێکی زۆری زمان و ئەدەبی کوردیان کردووە و بەرهەمەکانیان بوونەتە مایەی تۆمارکردنی مێژوو و زمان و فەرهەنگ و میراتی نەتەوەکەمان و لە فەوتان و لەناوچوون پاراستوویانە، پرۆگرامەکانی خوێندنی حوجرە فەقێیەکانی بە حیکەمەت و فەلسەفەیەکی ئینسانیی و نیشتیمانی و عەدالەتخوازی پەروەردەکردووە،

که تاکو ئێستاش پڕۆگرامی خویندنی حوجرەکان و دەرچووانی جێپەنجەیان بە سیستەمی خوێندنی نەک تەنها حوجرەکان، بەڵکو بە خوێندنی مۆدێرنیشەوە ماوە و شەقل و ئادگارەکانی کاڵنەبوونەتەوە، چونکە زۆربەی ئەوانەی لە سەرەتادا وەک مامۆستا دەستبەکاربوون لە قوتابخانانەکان و هەندێک کۆلیژی بواری زمان و مرۆیی دەرچووی حوجرە و بوون کەواتە کاریگەریان دیارە و بەرچاوە.

(٥)

**گوڵنار: خوێندنی حوجرە و خانەقاکانی کوردستان هەڵقوڵاوی کۆمەڵگەی کوردی خۆی بووە، یان درێژکراوەی مەعریفە و تێگەیشتنی گەلانی تری ناوچەکە بە تایبەت گەلانی ئیسلامی بووە؟**

سادق ڕوستایی: لەبەرئەوەی خوێندنی حوجرە و خانەقاکانی کوردستان لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلام دەستپێکردووە و درێژکراوەی ئایینی ئیسلامە، ئایینی ئیسلامیش لە جەرگەی کوردستان هەڵنەقوڵاوە و سەریهەڵنەداوە، بەڵکو بانگەوازەکە لە نیمچە دورگەی عەرەبی و لە شاری مەکە ڕاگەیێنراوە و لەوێوەوە پەلی هاویشتوە و بۆ دەوروبەری خۆی، ئیدی کوردیش وەک زۆربەی گەلانی تری ناوچەکە ( فارس، تورک، ئازەری و ئەفغانی......) بەجۆرێک لە جۆرەکان ئایینی ئیسلامی وەرگرتووە و پەیرەویکردووە و پابەندبووە پێیەوە و ئیسلامیش تەنها بڵاوکردنەوەی دینداری نەبوو، بگرە زۆر بواری تری وەک: ئیدارە و جەنگ و خوێندنیشی گرتۆتەوە. بەواتای گۆڕانێکی ڕیشەیی لە سەرخان و ژێرخانی ئەو کۆمەڵگەیانە هێنایە ئارا، کە ئیسلامیان وەرگرت و باوەڕیان پێهینا و هەروەها تەقلی بزوتنەوە کۆمەڵایەتی زانستیی و ئیداری و سەربازی و دینداریەکەشی بوون و ڕۆلێکی دیار و بەرچاویشیان تیادا گێڕاوە و لە هەندێک قۆناغدا سەرکردایەتی جیهانی ئیسلامیانکردووە، بەڵگەش بۆ ئەمە سەلاحەدینی ئەیوبییە. سەرەتا دروستکردنی

مزگەوت و فێرکردنی نوێژ و ئەرکەکان بووە لەدوایدا پێویستیان بەوە هەبوو کە غەیری عەرەب فێری زمانی عەرەبی بکەن، بەمەبەستی بەڕێوەبردن و بەیەکەوە کارکردن، ئیدی خوێندنی ئیسلامی بەم جۆرە سادەیە لە کوردستانیش دەستپێکردووە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری گەورە بەسەر سیستەم و پڕۆگرامی خوێندنی مزگەوتدا هات و حوجرەو خانەقاکانیش دامەزرێنران و بوونە یارمەتیدەری مزگەوت، خوێندن و پرۆگرامی حوجرە هەر بە زمانی عەرەبی نەمایەوە، بگرە هەندێک کتێب بە فارسی و تورکی دەخوێندران، جا لەبەرئەوەی کورد درەنگتر گەڕایەوە بۆ نووسین بە زمانی دایک و گرنگیدان بە زمانی دایک، بەڵام فارس و تورک زوتر هەستی نەتەوەیی و نوویسینیان بە زمانەکانی خۆیان لەلا گەڵاڵە بوو، بۆ نموونە مەلا و فەقێیەکان گرنگیەکی زۆریان بەئەدەبی فارسی و تورکی و عارەبی داوە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەگەر ئاوڕێک لە شیعری کلاسیکی شاعیرانی کورد بدەینەوە، ئەوا دەبینین لە دەقە شیعریەکان وشەی زمانانەکانی ( فارسی، عەرەبی وتورکی)یان بەکارهێناوە یان شیعرەکان تیهەڵکیشکراوون یان شاعیرەکانمان بەو زمانانەش شیعریان نووسیوە بۆ ئەوەی باڵادەستی خۆیان لە زانینی زمانەکانی تر پیشانبدەن، ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی هەندێک جار ئەو شاعیرانەی بە زمانەکانی تر شیعریان نووسیوە بە کوردیش دانەنرێن، نموونەش بۆ ئەم بابەتە، تورک شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە تورک داناوە لە ئینسکلۆپیدیای شاعیرانی تورکدا، بەڵام دواتر وردەوردە جێپەنجە و مۆرک و تایبەتمەندی کوردی لە حوجرە و خانەقاکان ڕەنگیداوەتەوە، بۆ نموونە خوێندنی حوجرە لە کوردستان بە سیپارە دەستپێدەکات کە فێرکردنی ئەلفبێیە، ئینجا قورئان لە دوای قورئان (ئەحمەدیە) یەکەم کتێبە کە دەخوێندرێت، فەرهەنگێکە شێخ مافی نۆدێ بۆ ئەوەی داناوە، ئەحمەدی کوڕی پێ فێری زمانی

عەرەبی بکات، لەدوایدا کراوەتە کتێبێکی خوێندنی مەنهەجی حوجرە بۆ ئەوەی فەقێی کوردی پێ فێری زمانی عەرەبی بکات، چونکە نەدەکرا خوێندنی کتێبەکان کە بە زمانی عەرەبی بوون دەرخ و ئەزبەر بکرێن بەبێ تێگەیشتن، بەر لە شێخ مارفی نۆدێش، ئەحمەدی خانی لە ساڵی (١٦٨٣)ز نوبهارا بچوکانی داناوە بۆ ئەوەی منداڵی کورد و زیاتریش فەقێی کورد فێری زمانی عەرەبی بکات، کە زمانی زانست و دینیشە، ئەویشیان هەر بۆ هەمان مەبەست دانراوە. ئیدی سیستەم و پرۆگرام و شێواز و ڕێگەی وانەگووتنەوە لە حوجرە و خانەقاکان گۆڕاوە.

(٦)

**گوڵنار: ئەگەر باس لە ئێستای ناوەندە مۆدێرنەکانی خوێندن بکەین و لە چ ئاستێکدایە؟**

سادق ڕوستایی: ناکرێت ئێمە بەبێ ئاگاداربوون لە دەستپێک و مێژووی خوێندنی ئەکادیمی و مۆدێرن لە عیراق و کوردستان باسی ئێستای ناوەندەکانی خوێندن بکەین لە هەرێمی کوردستان، بۆیە وا چاکە بە کورتی تیشکێک بخەینە سەر ئەو مێژووە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی جگە لە حوجرە و خانەقاکان، قوتابخانەی تریش هەبوون لە بەغدا و موسڵ و کەرکوک و هەولێر، ئەم قوتابخانانە زیاتر خوێندکاریان بۆ کاروباری جەنگ و سیاسەت ئامادە دەکرد، وەک ئەکادیمیایەکی سەربازی وابوون. کە دەوڵەتی عوسمانی ڕوخا و ئینگلیز عێراقی داگیرکرد و کەوتە ژێر ئینتیدابی ئینگلیز لە بیستەکانی سەدەی ڕابردودا دەوڵەتی عیراق دامەزرێنرا، ئیدی خوێندنی مۆدێرنیش گەیشتە عێراق و کوردستان. بێگومان دوای شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەرەنسا چەمک و تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بۆ سەرجەم کایەکانی ژیان و پرۆسەی پەروەردە وفێرکردنیش گۆڕا. سیستەمی دەوڵەتی عێراق و پەروەردە وفێرکردنیش لە لایەن ئینگلیزەوە دانرا، بەپێی ڕوانین و فەلسەفەی پەروەردەی خۆیان،

سیستەمی خوێندن لە عێراق تەوزیمی و بێبەرامبەر بوو، دام ودەزگە پەروەردەییەکانی عێراق کەوتنە کار و خەڵکیش ڕوویان لە خوێندنی ئەکادیمی کرد، بارودۆخی پەروەردە و خوێندن لە کوردستان و عێراقیش هەنگاو بە هەنگاو پێشکەوت، تا گەیشتە ئاستێک سیستەمی خوێندن و پەروەردەی عێراق لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەوڵەتان بە باشترین سیستەم دادەنرا، بەڵام لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی نیوان ئێران و عیراق لە ساڵی (١٩٨٠) بارودۆخی پەروەردە و فێرکردن لە سایەی ئەو دۆخە نەرێنییەی نزیکەی چل ساڵی ڕابردوودا بەسەر عیراق و هەرێمی کوردستاندا هاتووە و توشی دەیان قەیران و لێکەوتەی وەک ( زنجیرەیەک شەڕی دەرەکی و ناوەکی، ئابڵوقەی ئابووری، دابڕان لە دۆزینەوە و توێژینەوەی زانستی، ڕێگە نوێیەکانی وانە گووتنەوە، شێوازی خستنە ڕووی پرۆگرامەکان و کێشەی تەلاری خوێندن..... ) بوو و کێرڤی پەروەردە و فێرکردن وەک تێکڕای بوار و کەرتەکانی تری دەوڵەتی و دابەزاندووە لە دۆخێکی خراپدایە، لە سەکۆیەکی کارکردن لە عومانی پایتەختی ئوردن کە ڕێکخراوی یۆنسکۆ سازیدابوو لە ساڵی (٢٠٠٨) بۆ شارەزایانی بواری پەروەردە و پرۆگرامەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان بە ناونیشانی (گەشەدان بە پرۆگرامەکانی خوێندن)، کە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆی عەمان وانەیان پێدەداین، ڕۆژێکیان لە کاتی پشوودا بووە گفتوگۆمان دەربارەی پرۆگرامەکانی خوێندنی ئوردون و عێراق، گوتیان کە ئێمە لە هەشتایەکان هەواڵی ئەو پێشکەوتنەی بواری خوێندن و پەروەردەمان دەبیست و پرۆگرامی خوێندن و کتێبەکانی عێراقمان دەبینی، ئەبڵەق و سەرسورما و دەبووین پێیان، ئێستاکە سیستەمی پەروەردە و فیرکردنی ئوردن و پرۆگرامەکانیان یەکێکە لە سیستەمە زۆرباشەکانی خوێندن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئێمەش زۆر لەدوای ئوردنەوەین.

(٧)

**گوڵنار: با بچینە سەر پرسیارێکی گرنگ و ورد و جەوهەری، ئەویش بەراوردی خوێندنی کلاسیکیی و مۆدێرنە، کامیان کاریگەرتر و گرنگترە بۆ کۆمەڵگە؟**

سادق ڕوستایی: ناکرێت بەدەر لە ڕەچاوکردنی فەلسەفە و ئامانج و شوێنکاتی خوێندن، وەڵامێکی گونجاو و دروستی ئەم پرسیارەتان بدەینەوە، ئێمە دەتوانین بەراوردەکە لە چوارچێوەی عێراق و هەرێمی کوردستان بکەین، بێگومان خوێندنی ئەکادیمی مۆدێرن لە ئەوروپاوە لە دوای ڕێنیسانس و شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەرەنسی و بۆچوون تازەکانی هاتۆتە ئاراوە، لەوێوە ڕێچکەی گرتووە و بۆ ڕۆژهەڵات و عێراق و کوردستان هاتووە و بەرفراوانترە لە خوێندنی کلاسیک (حوجرە و خانەقا)، کە لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلام بەر لە چەندین سەدە لە دورگەی عەرەبی وەک ئایینێکی تازە ڕێچکەی گرتووە و هاتووەتە ناوچەکە، بەڵام هەردوو سیستەمەکەش مۆرک و ئەدگاری کوردیان پێوە دیارە لە پرۆگرام و جێبەجێکردنی سیستەمی خوێندنەکەدا، بە تایبەت خوێندنی کلاسیک، چونکە زانایانی کورد ڕۆڵێکی مەزن و دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەشەکردن و بەرەو پێشبردنی سیستەمی کلاسیک، دەیان نووسەر و موفەسیر و زماننناس و زمانزانی وەک (مەولانا و ئیبن ئادەم و مەلا کەریمی مودەڕیس و.....)ی تیادا هەڵکەوتووە و وەک ئەستێرە لە ئاسمانی زانستە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی دەدرەوشێنەوە، جگە لە پێگەیاندنی دەیان ئەدیب و شاعیری ناوداری وەک (مەلای جزیری و خانی و مەولەوی و نالی و مەحوی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، کە بوونە بەردی بناغە و کۆڵەگەیەکی پتەو بۆ زمان و ئەدەبی کوردی و وروژاندنی هەستێکی پاکی نەتەوایەتی و نیشتیمانی، هەریەکێک لەوانە بوو بە مایەی پێگەیاندنی دەیان سەرکردە و شاعیر و هونەرمەندی وەک (قازی موحەمەد و شێخ مەحمود و مەسعود محەمەد و شوکر موستەفا و هێمن و هەژار موکریانی........ ) لەدوای خۆیان کە ئێستاش نەک هەر لە خوێندنی کلاسیک و حوجرەکان ڕۆڵیان بەردەوامە، بگرە مۆرک و جێ پەنجەشیان بە خوێندنی مۆدێرنەوە دیارە لە خوێندنی بابەتە ئەدەبی و مرۆیەکان. هەرچی خوێندنی مۆدێرنە ڕۆڵێکی یەکجار گەورە و مەزنی گێڕاوە لەسەرتاسەری جیهان بە عێراق و کوردستانیشەوە، بە هەزاران پسپۆر و زانای لە تێکڕای بابەتە زانستیی و مرۆییەکان پێگەیاندووە و ئامادەکردووە و خستوونیەتە خزمەتی مرۆڤایەتی، ئەو هەموو پێشکەوتن و دەستکەوتە مەزنانە بواری پیشەسازی و تەکنۆلۆژی و تەندروستی و خۆشگوزەرانی بەرهەمهێناوە، لە کوردستانیش ئەکادیمی و پسپۆر و زانای زۆری بەرهەمهێناوە و لە بواری (زانستە ئەبستراکتەکان بێت یان زمان و زانستە مرۆڤایەتییەکان، یان بواری ئەدەبیات بێت بە هەموو ژانرەکانەوە)، هەندێک لەوانە خەڵاتی ناوازەشیان وەرگرتووە. کەواتە هەردوو جۆری خوێندنەکە بە پێی واقیعی قۆناغ و هۆیەکانی بەرهەمهێنان ڕاژەیان بە کۆمەڵگە کردووە، لەگەڵ جیاوازی لەڕوی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە. لەبەرئەوە بە هیچ پێوەرێک خوێندنی ئەکادیمی (مۆدێرن) لەگەڵ خوێندنی ئاینی(حوجرە) بەراورد ناکرێن بەڵکو دەکریت بڵێین تەواوکەری یەکترن لە عێراق و کوردستان.

(٨)

**گوڵنار: بۆچی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی پێگە و کاریگەری حوجرە و خانەقاکان و بەرەو پوکانەوە و لاوازی چوو، بەجۆرێک دکتۆر عیزەدین موستەفا ڕەسوڵ بەخۆمی گوت: دروستکردن و دانانی سینەما ڕەشید لە سلێمانی بۆ لێدان و کەمکردنەوەی پێگە و کاریگەری هەردوو خانەقاکەی مەحوی و کاکە ئەحمەدی شێخ بوو؟**

سادق ڕوستایی: كە دەوڵەتی عوسمانی دەڕوخێت، عێراق دەكەوێتە ژێر ئینتیدابی( ماندێت) ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق دادەمەزرێنن و شایەكی بۆ لە حیجازی عەرەبی دێنن و ویلایەتی موسڵیش كە زۆربەی دانیشتووانی كوردن، دەخرێتە سەر ئەو عێراقە نوێیە، وەک دەڵێن بەمەبەستی ڕاگرتنی باڵانسی نیوان شیعە و سونەی عەرەب، بێگومان ئەم دەوڵەتە دەوڵەتێكی سیكولار و و مۆدێرنە و تازە دامەزراوە و ئینگلیز لە سێبەردا بەڕێوەی دەبات، لەسەر بنەمای پلورالیزم و كۆمەڵێک چەمكی ڕۆژئاوایی و بەپێی بەرژەوەندییە شاراوەكانی خۆی مامەڵە لەگەڵ عێراق دەكات، پرسی كردنەوەی سینەما و باڕ و تیاترۆخانە و كۆمەڵێک شتی تر تەنها پەیوەندار نەبوو بە شاری سلێمانی بەڵكو لە شارەكانی بەغدا و موسڵ و بەسرەش ئەم شوێنانە كراونەتەوە.

پرسی كاریگەریشی لەسەر تەكیە و خانەقاكان دوو سەرەیە، ئەگەر مەبەست پەروەردە و خوێندن بێت، یان زیكر و خواپەرستی بێت لەیەكتر جیایە، من وایدەبینم هۆكاری كەمبوونەوەی كاریگەریان لەسەر پەروەردە و خوێندن بۆ كردنەوەی خوێندنگە و زانكۆكان دەگەڕێتەوە. چونكە خوێندن ئاسانتر و بەرهەمدارتر بوو بە خۆڕایش بوو، دەرچووەكانیش بە موچەخۆر و بەرپرس لە داودەزگەكانی دەوڵەت دادەمەزراون، بۆ نموونە لە دوای گۆڕینی سیستەمی بەڕێوەبردنی عێراق لە پادشایی بۆ كۆماری ژمارەیەكی بەرچاو لە مەلاكانی كوردستان ڕاژەكانیان لە مزگەوت دەگوێزنەوە بۆ پەروەردە و بە مامۆستا دادەمەزرێن و ئەو پرۆسەیەش دەستكەوتێكی تری خوێندنی حوجرەیە و كاریگەری ئەرێنیشی هەبوو لە پڕكردنەوەی ئەو كەلێنەی لە كەمی ژمارەی مامۆستایان لە كوردستان هەبوو، پرسی دامەزراندن لە دەوڵەت زۆر گرنگ بوو، خەڵكێكی زۆر كۆلێژی ئەندازیاری و حقوقیان جێهیشتووە و چوونەتە ئەو كۆلێژ و پەیمانگایانەی كە مامۆستای پێدەگەیاند، چونكە لەو كاتەدا دامەزراندن زیاتر بۆ ماموەستا بوو.

(٩)

**گوڵنار: یەكێک لە خۆرە و لەناوبەرەكانی خوێندنی هاوچەرخ بوونی تەكنولۆژیایە بە هەموو جۆرەكانییەوە، تەكنۆلۆژیا چ كاریگەرییەكی لەسەر خوێندن بە جیهێشتووە؟**

سادق ڕوستایی: زانست لە ئەنجامی توێژینەوەی بەردەوام شتی نوێ دەدۆزێتەوە و ئامێر و ئامرازی نوێ دادەهێنێ، ئەگەر هەر سەدەیەک مرۆڤ و زاناكان سەرقاڵی جۆرێک لە داهێنان و مەعریفە وگۆڕانكاری بووبن، ئەوا ئەم سەدەیەش سەدەی تەكنۆلۆژیایە، هەر داهێنانێكی نوێش لە مەیدانی پراكتیكدا پێویستی بە ڕاهێنان و سازاندنە لەگەڵ واقیعی كۆمەڵگەكان لە بەكارهێناندا، ئەو شەپۆلە بەرفراوانە لە داهێنانی زانستی و تەكنۆلۆژی شێوازی بیركردنەوە و ژیانی گەلانی جیهانی بەتەواوی گۆڕیوە تەكنۆلۆژیا بۆ خۆشی وەک چەكێكی دووسەرە وایە، ئەوە پەیوەندی بە ڕێكخسن و بەكارهێنانەوە هەیە، بۆ نموونە دەكرێت لە بواری خوێندن پەروەردەدا بە باشی بخرێتە گەڕ لە وانەگووتنەوە و خوێندنی ئۆنلاین و ئەلەكترۆنی لە زانكۆ و خوێندنگەكاندا، تەكنۆلۆژیا پەیوەندیكردن و بە دەستهێنانی داتای بەجۆرێک ئاسانكردووە، ئەو كارەی جاران بە هەفتە و ڕۆژان نەدەكرا ئێستا بە سەعاتێک دەكرێت. ئەو وڵاتانەی بەچاكی بەكاریانهێناوە توانیویانە سوودی زۆری لیوەربگرن لە تێكڕای بوارەكان، ئەوەی ڕاستی بێت ئەگەر بەباشی بەكار نەهێنرێت لایەنی نەرێنیشی زۆرە و لەوانەیە ببێتە هۆكاری فرە پەروەردەیی و كاریگەری خراپی لێبكەوێتەوە و كاتێكی زۆر و تین و تاوی خوێنكاران لە بواری یارییە بێسوودەكان و ئەپ و بەرنامەی ناڕێک بە هەدەر بدات و پەیوەندییە كۆمەڵایەتی و خێزانییەكان لاوازبكات و تا ئاستی لێكترزان و نامۆبوون و هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵگەی ببات. ئیدی ئەوە شەپۆلێكە بە كەس



لەبەرئەوە بە هیچ پێوەرێك خوێندنی ئەكادیمی (مۆدێرن) لەگەڵ خوێندنی ئاینی (حوجرە) بەراورد ناكرێن بەڵكو دەكریت بڵێین تەواوكەری یەكترن لە عێراق و كوردستان.

ناوەستێ و بەریناگیرێت، بەڵام ئەوە ئەركی دەوڵەت و وەزارەتی پەروەردە و خێزانە بە چ شێوازێكی تەندروست خەڵك ڕادەهێنێت، بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ تەكنۆلۆژیا و خۆپاراستن لە لێكەوتە نەرێنییەكان و بەباشی تەزیفكردنی لە بواری (تەكنۆلۆژیای زانیارییە پەروەردەییەكان)، من وایدەبینم نابێت و ناكرێت و زانستیانە نییە كە بە خۆرە و شتی لەو بابەتانە ناوی بنێین، بەڵكو دەبێت هەوڵبدرێت چۆن زۆرترین سودی لێوەربگیرێت بكرێت بە دەستكەوتێكی زانستی زۆرباش.

(١٠)

**گوڵنار: خوێندنی جاران و ناوەندەكانی خوێندنی جارانمان بە یەك ئاست و ئامانجەوە گرنگیان بە هەردوو بواری پەروەردە و فێربوون دەدا، هەست ناكەی خوێندنی هاوچەرخ تەنها ئامانج و مەبەستی فێركردن و فێربوونە؟**

سادق ڕوستایی: ئێستاش لە هەرێمی كوردستان ئەو وەزارەتەی سەرپەرشتی پرۆسەی پەروەردە و فێربوون دەكات، لە قۆناغی باخچەوە تا ئامادەیی تەواودەكات، ناوی وەزارەتی پەروەردە و فێركردنە. وشەی پەروەردەش ناوەكەی پێش وشەی فێركردن هاتووە، من وەك ئەزموونی خۆم بە خوێندكاری مامۆستای وامان هەبوو كە پەروەردەكارێكی مەزنبوو سەرباری ئەوەی كە پسپۆرێكی لێوەشاوە و شارەزا و زیرەكیش بوو، خوێندكارانیش وەك نموونەی باڵا لە ژیان و هەڵسەكەوتكردن پێی كارانگازبوون، نابێت مامۆستا لایەنی پەروەردە و ئامۆژگاری فەرامۆشبكات و نادیدەی بگرێت، دەبێت لە كەسایەتی خۆیدا بەكردار بەرجەستەی ئەو پرسە بكات، بەبێ لەبەرچاوگرتن و گرنگیدان بە پەروەردەكردن ناتوانێت سەرنجی خوێندكار بۆ خۆی كێشبكات و وایلێبكات گوێ لە ڕوونكردنەوە و ڕاڤەكردنی بابەت وپسپۆریەكەی بگرێت، مامۆستا ڕۆڵی سەركردایەتیكردن لە پۆلی خوێندن لەدەستدەدات، ئەگەر هاتوو شێواز و ڕێگەی وانە گووتنەوەی پەروەردەكارانە و سەنگین و چێژبەخش نەبوو، هەرچەندەی پسپۆرێكی زیرەك و پڕ زانیاریش بێت لە بابەتەكەی، چونكە ناتوانێت بابەتەكە وەك پێویست بگەیێنێت، ئەگەر هاتوو خوێندكار بە مامۆستا كارانگاز نەبوو و خۆشی نەویست، ئەوا كتیب و خوێندنگەشی خۆشناوێت و كاریگەری نەرێنی لەسەر ئایندەی دروستدەكات. وەك باسمانكرد شێوازە فەرمییەكە هەروەك جارانە و مامۆستای پەروەردەكاری چاكیشمان زۆرن، بەڵام كۆمەڵێك هۆكاری خودی و بابەتی لە ئارادان كە هەردوو لایەنی پەروەردە و فێركردنی لاوازكردووە و لایەنی پەروەردەش بە پلەیەكی زیاتر، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی كە باسمانكرد كە بە هۆی زنجیرەیەك جەنگی یەك لە دوای یەك كە ڕویانداوە ئەو دامەزراوانەی وەك زانكۆ و پەیمانگەكان ئەو هێز و پایە زانستییەیان نەما و لە ئامادەكردنی مامۆستا و كادیری پەروەردەیی بەرەو دواوە گەڕانەوە. هەروەها یەكێك لە



هۆكاری پلە یەك و سەرەكی نەبوونی فەلسەفە و دیدگە و پەیامێكی ڕوونی پەروەردەییە بۆ ئامادەكردنی تاك بۆ ئایندە، لەلایەن ئەو دەسەڵاتەی كە حوكمڕانی كوردستان دەكات.

گرفتەکان ژێنگەی خوێندنە و تەلاری خوێندنگە و زانکۆکان لەڕووی ژمارە و فراوانی وەک پێویست نین و زۆربەی خوێندنگەکان دوو دەوامین، هەروەها ژمارەی زۆری خوێندکاران لە پۆلدا تا ڕادەیەک کاریگەری نەرێنی هەیە لەسەر ئەوەی لایەنی پەروەردەیی وەک پێویست لەبەرچاو بگیرێت، هەروەها خاڵێکی تری گرنگ ساڵنامەی خوێندنە کە ساڵانێکە بارودۆخی عێراق و هەرێمی کوردستان ڕێگرە لەوەی وەک خۆی جێبەجێبکرێت، هۆکارەکانی جێبەجێنەکردنیش بۆ شەڕ و لێکەوتە و دەرکەوتەکانی دەگەڕێتەوە، چونکە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن پیویستی بە ئاشتی و بارودۆخێکی جێگیر هەیە، بۆ ئەوەی پێویستییە مژادی (مادی) و واتایی(معنوی) و ڕۆحییەکانی پەروەردە و فێرکردن دەستەبەربکرێن.

(١١)

**گوڵنار: کواڵیتی خوێندن و پێگەی دامەزراوە ئەکادیمییەکانی هەرێمی کوردستان لەسەر ئاستی خوێندنگە و زانستگاکانی جیهان چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

سادق ڕوستایی: بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەتان دەبێت پۆلینی دەوڵەتانی جیهان بکەین بە پێی ئاستی ڕۆشنبیری و ئابووری ئەو وڵاتانە، کە دەتوانین دابەشیان بکەین بۆ سێ جۆر. جۆری یەکەم وڵاتە ئەوروپییەکان، ئەمریکا و کۆریای باشوور و یابان و مالیزیا، ئیسرائیل قەتەر، کە زۆر گرنگی بە پرۆسەی پەروەردە و فێربوون دەدەن و بودجەیەکی زۆر باشی بۆ تەرخاندەکەن و سیستەمی خوێندنیان بەردەوام ئەبدێتدەکەنەوە، لەم وڵاتانەدا دەوڵەت بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ کەرتی تایبەت پرۆسەکە بەڕێوەدەبەن، سیستەم و پرۆگرامی خوێندن تێکەڵەیەکە لە فێرکردن و فێربوون و خوێندکار چەقی پرۆسەی پەروەردەیە و هەریەک لە مامۆستا و کتێب و بڕیاری ناوەندەکانی پەروەردەش لە خزمەت خوێندکار دەبن و مامۆستا ڕۆڵی ئاراستەکار و ڕێنمایکار دەگێڕێ و خوێندن تا قۆناغی بنەڕەتی تەواو دەکرێت تەوزیمی و بێ بەرامبەرە. ساڵنامەی خوێندن وەک خۆی جێبەجیدەکریت و هۆکاری پێشکەوتنەکەشیان بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە و سیستەمی وەرگرتن و خوێندنی زانکۆیشیان جیایە و هەر زوو حەزو و خولیا و تواناکانی خوێندکار دەدۆزرێنەوە و پەرەیان پێدەدرێت، هەروەها تاقیکردنەوەی تایبەت بە پسپۆری هەیە لە کۆلێژەکان و حەز و لێوەشاوەیی و توانا لە وەرگرتن بۆ خوێندنی زانکۆیی لەبەرچاو دەگیرێت، دروشمی سیستەمی خوێندنیشیان لەسەر بنەمای (هەر دەبیت فێر بێ و فێر بکرێ) بەڕێوەدەچێت، هەر بۆیەش قوتابی تاکو قۆناغی بنەڕتی دەبڕێت دەرنەچوو نییە و لایەنی پەروەردەکردن دۆزینەوەی ئاراستەی حەز و ئارەزووەکانی گەشە پێدەدرێت، بەڵام هەردەبێت فێربێت و فێربکرێت، بەڵام لە ئامادەیی و زانکۆ خوێندن چڕوپڕتر دەکرێت و دەرنەچوونیش هەیە، بەڵام جۆرێک لە نەرمونیانی هەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ خوێندکار لە هەردوو لایەنی مادی و مەعنەوی لە فەراهەمکردنی کەشێکی

لەبار و گونجا و بۆ خوێندن و فێربوون. جۆری دووەم هەندێک لە وڵاتە عەرەبی و ڕۆژهەلاتییەکان هەن، بۆ نموونە (ئێران، ئوردن،....) ئەوانەش تا ڕادەیەکی باش گرنگی بە پرۆسەی خوێندن دەدەن و دەستکاری سیستەمی پەروەردە وفێرکردنیان کردووە و بەرەو پێشەوە هەنگاویان ناوە، هەرچی هەرێمی کوردستانە خوێندن لە ڕووی چەندی واتا بە شێوەی ئاسۆیی گەشەیکردووە ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆکان و زیادیانکردووە، بۆ نموونە بەر لە ڕاپەرین، واتا ساڵی (١٩٩٠) لە هەموو ئەو دەڤەرەی ئێستا پێی دەڵێن هەرێمی کوردستان تەنها زانکۆی سەلاحەدین هەبوو، کەچی ئێستا لە کوردستان پازدە زانکۆی حکومی و سێزدە زانکۆی ناحکومی هەن، ژمارەی خوێندکار و مامۆستایانیش چەندبارە زیادیکردووە، بەڵام لە ڕووی چۆنییەتی واتا ستونی وەک پێویست نییە، ئەمەش بۆ بێپلانی حکومەت دەگەڕێتەوە ئەو گەشە ئاسۆیە نارێکە دەرچووانی توشی گەورەترین قەیرانکردووە، چونکە بازاڕی کار و دامەزراندن پێویستی پێیان نییە. هۆکاری داتەپینی ئابووری و تێکدانی دەروونیشە. لە سیستەمی خوێندنی هەرێمی کوردستان لە هەندێک ڕیفۆرمی ڕوکەش بەولاوە شتێک نەکراوە و ئەمەش ناچێتە خانەی پەروەردەی هاوچەرخ و ستاندارد، بەڵکو ناوەندەکانی خوێندن هەر لەسەر سیستەمی کۆن دەڕۆن و خوێندن تیایادا تیۆریە و پراکتیکی نییە و مامۆستا مولەقین و خوێندکاریش دەڕاخە و ئامانجی خوێندنیش بەدەستهێنانی بڕوانامە و دامەزراندنە نەوەک فێربوون و داهێنان، هۆکاری ئەم بارودۆخەش بۆ دەسەڵات دەگەڕێتەوە، کە بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵە بەبێ دەستوور و فەلسەفە و سیاسەتیکی ڕوون حوکمی ئەو وڵاتە دەکەن، لەبەرئەوە بارودۆخی پەروەردە و فیرکردن بەرهەمدار و وەک پێویست نییە.

(١٢)

**گوڵنار: ڕۆڵ و دەستی حیزب لە ناوەندەکانی خوێندن چ کاریگەرییەکی کردۆتە سەر ئاست و کوالێتیی خوێندن و ئاستنزمی بڕوانامەی زانستگاکانمان؟**

سادق ڕوستایی: لە سیستەمی حوکمڕانی دکتاتۆری و شمولی ئەگەر (کۆماری یان پادشایی) بێت ئەوجا حیزب بەڕێوەی ببات یان بێ حیزب بەڕێوەبچێت، ئەوا فشاری زۆر دەخەنە سەر پەروەردە و دەیانەوێت لە ڕێگەی پەروەردەوە دکتاتۆر لەبەرگێکی زۆر جوان و وەک فریشتە نیشاندبرێت، وا لە خوێدنکار بگەیێنن ئەگەر سەرۆک، یان پادشا و حیزب نەبێت، ئەوا ئەو خەڵکە گورگ دەیخوات و ئەو وڵاتە نغرۆ دەبێت، بەو جۆرە دەیانەوێت کۆنترۆلی تێکڕای جومگەکانی ژیان بکەن و پەروەردە بکەن بە مەقاش بۆ دەستەمۆکردن و بە کۆیلەکردنی گەل، بۆ ئەوەی بتوانن ئەوەی مەبەستیانە بیکەن. ئەگەر ئاوڕیک لە مێژوو بدەینەوە و تا بە ئەمڕۆش ڕادەگات، دەیان نموونەمان لەبەردەستە. لە کاتێکدا ئەرکی پەروەردە ئەمە نییە.

ئێمەی کوردیش لە مێژووی نوێماندا کەم وابووە خۆمان حوکمڕانی خۆمان کردبێت، ئەگەر لە هەڵێکدا میرێکی کوردی یان دەسەڵاتێکی کوردی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە جوگرافیایەکی سنووردارى بەرتەسکی پڕ لە هەڕەشە حوکمڕان بووبێت، ئەوا بە جۆریک لە جۆرەکان وابەستە و جێبەجێکاری فەرمان و بڕیارەکانی پایتەختی ئەو وڵاتانە بووە، کە کوردستانی بەسەردا بەشکراوە، بەلکو لە ئەنجامی بێ دەوڵەتی لە لایەن ئەو سیستەمانەی گەلی سەردەست (عەرەب، فارس، تورک.....) کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە حوکمکراوین، دەکرێت بڵێین ئەو پەروەردەیە مرۆڤی کوردی پێ پەروەردەکراوە پەروەردەیەکی کوردانە نەبووە

و له خزمەت دروستکردنی تاکێکی وا نەبووە کە وەڵامدەرەوەی پرسیار و پێویستییەکانی قۆناغەکەدا بن، بەڵکو کەسایەتی تاکی کورد شێواو و شکێنراوە و تاکی کورد لە بیرکردنەوە و هزری خۆیدا دووربین و دونیابینەکەی وەک پێویست نییە، وەک باسمانکرد ئەگەر ئەدگاری حوکمڕانی دکتاتۆری سیستەمی شمولی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەوە مامەڵەیان بێت بۆ دروستکردنی تاک و کۆمەڵگە بۆ ڕەگەز و نەتەوەی خۆیان، دەبێت بۆ ژێردەستە و داگیرکراو چۆن بفکرن و چۆن مامەڵەیەکی لەگەڵ بکەن؟

لەدوای نزیکەی یەک سەدە خەبات و قوربانیدانی زۆر و ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەی لە ئەنجامی کۆمەڵێک جەنگ هاتە پێشەوە، کوردیش لە باشووری کوردستان دەرفەتێکی زێڕینی بۆ ڕەخسا، کە تیایدا جۆرێک لە ئازادی و سەربەخۆیەکی سنووردای بەدەستهێنا و وا بۆ سی ساڵ دەچێت، ئەو هەرێمە بەڕێوە دەبات. قسەیەک هەیە دەڵێت (سیاسەت هونەری بەڕێوەبردنە)، کەواتە لەهەر وڵاتێک و دام ودەزگایەک هەر کەموکوڕی و ناتەواوی و بێسەروبەریەک هەبوو، ئەوا بۆ زانستیی ئیدارەدان دەگەڕێتەوە، لە دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن، پەروەردە و فێرکردن بە پلانێکی زانستی درێژخایەن بەڕێوە ناچێت و هەروەها ئەو بڕیارانەی لە بابەت پەروەردە و فێرکردن دەدرێن، بەرهەمی توێژینەوە و بەدواداچوون نین، ڕاستە هەر چەند ساڵ جارێک وەزارەتی پەروەردە کۆنگرە و کۆنفرانس دەبەستێت و توێژینەوەکان دەخرێنەڕوو و دەبن بە ڕاسپاردە و ڕێنمایش، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە یان لەکاتی بڕیاردان لەبەرچاو ناگیرێن یان بەدواداچوونیان بۆ ناکرێت، لە کاتی جێبەجێکردندا، هۆکاری زۆریش هەن بۆ ئەوەی دۆخەکە بەو جۆرە بێت، بەڵام هۆکاری پلە یەک و سەرەکی نەبوونی فەلسەفە و دیدگە و پەیامێکی ڕوونی پەروەردەییە بۆ ئامادەکردنی تاک بۆ ئایندە، لەلایەن ئەو دەسەڵاتەی کە حوکمڕانی کوردستان دەکات، بێگومان لە نەبوونی دیدگە و فەلسەیەکی دیاریکرا و نەبوونی کەشێکی ئارام و جێگیر بە بڕیاری مەزاجی و ناباەتی و حیزبی، پەروەردە و فیرکردن و ناکەوێتە سەر شاڕێگەی ڕاستەقینەی خۆی بۆ ئامادەکردن و پێگەیاندن و پەروەردەکردنێکی بابەتییانەی تاک و کۆمەڵگە، ڕۆڵی حیزب و مامەڵەی کادیرانی حیزب لە هەریمی کوردستان هەروەک سیستەمە شمولییەکانە بە ڕەچاوکردنی باڵانسی دوو دەسەڵاتی ئەو جووت حیزبی، بۆ نموونە بەشکردنی بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکانی پەروەردە و دانانی ڕاوێژکار و بەڕێوەبەری گشتی و تیکڕای پۆستەکان تا دەگاتە جێگرێکی بەرێوەبەری پەروەردە و بەڕێوەبەرێکی قوتابخانە بە تەزکییە و پاڵپشتی حیزبە و ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی کادیرانی بواری پەروەردە، بەموو لە فەرمانی کادیرانی باڵای حیزب لا نەدەن و لە دام ودەزگاکانی حیزب چیان پێبسپێرن ئەوە جێبەجێدەکەن، ئەوجا لە بارودۆخیکی ئاوادا بەرژەوەندی حیزبی دەخرێتە سەرووی بەرژەوەندی پەروەردە و لە جیاتی کەسی پسپۆڕ و لێوەشاوە و نیشتیمانپەروەر لە ناوەندی بڕیاردانی پەروەردە و فێرکردن بن، ئەوا ڕێژەیەکی زۆر لە کەسی دەستەمۆ و هەلپەرست شوێنیان دەگرنەوە پەروەردەکار و مامۆستایان دەگرنەوە. بەشێوەیەکی گشتیش بارودۆخی پەروەدە لە ئێستادا لە هەرێمی کوردستان باش نییە و لە ئاستی پێداویستییەکانی سەردەم نییە.

١٢

**خاڵ: بارودۆخی ئێستای پەروەردە وفێرکردن چۆن دەبین، بە شێوەیەکی گشتی؟**

سادق ڕوستایی: بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەمەوێ واقیعی و ڕاشکاوانە تیشکێک بخەمە سەر بارودۆخەکە، چونکە ناکرێت لە وەڵامی پرسیارێکدا بتوانین شرۆڤەی بارودۆخی ئێستای پەروەردە

و فێرکردن بکەین. تەلاری خوێندن بەزۆری لە باخچەی ساوایانەوە بگرە، تاکو زانکۆکان ژینگەیەکی باش و لەبار و گونجاو نین بۆ خوێندن لەڕووی ڕووبەر و پێوانە و هەوا گۆڕکێ و پێداویستییەکانی خوێندن، چونکە ژمارەی خوێندنکار زۆر زیاترە لەو پێوانە و ڕوبەرەی خوێندنگە و ناوەندەکانی خوێندن کە خوێندنی تیادەکرێت، تەلارەکان لە ڕووی دیزاینی بیناکردن کۆن و کلاسیکن و مەرجەکانی تەندروستیان تێدا نییە.

بابەتێکی تر پرۆگرامەکانی خوێندنە، کە بڕبڕەی پشتی خوێندنە زۆربەیان کلاسیکن لەڕووی بابەتی زانستی و خستنەڕوو و دیزاین و وێنە و ڕێگەکانی وانە گووتنەوە، ئەگەر نوێشکرابنەوە، ئەوا بەبێ بەلگەنامەکانی خوێندن ( وثیقة المناهج) و بە شێوازێکی هەڕەمەکی کراوە، تەنها کتێبی قوتابییە لە کاتێکدا پرۆگرامی نوێی خوێندن( کتێبی قوتابی، کتێبی چالاکی و ڕاهێنان، ڕێبەری مامۆستا، سی دی، پۆستکارد....) دەگرێتەوە بۆیەپرۆگرامەکانی خوێندن لە هەرێمی کوردستان دەچنە خانەی پرۆگرامی کۆن، ئەوانەی کتێبەکانیان ئامادەکردووە و وەرگێڕاوە داناوە، شێوازی نووسین و داڕشتنی زمانی نووسینیان وەک پێویست نییە و هەڵسەنگاندنی زانستی و دەروونی و پێداچوونەوەی زمانەوانیان بۆ نەکراوە، بێگومان ئەم سێ کردارە لە دانان و ئامادەکردنی پرۆ گرامەکان زۆر گرنگن. چونکە دەبێت بە پێی ستاندارد ئەوانەی ئەم سێ کردارە ئەنجامدەدەن دەبێت لە ئاستێکی زانستی و زمانەوانی باڵاتر و بە تواناتر بن لەو بابەتە، دەمەوێت لێرەدا لەسەر پێداچوونەوەی زمانەوانی بدوێم، ڕاستە ئەوانەی دانەر و ئامادەکاری پرۆگرامەکانی خوێندنن پسپۆڕن لە بابەتەکانی خۆیان و هەر دەبێت واش بێت، بۆ نمونوە پسپۆڕەکانی فیزیا پرۆگرامەکانی فیزیا دادەنێن، بەڵام ئەگەر پێداچوونەوەی زمانەوانیان بۆ نەکرێت و لەڕووی زاراوە و یەکنەخرێن و زمانی نووسینیان یەکگرتوو نەبێت، واتا لە داڕشتنی ڕستە و بڕگە و دەقەکاندا هەمان شێواز و ڕێزمانی ئاخاوتنی قسەکەرێکی ڕەسەنی زمانی دایک لەبەرچاو نەگیرێت و پیادەی ڕێنووسێکی فەرمی و بڕیارلێدراو لەلایەن ناوەندە و ئەکادیمیاکانی زمان نەکرێت، لایەنی خاڵبەندی کە زۆر گرنگە تێدا ڕەچاونەکرێت. ئەوا بابەتەکە وشک و برینگ دەبێت و واتا نابەخشێت و خوێندکار چێژی لێوەرناگرێت و خوێندنی ئامانج ناپێکێت، لەو کاتەدا بابەتەکان ئەزبەر دەکرێن و بەهای زانستی خۆیان لەدەستدەدەن، جا لەبەر ئەوەیە کە ئێستا خوێندکار و مامۆستا و دایبابی خوێندکارانیش ڕەخنە و گلەیی زۆر لە کتێبەکان دەکەن. خاڵێکی تری زۆر هەستیار و گرنگ ئەوەیە کە لەدوای ڕاپەڕین قۆناغ بە قۆناغ پرۆگرامەکانی خوێندن لە ڕووی زمانەوە لەتکران واتا ئێستا لە جیاتی نووسین و خوێندنی پرۆگرامەکان بە زمانێکی فەرمی لەسەرتاسەری هەرێم پیادە بکرێن، ئەوا بەدوو زاری کرمانجی سەروو و ناوەڕاست هەرێم دادەنرێن و دەخوێندرێن، هەر لە باخچەی ساوایانەوە تاکو پۆلی دوازدەی ئامادەیی، بێگومان ئەم کارەش نازانستییە و ئەنجامی نەرێنی زۆر خراپی لیدەکەوێتەوە و زیانێکی مەزن بە زمان و ئاسایسی نەتەوەکەمان دەگەیێنێت، ساڵانەش بە هۆکاری گەندەڵی و ڕۆتینی ئیداری دابەشکردنی کتێبەکان دوا دەکەوێت.

میکانیزمی تاقیکردنەوە دەستکاریکراوە، بەڵام ئەزموونەکانی خوێندن وەک پێویست لەگەڵ پرۆگرامەکانی خوێندن و ژینگەی ناوەندەکانی خوێندن و نەگونجێندراوە، ڕاستە پرسیارەکان کراونەتە هەڵبژاردن بەڵام هێشتا میکانیزمی خوێندن و وەرگرتن لە زانکۆکان وەک خۆی ماوەتەوە.

گرفتێکی تر خوێندنی نا حکومییە، هەر لە باخچەی ساوایان تاکو زانکۆکان، کە ئامانجی لە پێشینەیان کۆکردنەوەی پارەیە و کوالێتی خوێندنیان وەک پێویست نییە و زۆربەیان مەرجەکانی پێدانی

مۆڵەتیان تیادا نییە، بەڵام لە لایەن مۆڵەتدەرانەوە چاوپۆشیان لێکراوە. گرفتێکی تر خوێندنی بابەتە زانستییەکانە بە زمانی ئینگلیزی لە ژمارەیەکی خوێندنگە ئەمش کارێکی نادروست و نازانستییە، چونکە زانستی زمان و دەمارزانی سەلماندوویەتی خوێندن بە زمانی دایک باشتر و بەرهەمدارترە.

سیستەمی پەروەردە و فێرکردن ناوەندیە و ئەمەش گیروگرفتی زۆری بۆ پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن دروستکردووە و بیرۆکراسی لە ئیدارەدان و پەیوەندی لە نێوان ناوەندەکانی خوێندن و سەرووی خۆیان چالاک و کارا نییە، لە کاتێکدا لە ڕووی چەندایەتییەوە خوێندن بەرفراوان بووە و پێویستی بە نا ناوەندی بوون هەیە لە هەندێک پرس و بابەتدا.

پرسێکی تری گرنگ ئەو کۆلێژ و ناوەندانەن کە پسپۆر بۆ پەروەردە و فێرکردن پێدەگەیێنن و ئامادە دەکەن لە ئامادەکردنی پسپۆر و مامۆستایانی بواری پەروەردە و فێرکردنن لە ئاستی پێویستدا نین، ساڵنامەی خوێندن لە ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆ و پەیمانگەکانی کوردستان تیۆریە و لێدانی دەوام و خۆشەویستی بۆ زانست کز بووە و لە هەڵسەگاندندا زۆرێک لە مامۆستایان لە پێدانی نمرەدا جیاوازی لە نێوان خوێندکاران دەکەن، ئەو پرسەش زیاتر خوێندکارە بەهرەمەند و لێوەشاوەکان تێکدەشکێنێت

یەکێک لە گرفتە هەرە مەزنەکان بژێو و ژیانی مامۆستایانە لەدوای ڕاپەڕین، تاکو ئێستاش بەردەوام کێشەی نەدان و دواکەوتنی موچەی هەیە و ئەمەشیان کاریگەری دەروونی نەرێنی زۆری کردۆتە سەر گیانی نەمانی بەرپرسیارەتی لەلای ماموەستا و کەسایەتیەکەی لاواز و لەرزۆک کردووە، هاوزەمان پرۆسەی خوێندنی تێکشکاندووە و ئاستی زانستی دابەزیوە و ئەوەندەی بیر لە بڕوانامە دەکرێتەوە نیوەی ئەوە بیر لە فێربوون و داهێنان ناکرێتەوە.

(١٣)

**گوڵنار: چی بکرێت بۆ ئەوەی سوود لە هەردوو ئەزمونی کلاسیک و هاوچەرخ وەربگیرێ بۆ ئەوەی خوێندنێکی بەرهەمدار و تاکێکی زیرەک و لێوەشاوە پێشکەش بە کۆمەڵگە بکرێت؟**

سادق ڕوستایی: بۆ سود وەرگرتن لە هەردوو جۆری خوێندنی کلاسیک (حوجرە) و خوێندنی مۆدێرن (ئەکادیمی)، پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی زانستیانە هەیە بۆ ئەوەی خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکانی هەردوو جۆری خوێندنکە بخرێنەڕوو و چاوێک بە ئێستای هەردوو جۆری خوێندنەکەدا بگێڕین بە وڵاتانی هاوشێوە و هاوکلتوری لە بابەتی خۆمان و تاکو بزانین ئەوان چۆنیان کردووە و چییان کردووە؟ ئایا بە شێوەیەکی هاوسەنگ گرنگیان بە هەردوو جۆرەکە داوە، یان گرنگیدانیان بە جۆرێک خراوەتە سەرووی ئەوی ترو یان بە تەواوی خوێندنی کلاسیکیان واز لێهێناوە. من وایدەبینم ئێمە لە هەرێمی کوردستان پێوستمان بەوە هەیە پێداچوونەوەیەکی ڕیشەیی بە سیستەمی پەروەدە و فێرکردن بکەین و فەلسەفە و سیاسەت و پلانییێکی دوورمەودا دابڕێژین و سیستەمێکی پەروەردەی هاوچەرخ بنیاتبنێن بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییە نەتەوەیی و ئاینییەکانمان بە مەبەستی ئەوەی ناوەندەکانی خوێندن بکەین بە مەیدانی پەروەردە و فێربوون و فێرکردن ، بۆ ئەوەی تاکێکی ژیر و مرۆڤدۆست و ئاشتیخواز و زانستخواز و دیموکرات و تۆلۆرانس ئامادە بکەین و پێشکەشی کۆمەڵگەی بکەین، کە دەڵین سیستەمی خوێندن واتا هەموو جومگەکانی وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن و وەزارەتی خوێندنی باڵاش دەگرێتەوە و تەواوکەری یەکترن، وا چاکە لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیایانە هەردوو وەزارەتەکە بە ناویکی نوێ و لە فۆرمیکی نوێ یەکبخرێن، ئینجا ئەو کاتە دەتوانین ئەو پرسەش چارەسەربکرێت و ناوەندەکانی خوێندنیش بە هەردوو جۆری کلاسیک و هاوچەرخ تاکو پۆلی



**دەتوانین بڵێین خوێندنی حوجرە و خانەقاکان کۆڵەکەی ڕاگرتنی کۆمەڵی کوردەواری بوو، ڕامان و هزرین و ڕوانین و لێکدانەوەی دەرچووانی حوجرە  لە زانا و داناکان بۆتە مۆرك و نەقشێك بە تێکڕایی جومگە و کایەکانی ژیانەوە ماوەتەوە.**

نۆیەمی بنەڕەتیش تەواودەکەن یەک خوێندن بێت، دەکرێت لە قۆناغی ئامادەیی چۆن بەشی زانستی و وێژەیی و پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ هەیە بە هەمان شێوەش بە شی ئاییناسی هەبیت، واتا پرۆسەی خوێندن لیڤەگەرەکەی ئەو وەزارەتە بێت کە پێشنیازی دروستکردنیمان کردووە بە لێکدانی هەردوو وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن، هەروەها شێوازی ئامادەکردنی زانایانی ئایینی و کارو ئەرکیان دابڕێژرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانن پێشڕەوی ڕوحی کۆمەڵگە بن و لەگەڵ ئەم قۆناغەی ئیستای جیهانی پێدا تێدەپەڕیت بگونجێن و هاوشانی ئەو هەموو گۆڕانکاریە خێرایانەی ڕۆژانە ڕوودەدەن ڕەو بکەن.

(١٤)

**گوڵنار: بۆچی ناوەندە ئەکادیمی و هاوچەرخەکان نەیانتوانی ئەو خزمەتەی کە نالی و مەحوی و مەولەوی بە زمان و فەرهەنگ وشیعر وئەدەبیاتی کوردیان کرد، ئەوانیش هەمان خزمەت و بەرهەم پێشکەشبکەنەوە؟**

سادق ڕۆستایی: لەگەڵ ئەوەی حوجرە و خانەقاکان کەڵە شاعیر و ئەدیب و زمانناسی گەورەیان پێگەیاند و هەر ئەوانیش بنەمایەکی جوانیان بۆ زمان و ئەدەب و فەرهەنگی کوردی دارشت لەو زەمان و زەمینەدا کە ڕۆڵیان ئەوەندە مەزن و کاریگەرە کە تا هەتایە مۆرک و جێپەنجەیان بە بواری ڕۆشنبیری و ئایینی و کۆمەڵایەتی نەتەوەکەمانەوە دەمینێتەوە. ڕۆڵی ئەوان و کاریگەریان وەک نموونە باڵاکانی نەتەوەکانی دیکەیە، بۆ نموونە (چۆسەر و شکسپیری ئینگلیز، فیردەوسی و حافزی شیرازی فارس، یان جاحیز و موتەنەبی عەرەب)، ئایا لە مێژووی ئەم نەتەوانەش ناوەندە هاوچەرخەکانیان نموونەی لەو بابەتانیان بەرهەمهێناوەتەوە، ناکرێت بەدەر لە  شوێنکات و هەل و مەرج و قۆناغی مێژوویی و پێویستی و پێداویستییەکانی ژیان و هۆیەکانی بەرهەمهێنان کەتوار و ئەدگارەکانی سەردەم وەڵامی پرسیارێکی ئاوا ئاڵۆز و تێکچڕژای بدەینەوە، دوای ئەوە خوێندنی هاوچەرخیش بەش بەحاڵی خۆی و ئەو هەلومەرجە سەختەی کە لە وەڵامە پرسیارەکانی پێشوتریش باسمانکرد ڕۆڵی باشیان بینیوە و بە هەزاران  کادیر و پسپۆری جۆراوجۆریان لە تێکڕایی بوارەکان بە گشتی و زمان و ئەدەبی کوردی بە تایبەت پێگەیاندووە و ئامادەکردووە بگرە لە زمانەوان، ڕۆماننوس و شاعیری گەورە و ناوداریشی لەناودایە.

دامەزراوەی

# پەروەردە و فێرکردن

لە رۆمانی کوردیدا







**د.عەبدوڵڵا رەحمان**

لەدایکبووی: هەولێر ١٩٧٤. دکتۆرای لە ئەدەبی کوردی، مامۆستای زانکۆیە لە کۆلێژی پەروەردەی مەخمور - زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر. ئەندامی دامەزرێنەری رێکخراوی زمانناسییە بۆ پەرەپێدانی زمانی کوردی. چەند کتێبێکی چاپ بووە.

دامەزراوەی پەروەردە بریتییە لەو شوێنەی تێیدا چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بەهەموو تەمەنەکانیانەوە کۆدەبنەوە و فێری خوێندن و نووسین دەکرێن و، زانیاری جۆراجۆر بەپێی جۆری دەزگا پەروەردەییەکانەوە وەردەگرن. ئەم دەزگا پەروەردەییانە لە مامۆستا و قوتابی و دەستەی کارگێری پێکدێت. قوتابیان ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو لەو دەزگا پەروەردەییانە دەمێننەوە و شێوەیەک لە پەروەردە و فێرکردن وەردەگرن. بەهۆی ئەمەشەوە گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەکەیان دەکەن و کاریگەری لەسەر گشت لایەنەکانی دادەنێن، چونکە ((پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان فێرکردن و گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەیە )) (د.محمد علی، ٢٠٠٤:٢٢٤)، بەهۆی پرۆسەی پەروەردەییەوە ئاستی ژیاری و شارستانی کۆمەڵگە هەنگاوی گەورە دەهاوێژێت و دەگاتە ترۆپکی پێشکەوتن و پەرەسەندن. لەبەر ئەوەی دەزگا پەروەردەییەکان کار لەسەر هزر و هەڵسوکەوتەکانی قوتابیان بەشێوەیەکی گشتی دەکەن و پێداویستییە زانیاریی و مەعریفییەکانیان دابین دەکەن و مرۆڤێکی رۆشنبیری و هۆشیاری لێ دروست دەکەن، ئەمەش بەشدارییەکی راستەوخۆیە لە گەشەسەندن و بەرەوپێشبردنی ئاست و بوارەکانی کۆمەڵگە. لەم رووەشەوە ئامانج و مەبەستەکانی دەزگا پەروەردەییەکان لەگەڵ بەشێک لە ئامانج و مەبەستەکانی ئەدەب یەکدەگرێتەوە و بەمەش ئەدەب بەشدارییەکی کارا لە پرۆسەی رۆشنبیرکردنی کۆمەڵگە دەکات. لەم ڕوانگەشەوە ژانرەکانی ئەدەب، بەتایبەتیش رۆمان بەهۆی ئەو پانتاییە فراوانەی ڕووداوەکانی دەقەوە، توانای گوزارشتکردنی لە واقیعی پەروەردەیی کۆمەڵگە و دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکان و هەنگاوەکانی پێشکەوتنی هەیە، بۆیە رۆماننوسان لەرێگەی ئەو دامودەزگا پەروەردەییانەوە لەلایەکەوە درێژە بە چنینی رووداوی دەق دەدەن و لەلایەکی دیکەشەوە پەنجە لەسەر خاڵە لاواز و کەموکوڕییەکانی ئەو پرۆسەیە دادەنێن و هەوڵی ئەوە دەدەن روانگە و بیروڕای خۆیان لەو بارەیەوە بخەنەڕوو. لێرەدا باس لەو دەزگا پەروەردەییانە دەکەین کە لەناو سنووری لێکۆڵینەوەکە لە رۆمانی کوردیدا رەنگی داوەتەوەو بەهۆیەوە رۆماننوسان واقیعی پرۆسەی پەروەردەیی لەکوردستانیان خستۆتەڕوو.

قوتابخانە وەکو دەزگایەکی گرنگی پەروەردەیی رۆڵی لەبەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەدا هەیە و شوێنی رۆشنبیری و پێگەیاندنی تاکەکانی کۆمەڵگەیە، بەیەکێک لە خزمەتگوزارییە هەرە گرنگەکان و بە ژێرخانی رۆشنبیری و هزری کۆمەڵگە لە قەڵەم دەدرێت. بوونی قوتابخانە واتای بوونی توێژێکی گرنگی رۆشنبیری کۆمەڵگە دەگەیەنێت کە ئەویش مامۆستایە، ئەو توێژەیە کە جێی پەنجەی لەسەر پێشکەوتن و شارستانی کۆمەڵگەدا هەیە و هەمیشە لەخەمی فێربوون و پێگەیاندنی نەوەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا تێدەکۆشێت. لەبەرامبەر بوونی مامۆستاشدا، توێژێکی دیکەی یەکجار گرنگ هەیە کە ئەویش قوتابیانن، ئەو توێژەن کە بەدوای زانست و زانیاریدان و ئایندەی کۆمەڵگەیان لەسەر شانە. ئەم دوو توێژەی کۆمەڵ راستەوخۆ پەیوەستن بە بوونی دەزگاو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی وەکو قوتابخانە، کە بە ماڵی دووەمی قوتابیان دەناسرێت و بەهۆیەوە چالاکییە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکانی لەناو کۆمەڵگەدا گەشە پێ دەدات. بۆیە بوونی قوتابخانە بە پێوەرێکی گرنکی شارستانیبوون و نیشانەیەکی رۆشنبیری دادەنرێت. رۆمان لەرووی تەکنیکیەوە وەکو شوێنێکی هۆگر و کراوەو گشتی سوودی لە پێگەی قوتابخانە لەناو دەقەکاندا بینیوە، سەرەڕای ئەمەش مێژووی پرۆسەی

پەروەردەیی لەو ماوەیەدا تۆمارکردووەو پێگەکەی چ لە گوند و چ لە شار دیاریکردووە. لە رۆمانی (ژانی گەل)ی (ئیبراهیم ئەحمەد)دا، رۆڵی قوتابخانە لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری و ستەمکاردا ئاماژەی بۆ کراوە، رۆماننوس ئەوەی خستۆتەڕوو کە قوتابخانەو زانست و زانیاری لە ناو کۆمەڵگەیەکی ژێردەستە کە داگیرکرابێت و هەوڵی بە کۆیلەبوونی درابێت، چ پێگەو ڕێگەیەکی هەیە، بەتایبەتیش یەکێک لە سیما هەرە دیارەکانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری نادادپەروەری و بێ یاساییە، لەم جۆرە باوردۆخانەش کەسانی ماستاوچی و تەمبەڵ و گەوجەکان دەبنە جێگەی بایەخ پێدانی کاربەدەستان و جومگەکانی دەوڵەت و کارگێڕییان پێ دەسپێردرێت، لەوەها کۆمەڵگەیەکیشدا خوێندن و قوتابخانە هیچ بەها و نرخێکیان نامێنێت و ئایندەیەکی ناڕوون و ناڕۆشن ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەم حاڵەتە زۆر بە باشی لەگفتوگۆیەکی (لاوە و جوامێردا )ەوە ئاماژەی بۆ کراوە (( چاوێ بگێڕە بەناو هاوڕێکانی قوتابخانەمانا بزانە چەندیان گەیشتوونەتە ئەو پایەی کە مامۆستاکانمان بە پێی تێکۆشان و زیرەکیی خۆیان بۆیان دائەنان؟! کوان یەکەم و دووەم و سێیەمی هەموو ساڵەکانی خوێندنمان؟! ئەوەش تەوەزل و گێل و گەوجەکان کە مایەی گاڵتە و قەشمەریی هەمووان بوون بزانە چ لە مەیدانی کاسبی و کاری ئازاد و چ لە مەیدانی فەرمانبەریدا چ شوێن و پایەکی دیاریان هەیە، کەوا بەخەوی شەوانیش بەبیری خۆشیادا نەهاتووە )) (ژانی گەل :٣٦). لێرەدا پایەی بوونی دەزگایەکی وەکو قوتابخانەمان بۆ بەدیاردەکەوێت و رۆڵی لە گەشەپێدانی گشت بوارەکانی کۆمەڵگەش، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو رۆڵە گرنگەوە دەسەڵاتی دیکتاتۆر بەهیچ شێوەیەک بایەخ بەو دەزگا گرنگەی پەروەردەیی نەداوە و بگرە ئەوانەی بەسەرکەوتوویی پلەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمیشیان هێناوە هیچ دەرەوشانەوە و بایەخ پێدانێکیان نەبووەو کەس نازانێت لە چ گۆشەیەکی دنیا ژیان دەگوزرێنن، لەکاتێکدا دەبوایا ئەوانە جێگەی بایەخ پێدانی حکومەت ببان و بە شاندی خوێندن رەوانەی دەرەوەی وڵات کرابان بۆ ئەوەی پسپۆر و کادیری کارامەیان لێ دروست با و خزمەتی وڵاتەکەیان کردبا، کەچی بەپێچەوانەی ئەم هەنگاوە بایەخ بەو کەسانە دراوە کە لە قوتابخانە سەرکەوتوو نەبوون و شایەنی ئەوەش نین لە دامودەزگاکانی وڵات کار بەڕێوەببەن. ئەمەش رەنگدانەوەی ئەو عەقڵییەتەیە کە وڵات بەڕێوەدەبات و بەهیچ شێوەیەک ئامادە نییە دەزگایەکی گرنگی قوتابخانە کارا بێت و رۆڵی خۆی لە گەشەپێدانی کۆمەڵگە وەربگرێت.

هەروەها تێبینی ئەوەش دەکەین کە خوێندن و خوێندەواری لەناو کایە کۆمەڵایەتییەکەدا رۆڵیان هەبووە، ئەوەتا ماڵی ئامۆزای (جوامێر) بە بیانووی تەواونەکردنی خوێندن رێگرییان لەوە کردووەو (ئاسکۆڵ)یان پێنەداوە، هەر چەندە ئەو دواتر وازی لەخوێندنیش هێناوە بەهۆی کەوتنی ((بیانووی خوێندن تەواوکردنیشی نەماوە! چونکە دوو ساڵ لەسەر یەک دەرنەچوو خۆی قوتابخانەی بەجێ هێشت)) (ژانی گەل :٤١) هەر چەندە لێرەدا وەکو پەڵپ و بیانوو بەکارهاتووە، بەڵام ئەوەش دەسەلمێنێت کە خوێندن و قوتابخانە تاڕادەیەک بوونەتە بەربەست لەسەر ئەوەی کە کچان لە تەمەنی بچووک بەشوو نەدرێن و تا خوێندن تەواو نەکەن ئەو پرۆسەیە دوا بکەوێت. لەم رۆمانەدا بەروونی رۆڵی قوتابخانە و کێشەو گرفتەکانی قوتابی و مامۆستا ئاماژەی بۆ کراوە و لە رێگەی ئەو رۆمانەوە رۆڵ و پێگەی دەزگایەکی گرینگی وەکو قوتابخانە لەناو کۆمەڵگەی کوردی

لەو ماوەیەدا بەدیارخراوەو کە دەزگایەک بووە لە چوارچێوەی بایەخدان و خەمی حکومەتە یەک لەدوایەکەکانی ئەوسای عێراق نەبووە و دەکرێت بڵێین بەئەنقەست پشتگوێ خراوە، چونکە بایەخدان بەوەها دەزگایەک پێگەی رۆشنبیری و وشیاری کۆمەڵگە بەهێز دەکات و تاک بەرەو ئاستێکی بەرزی تێگەیشتن دەبات، کە ئەمەش راستەوخۆ هەرەشە لەسەر کۆی بنیادی سیستەمی ستەمکاری و دیکتاتۆری دەبێتەوە.

رۆمانی (نازە)ی (ئیسماعیل رۆژبەیانی) دەتوانین بە یەکەم رۆمانی کوردی دابنێین کە لای لە کەرتی پەروەردە کردۆتەوەو قوتابخانەی وەکو بنچینە و تەوەری رووداوەکان داناوە. رۆماننوس بۆیەکەم جار سوود لە دەزگایەکی گرنگی پەروەردەیی وەکو قوتابخانە وەردەگرێت و تانوپۆی رووداوەکانی رۆمانەکەی لەسەری بنیاد دەنێت. بەو واتایەی قوتابخانە پێکهێنەری سەرەکی رووداوی دەقەکە لەخۆ دەگرێت، جگە لەمەش ئەم رۆمانە هەمدیسان یەکەم رۆمانی کوردییە کە کارەکتەرە سەرەکییەکەی مامۆستا بێت. بەو واتایەی بایەخ و گرنگی ئەو توێژەی لەناو کۆمەڵگە روون کردۆتەوەو بەچەقی رووداوەکانی داناوە. سەرەڕای ئەمانەش رۆماننوس لەرێگەی فلاش باک گەڕاوەتەوە بۆ مێژووی رابردووی کارەکتەری سەرەکی و رۆشنایی خستۆتە سەر دەورانی قوتابیبوونی و لەوێوە چالاکی و بارودۆخی ئەو توێژەی ناو کۆمەڵگەشی باس کردووە. لەراستیدا رۆمانێکە بارودۆخی پەرورەدەی لە سەردەمی خۆی شەن و کەو کردووەو لایەنە باش و خراپەکانی خستۆتەڕوو. هەر لەسەرەتاشەوە رۆمانەکە بە باسکردنی قوتابخانە و پەیوەندی نێوان مامۆستایەکانی دەست پێ دەکات و ئیدی رووداوەکە باس لە بارودۆخی قوتابخانە لە کۆمەڵگەی گوندنشینەکان دەکات و بۆ یەکەمجار رۆشنایی دەخرێتە سەر ئەو بابەتە. ئەو لایەنە پەروەردەییە لە گەلێک دیمەنی ناو رۆمانەکەدا تێکهەڵکێش کراوە و لەرەوتی رووداوەکاندی بەشداری پێکراوە، ئەوەتا کاتێک (مامۆستا ئازاد) لەدەرەوەی گوند چاوی بە (ناڵە دەم گێڕ) دەکەوێت، سەرەتای گفتوگۆیەکەیان بە باس و خواسی قوتابخانەو پرۆسەی خوێندنی کوڕەکەی دەست پێدەکات ((سەیرم کرد (ناڵە دەم گێڕ) بەرخەلەکەی دەرکردوەو بەرەو بەیارەکەی ئەو سەری دەغڵەکە دەیبات. ماندوونەبوونیم لێ کرد وەڵامی دامەوە:

ـ سەلامت بی مامۆستا، ئەوە بۆ کاملاوە؟

ـ کەمێ بێ تاقەتی خۆم دەر دەکەم.

ـ ئەرێ مامۆستا (سالە)ی کورم چۆنە؟

- وەڵڵاهی هەر خەریکیەتی بەڵام خۆی پیس و پۆخڵە...!)) (نازە :٨)، دەرخستنی رۆڵ و پێگەی مامۆستا لە گوندا مەبەستی رۆماننوس بووەو لەم رووەوە ئەزموونی مامۆستاتایەتی لەگوند وێنای کێشراوە، کە جگە لە ئەرکی فێرکرد و پێگەیاندنی نەوەی نوێ، چالاکییەکی کۆمەڵایەتی و پەروەردەییشی لە ئەستۆیە، بۆیە لەم رۆمانەدا چەقی رووداوەکان لەسەر کارەکتەری سەرەکی (ئازاد) کە مامۆستای گوندە گیرساوەتەوە و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی خراوەتەڕوو، ئەو پەیوەندییە پتەوەی مامۆستاشی لەگەڵ خەڵکی گوندەکە لە گەلێک دیمەن و گرتەی رووداوەکاندا نیشان دراوە، پیشاندانی ئەو جۆرە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانە، پێگەو جێگەی مامۆستای وەکو کەسێکی رۆشنبیر لە کۆمەڵگەی گوندنشینیدا روون دەکاتەوە، هەر لەبەر ئەم پەیوەندییە بەهێزەش بوو کە مامۆستا (ئازاد) بیری لەوە دەکردەوە بەتەمەنەکانیش فێری خوێندن و نووسین بکات، ئەم لاکردنەوەیە لە پرۆسەیەکی گرنگی وەکو نەهێشتنی

نەخوێندەواری بۆ یەکەمجارە لە رۆمانی کوردیدا باسی لێوە بکرێت و لایەنە باشەکانی بخرێتەڕوو، بێگومان ئەمەش بەهۆی شەونخوونی مامۆستای گوندەکەوە بووە و لەپێناو وشیارکردنەوەی کۆمەڵگەکەی بووە. لێرەشدا رۆماننوس هەوڵیداوە ئەو ماندووبوون و هەست بە لێپرسراوییەی مامۆستای کورد تۆمار بکات کە لەمێژووی خۆیدا لە پێناو وشیارکردنەوەو پێگەیاندنی نەوەکان داویانە. لەبەرامبەریشدا روانگەی دەسەڵات و دامودەزگا ئەمنییەکان و تێڕوانین و مامەڵەکردنیان لەگەڵ مامۆستا پیشان دراوە (( هێشتا وانەی یەکەم تەواو نەبوو بوو ئۆتۆمبێلێکی پۆلیس خڕ لە دەرگای قوتابخانەکە راوەستا. قومسێرێک و سێ پۆلیسی تێدا بوو، فۆمسێرەکە دابەزی و چووە قوتابخانەکەوە منیش لە پۆلەکە هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانم چی یان دەوێت. بەخێرهاتنی قومسێرەکەم کرد، بەڵام بەساردیەکەوە وەڵامی دامەوەو ووتی:

- فەرموو لەگەڵماندا سوار بە.
- بۆ کوێ ؟
- بۆ ناحیە
- لەبەرچی؟
- لەوێ پێت دەڵێن
- ئێ نابێ بزانم بۆ دەمگرن!
- لەسەری مەڕۆ... فەرموو سواربە)) (نازە :٣٧)،

ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ کەسایەتییەکی وەکو مامۆستا نەک هەر نەشیاوە، بەڵکو لە شان و شکۆی مامۆستا و پیشەکەشی ناوەشێتەوە، دیارە دەسەڵات باش لە کاریگەری قوتابخانەو مامۆستا و پرۆسەی پەروەردەیی بەشێوەیەکی گشتی تێگەیشتووە، بۆیە ئەو بوارەی فەرامۆش کردووەو هەوڵیداوە لە پێگەو جێگەی مامۆستاش بدات ، سەرەڕای ئەمەش هاتنی بەمشێوەیەی پۆلیس بۆ ناو خودی قوتابخانە وەکو دەزگایەکی پەروەردەیی و دەستگیرکردنی مامۆستا، خۆی لەخۆیدا شکاندنی حورمەتی قوتابخانە و لەپێشچاوخستنی پرۆسەی پەروەردەیە لەبەرچاوی خەڵکی و بچووکردنەوەی رۆڵی قوتابخانەو مامۆستایە لەناو کۆمەڵگەدا. هەر بۆیەش لە زیندانیشدا هیچ جۆرە رێزێک لە پیشەکەی کەمامۆستایە ناگیرێت و بگرە ئەشکەنجەش دەدرێت.

رۆڵ و پێگەی قوتابخانە لەم رۆمانەدا ئەوەندە بەهێزە، وای کردووە رۆماننوس بۆ یەکەم جار پانتایی رۆمانەکەی بۆ پرۆسەی خوێندن لە قوتابخانە تەرخان بکات، بەتایبەتیش لەم بارەیەوە بەشێکی تایبەتی کە بەشی (١٤) بۆ باسکردنی شێوازی خوێندن و رووکاری پرۆسەی خوێندنە لەقوتابخانە، بۆیە دەبینین رۆماننوس زومی رووداوەکانی لەناو گوندەوە دەگوازێتەوە ناو قوتابخانەوە و رێوشوێنی چۆنییەتی خوێندنی ئەو سەردەمەمان بۆ دەکێشێت ((مناڵەکان لەدەرگای قوتابخانەکە وەکو بێچووە پەرسێلکە ملە قوتێیان بوو، کە چاویان پێ کەوتم هاواریان لێ هەستا: - ئەرێ وەڵڵا مامۆستا هات.

هەموو رایان کردە حەوشەکەوە و لەخۆشیاندا نەیاندەزانی چی بکەن، پێ یانم ووت: - یاڵڵا کوڕم ریز بن بزانم؟

سەیرێکی پاک و تەمیزیانم کرد، بینیم لەماوەی ئەو چەند رۆژە گەلێک گۆڕاون. لەپێشیان وەستام و پێ یانم ووت: - گوێ بگرن ئەمڕۆ چووتانەوە خۆتان باش خاوێن بکەنەوە و جلەکانیشتان بگۆڕن، سبەی کێ لەهەمووان خاوێنتر بێت خەڵاتێکی باشی دەدەمێ. هەموو پێکەوە ووتیان: - باشە.

- ئێستا کێ دەتوانێت سرودێکمان بۆ بخوێنێتەوە؟.

- زۆربەیان دەستیان بەرزکردەوە )) (نازە: ٥٣).



بۆ یەکەمجار لە رۆمانی کوردیدا رەخنە لە پرۆسەی پەرورەدەیی گیراوە، بەو واتایەی رۆماننوس رۆمانی بە ژانرێکی گونجاو زانیوە تا لە رێگەیەوە لایەنە خراپەکانی ئەو پرۆسەیە بخاتەڕوو.

ئەم دیمەنانەی باسکردنی ناو قوتابخانە گوزارشت لەو دەکەن کە پرۆسەی پەروەردەیی تەنیا فێرکردنی خوێندن و نووسین نییە، بەڵکو بایەخدان بە رەوشت و پاک و خاوێنی و چالاکییە هونەری و وەرزشییەکان، لەمەشدا رۆڵی مامۆستا گەلێک مەزنە و وەکو دایک و باوک وایە، لێرەدا جگە لەوەی کە باسی لەوردەکارییەکانی پرۆسەی خوێندنی ناو قوتابخانەی کردووە، لەهەمان کاتیشدا رۆشنایی لەسەر توێژێکی فراوانی ناو کۆمەڵیش کردووە کە قوتابیانن و چالاکییەکانی ئەوانی خستۆتەڕوو، جگە لەمەش تیشکی خستۆتە سەر وشیاربوونی ئەو چینە گرنگە و جەختی لەسەر ئەو چالاکییە سیاسییانە کردۆتەوە کە قوتابیان شان بەشانی چینەکانی دیکەی کۆمەڵگە کردوویانە. لەگەڵ ئەوەشدا رۆماننوس ئەو پرۆسەی پەروەردەییە خستۆتە بەر نووکی رەخنەوە و تەنیا بەوە رانەوەستاوە لایەن باشەکانی پرۆسەکە پیشان بدات، بۆیە بۆ یەکەمجار لە رۆمانی کوردیدا رەخنە لە پرۆسەی پەرورەدەیی گیراوە، بەو واتایەی رۆماننوس رۆمانی بە ژانرێکی گونجاو زانیوە تا لە رێگەیەوە لایەنە خراپەکانی ئەو پرۆسەیە بخاتەڕوو و سەرەتاش رەخنە لە هەڵسوکەوتی هەندێک مامۆستا دەگرێت کە بەتوندی رەفتار لەگەڵ قوتابیان دەکەن ((کاتێ مامۆستا دەهاتە ژوورەوە دەبوایە هەموومان ببوونایەتە بەردی تاشراو.. دەستە بچکۆڵە چڵکنەکانمان دەخستە بن هەنگڵمان و جمەمان نەدەکرد. پێش ئەوەی ووشەیەکی لەدەم بێتە دەرێ یەک دوو جار بە باڵای پۆلەکەدا دەهات و دەچوو)) (نازە: ٩٨) ئەمە رەخنەیە ئەوە دەردەخات کە پێویستە مامۆستا لەو کاتەی کە سەردانی پۆل دەکات بەو شێوازەی رەفتار نەکات و خۆی لێ بەدوور بگرێت، بەڵکو بە سڵاو وگفتوگۆکردن لەگەڵ قوتابییەکاندا هەڵسوکەوت بکات و بۆ ئەوەی لەرووی دەروونییەوە ئامادەبن بۆ وەرگرتنی وانەکە. هەروەها رۆماننوس رەخنەی ئەوەش دەگرێت کە هەندێک مامۆستا وشەی جنێو بەکاردەهێنن و پەنا بۆ شێوازێکی یەکجار خراپی دوور لە پەروەردەیی دەبەن کە ئەویش لێدانی قوتابییانە. دیارە ئەو جۆرە مامەڵەکردنە و بەکارهێنانی جوێن بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ پرۆسەی پەروەردەکردن و پێگەیاندن و بگرە لە خورەوشتی مامۆستاش ناوەشێتەوە و ناگونجێت، لێرەدا بەراوردێک لەنێوان جوتیار و ئەو جۆرە مامۆستایانە کراوە، کە جوتیار زۆر بەنەرمونیانی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئاژەڵ دەکات، کەچی ئەو جۆرە مامۆستایانە وەکو ئەو ئاژەڵانەش مامەڵەیان لەگەڵ دا ناکەن، جگە لەمانەش رەخنە لەو مامۆستایانە دەگرێت کە بە کوردیش قسە ناکەن، ئەوەتا (ئازاد) لەگێڕانەوەی یادەوەرییەکانی قوتابیبوونیدا ئاماژەی پێ دەکات ((لەهەموو خەفەتتر بۆ ئێمە ئەوە بوو سەریانت ببڕیایە ووشەیەکی کوردییان لەدەم نەدەهاتە دەرەوە، هەر تورکی و خۆ ئەوە



لەرۆمانی (هەڵکشان بەرەو لوتکە)ی (عەبدوڵڵا سەڕاج) دا لەرێگەی دوو کارەکتەرەوە ئاماژە بە رەوشی خوێندن و پیشەی مامۆستایەتی کردووە و بەهۆیەشەوە رەهەند و لایەنەکانی ژیانی ئەوانیان روونکردۆتەوە.

نەبوو بڵێ ی کوردییان نەدەزانی. جارێکیان پۆلی دووەم بووم مامۆستای عەرەبی واتای وشەیەکی لێ پرسیم منیش بەتورکی نەمدەزانی چی پێ دەڵێن. هات بەلامەوە و شریقەی لە رووومەتم هەستان و نەڕاندی بەسەرما: (ئەشەک ئۆغلۆ ئەشەک) واتە کەری کەر باب. ئێستاکە خۆم کاتێ لە قوتابییێک تورە دەبم یا دێم لێ ی بدەم یەکسەر ئەو کاتەم دێتەوە یاد و پەشیمان دەبمەوە، چونکە دەزانم منداڵ لە منالیدا هەستی وەکو خۆی ناسکە، کە بریندارت کرا ئیتر تویژگرتنی زەحمەتە)) (نازە: ٩٨). لێرەشدا رۆماننوس دەستی لەسەر مەسەلەیەکی زۆر هەستیار داناوە، لەلایەکەوە دەمارگیری نەتەوەیی کە بەشێک لەو مامۆستایانە کوردیشیان زانیوە، بەڵام هەر بەتورکی دواون، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو جنێودان و لێدانە لە قوتابی منداڵ، بێگومان کاریگەرییەکی بەشێوەیەکە کە (ئازاد) گەورەش بووە وەکو برینێک هەر لەناخیدا گینگڵ دەدات و ئەو ساتەی ئەویش وەکو مامۆستایەک کە تووڕە دەبێت ئەو دیمەنەی دێتەوە یاد و پەشیمان دەبێتەوە. رۆماننوس لەدیمەنێکی دیکەدا ئاماژە بەو جۆرە رەفتار رەق و وشک و توندرەوییانەی مامۆستا دەکات و رەخنەیان ئاراستە دەکات، ئەوەتا (ئازاد) باس لەوە دەکات کە کاتێک لەلای (مەلا برایم)ی گوندەکەیانەوە دەفتەر رەسم نەبووە، بەهزری منداڵانەی خۆی چەند کاغەزێکی سپی بێ خەتی لێکداوە و کردوویەتییە دەفتەر رەسم، کەچی هەڵوێستی مامۆستاکەی زۆر توندو نابەجێ بووە (( مامۆستاکە پێ ی وتین: هەریەکە دەفتەرەکەی دەر بکات بزانم.

دارێکی گرتبوە دەستەوە ئەوی پێ ی نەبوایە دەستی لە تلۆق دەر دەکرد، کاتێ هات و سەیری ئەوەی منی کرد تاکو هێزی تیابوو زللەیەکی کێشا بە رووومەتە بچوکۆلانەکەما و بەتورکمانی هاواری کرد: (سەگی سەگ باب ئەمەش بوە دەفتەر رەسم جارێکی کە بێیتەوە پێت نەبێت هەڵتدەواسم)) (نازە :١٠٢). رۆماننوس هەر لە رێگەی گێڕانەوەکانی قوتابییەتی (ئازاد) رەخنەیەکی توند لەو جۆرە مامۆستایانە دەگرێت کە بەشێوەیەکی نەگونجاو مامەڵە لەگەڵ قوتابیان دەکەن، بێگومان ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەن زۆر دوورن لە پێگەو شوێن و خورەوەشتی مامۆستا و ئەو ئەنجامەی کە لێی کەوتۆتەوەش کاریگەرییەکەی لەسەر دەروونی (ئازاد) بەشێوەیەکە تا گەورەبوونیشی ئامادەیی تێدایە بەرووی دا بداتەوە. ئەم جۆرە رەخنانە لە پرۆسەی پەروەردە و خودی مامۆستا لە ناو رەوتی رووداوەکاندا جێگەیان بۆ کراوەتەوە و لەلایەن رۆماننوسەوە بایەخی پێدراوە.

هەر لەو رۆمانەشدا قوتابخانەی ناوشاریش ئاماژەی بۆ کراوە، لەو ئاماژەکردنەدا زیاتر رووخسار و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی شارنشینی بەراوردکراوە لەگەڵ کۆمەڵگەی گوندنیشنی، ئەمەش لەو کاتەیە کە خانەوادەی (ئازاد)

لەگوندەوە بۆ شار کۆچ دەکەن و دوای ئەوەش کە دوو ساڵ وازی لە خوێندن هێناوە، بۆ قوتابخانە دەگەڕێتەوە، بۆیە لەچاو قوتابییەکانی دیکە تەمەنی گەورەترە ((وەکو چوومە ژوورەوە قوتابیەکان دایان لە پێکەنین هەر چۆنێک بوو مامۆستاکە کپی کردن. کاتێ زەنگ لێدرا هەموو کەوتبوونە شوێنم دەتووت مەیموونیان دەست کەوتبوو:

ـ هەی هەی بەکراسەوە هاتووە...!

ـ کورە کڵاشیشی لە پێ یە...!

خەریک بوو دیق.. بکەم، لەبەر ئەوە نەبوایە تازە چوو بووم خۆم لەگەڵیاندا دەگۆڕیەوە. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بانگی کردم: کوڕم بەیانی بە پانترۆنەوە دێی)) (نازە:١٢٧) ئەم جۆرە تێڕوانینە دەربری ئەو کلتورە جیاوازەیە کە لەنێوان گوند و شاردا هەبووە.

هەروەها رۆماننوس بیروڕای ئەو خەڵکانەی باس کردووە کە دژی قوتابخانە و پرۆسەی پەروەردە بوون، بێگومان ئەوانەش کاریگەرییەکی خراپیان لەمێژووی پەروەردەیی لە ناو کۆمەڵگەدا هەبووە. ئەم جۆرە تیڕوانینانە لەدوولایەنەوە بووە کە بەرژوەندییەکانیان لەگەڵ ئەوە وشیاربوون و خوێندەواربوونەوەی خەڵکەکە رێک نەدەهاتەوە، ئەوانیش ئاغا و دەرەبەگ و بەشێک لە پیاوانی ئایینی کە دەسەڵاتیشیان لەپشت بوو. باشترین رێگاش بۆ قەناعەت پێهێنانی خەڵکی لەوەی کە منداڵەکانیان نەنێرنە قوتابخانە، چەکی ئایین بوو، بۆیە دەیان بیرۆکەی وەکو (عیلمی شەیتان و...تاد) بڵاو دەکردەوە و هەست و سۆزی ئایینی خەڵکیان لەمبارەیەوە دەقۆستەوە و بۆ مەرامەکانیان بەکاریان دەهێنا، لەم رۆمانەشدا ئاماژە بەم دیاردەیە کراوە، لەدیمەنێکدا ئاماژە بەمەلای ئەو گوندەی کە ماڵباتی (ئازاد)ی لێبووە کراوە و لەسەر زاری باوکی (ئازاد)ەوە ئەو بیروڕایانەی لەدژی قوتابخانە دەربڕیوە (( زۆر جار گوێم لێ بوو باوکم و ئەوانەی خۆیان بە لەخوا ترس دەزانێ دەیانووت: (مامۆستا مەلا عەلی) ئەڵێ:

ـ مناڵ مەخەنە مەکتەب چونکە فێری عیلمی شەیتانی ئەبێ)) (نازە: ٨٦). ئەم جۆرە بیروڕایانە کە پێچەوانەی رێنماییە ئایینییەکانە لەو سەردەمەدا کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر بیر و هزری تاکی کورد هەبووەو وای کردووە پرۆسەی پەروەردە رووبەڕووی تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر ببێتەوە، بەتایبەتیش کە کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی ئایینیدار بووەو وتەی پیاوانی ئایینی لەم رووەوە زۆر کاریگەر بووە، بەتایبەتیش لە گوندەکاندا. ئەم کاریگەرییە لەناو خەڵکیدا زیار لەو دیمەنە بەدیار کەوتووە کە ئەویش کاتێک کە (عەلی) کە هاورێی (ئازاد)ە لە یەکێک لە قوتابخانەکانی شار دەخوێنت، ئەو ساتەی هەواڵی زیندانیکردنی لەناو گونددا بڵاو دەبێتەوە، خەڵکی گوندی بەتایبەتیش ئەو پیرەمێردانەی لەمزگەوتدا کۆبوونەتەوە بەمشێوەیە باسی لێ دەکەن (( ئەمەتی ئەم کوڕە لەشار ئەخوێنێ فێری ئەم بەزم و رەزمە بووە. کابرای ریش سپی ووتی: ئێوە ئەڵێن چی بەقورعان ئەوەی دوای ئەم عیلمە شەیتانی یە بکەوێت خراپی بەسەر دێت)) (نازە: ٩٤). ئەو جۆرە گفتوگۆیە رادەی کاریگەربوونی ئەو بیروڕایە مەترسیدارە لەناو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بەدیار دەخات و ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەو جۆرە تێڕوانینانە لەمپەرێکی گەورەی ئەو سەردەمە بوونە لەبەردەم پرۆسەی پەروەردەییدا.

سەرەرای ئەمانەش رۆماننوس کێشەو گرفتەکانی بەردەم پرۆسەی پەروەردەیی باس دەکات و پەنچە لەسەر هۆکارەکانی سەرهەڵدانیان دادەنێت، یەکێک لەو کێشانەش وازهێنان یاخود دەرهێنانی منداڵە لە قوتابخانە، کە ئەمەش یەکێکە

لەو کێشەو گرفتە گەورانەی کە لەکۆمەڵگەی دواکەوتووی نەریتگەرادا کە تێیدا پرۆسەی پەروەردەیی بایەخی پێنادرێت و لە سنوورێکی دیاریکراودا قەتیس کراوە، بەگرفتێکی گەورەی بەردەم خوێندەواری و وشیاربوونەوەی خەڵکی دادەنرێت. لەم رووەوە رۆماننوس ئاماژە بە دوو هۆکار بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو کێشەو دیاردەیە دەکات:

١- کێشەی هەژاری و بێکاری و نەبوونی: کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خانەوادەکان کردووەو نەبوونی ماددی وای کردووە نەتوانن منداڵەکانیان رەوانەی قوتابخانە بکەن و بیانخەنە بەر خوێندن، دیارە لەمەشدا پێویستیان بەو منداڵانە بووە بۆ ئەوەی کار بکەن و کەمێک پارە پەیدا بکەن و باری گوزەرانیان پێ خۆش بکەن.

٢- هۆکاری چالاکی سیاسی: ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر تەواونەکردن و دابڕان لەخوێندن هەبووە، بەتایبەتیش زیندان وای کردووە بەشێک لەو قوتابییانە نەتوانن درێژە بەخوێندن بدەن، رۆماننوس ئاماژەی بە حاڵەتی کارەکتەری (عەلی) داوە کە بەهۆی چالاکی سیاسییەوە و زیندانی کردنەوە، ئیتر نەیتوانیوە لەخوێندن بەردەوام بێت.

لەرۆمانی (شار)ی (حوسێن عارف)دا قوتابخانە وەکو دەزگایەک بەشداری لەرووداوەکانن کردووەو خوێندەواریش وەکو پرۆسەیەک رۆشنایی خراوەتە سەر و بەهۆیەوە رۆماننوس توانیویەتی رەهەندی کارەکتەرەکان و پەرەسەندنی رووداوەکان روون بکاتەوە و شوێن و کاتیش بەهۆیەوە گۆڕانکاری بەسەردا بێنێت. لەم رووەوە بەهۆی پلەی خوێندنەوە رەهەندی کەسایەتی (خورشید)ی کارەکتەر روون دەکاتەوە ((خورشید ئەگەر چی تەنیا تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندبوو، بەڵام بەهۆی ئەمەوە کە بەردەوام هانی دەدا بۆ خوێندنەوە و بەردەوام کتێبیشی بۆ پەیدا دەکرد، لەرووی رۆشنبیرییەوە بەهەنگاوی خێرا پێش دەکەوت و ئاسۆی بیری فراوا دەبوو)) (شار: ١٦٢). لێرەشدا ئاماژە بەلایەنی رۆشنبیری و پەروەردەیی کارەکتەر کراوەو رۆڵی (ئەورەحمان) لە یارمەتیدانی بۆ گەیشتن بەو پلە رۆشنبیرییە لەدابینکردنی کتێب و هاندانی بەردەوامی، بەرچاو خراوە. هەروەها کاتێک باس لە (کەمال)ی کارەکتەر دەکات و بەهۆی خوێندنەوە رەهەندی کەسایەتی و بارودۆخی ژیانی خۆی و خێزانەکەی دەخاتەڕوو، ئەمەش لەزاری (فەرهاد)ەوە دەخرێتەڕوو ((دوورە سەرنجێکی دایە دووکانەکەی مام مەولوو، کەمالی بینی خەریکی سەودا و مامەڵەکردن بوو، هەناسەیەکی خەفەتبارییی بۆ هەڵکێشا لە پۆلی یەکەم و دووەممی ناوەندیدا پێکەوەبوون. لەپۆلی سێیەمدا بەدیار نەکەوت، کە لێیان پرسییەوە، بۆیان دەرکەوت باوکی ئیفلیج بووە و ئەو بۆ هەڵسووڕاندنی دووکانەکەی جێگەی گرتۆتەوە ،......دەیزانی چ ئەرکێکی سەخت و ستەمی بەسەر شانەوەیە. رەشە خێزانێکی باوکی و ژنێک و دوو منداڵی خۆشی)) (شار: ٢٥٦). لێرەشدا هۆکاری وازهێنای (کەمال) روونکراوەتەوە، هۆکارێکی راستەوخۆ ئەوەیە کە باوکی نەخۆش کەوتووەو بەهۆیەوە ئیفلیج بووە وتوانای کارکردنی نەماوە، هۆکاری ناڕاستەوخۆش هەژاریی و بەڕێوەبردنی ماڵ و گوزەرانی خێزانەکەیە، بەهۆیەوە کارکتەر نەیتوانیوە بەردەوامی بەخوێندن بدات. جیا لەمانەش رۆماننوس سوودی لە قوتابخانە و پرۆسەی پەروەردەیی بینیوەو رەهەندی کەسایەتییە مامۆستایەکانی کە کارەکتەرن لە رۆمانەکەدا روون کردۆتەوەو لەهەمانکاتیشدا هەڵوێستی پێشکەوتووانەی ئەوانیشی پیشان

داوە، یەکێک لەو کارەکتەرە دیار و چالاکانەی ناو دەقەکە (مامۆستا گەلاوێژ)ە، کە سەرەڕای بیری پێشکەوتووخوازییانەی، رۆڵێکی کاراشی لە دەقەکەدا گێڕاوە، بەتایبەتیش کە یەکێک بووە لەوانەی پەیوەندی بە رێکخستنەکانی حزب کردووە و پاڵپشتییەکی کارای لە (مریەم)ی کارەکتەر کردووە و بەهۆی هەڵوێستی ئەویشەوە گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیانیدا هاتۆتە ئاراوە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە کە (سابیر) کچەکەی خۆی (مریەم) وەکو بەردەستێک دەباتە ماڵی (گەلاوێژە) وە، رۆماننوس بیرو بۆچوون و هەڵوێستی ئەو دەخاتەڕوو ((گەلاوێژ کە تازە ببوو بە مامۆستای قوتابخانە، سەیر ئەوەیە رۆژی یەکەم کە لەقوتابخانە گەڕایەوە و لەناو حەوشە کچەی بینی ژێر دارتووەکە کسگ دەدا.... چاوی پەڕییە پشتی سەری و بەرەو لای دایکی هەڵمەتی برد، وتی: دایە... من هەر دەمزانی تۆ لەگەڵمدا راستگۆ نیت، دەمزانی تۆ زۆرت حەز لێیە کارەکەر و کەنیزەکەت هەبن، زۆرت پێ خۆشە ببیت بە شاژن پیرۆزت بێ.. تۆ پیرۆزت بێ، بەڵام من ئیتر لەم ماڵەداا نابم، من دەچمە ماڵی خاڵم)) (شار: ٥٢). ئەمەش گوزارشت لە کچێکی رۆشنبیر دەکات کە هەر چەندە لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندە، بەڵام پشتگیری و پاڵپشتی هەژارانەو دژی کردەوەی چینەکەی خۆی وەستاوەتەوە، بۆیە هەر بەکرداریش ئەوە دەسەلمێنێت، کاتێک (مریەم) لەدەست زوڵم و زۆرداری (دەرویش کەریم)ی مێردەکەی هەڵدێت و ئەو بەنهێنی لای خۆی داڵدەی دەدات و دەیپارێزێت. هەر ئەویش بوو هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی فێری خوێندەواری بکات. هەر لەڕێگای ئەو هەڵوێستانەی (گەلاوێژ)ەوە، رۆماننوس ئاماژە بە بیروبۆچوونی کۆمەڵگە لەو سەردەمەدا دەکات لەبارەی قوتابخانەوە، بەتایبەتیش بۆ رەگەزی

مێ، ئەمەش لەو گفتوگۆیەی کە لەگەڵ (مریەم) دا ئەنجامی دەدات و هەوڵیش دەدات فێری خوێندەواری بکات (( - ئەو تۆ داوات لە میمکە نەکرد بتنێرێتە قوتابخانە؟

- نەء.

- بۆچی؟. خۆت حەزت نەدەکرد؟

- با.. خۆم حەزم دەکرد، بەڵام کاک حەمە عەلی کچێکی هەبوو لەتەمەنی مندا بوو، کەچی نەیناردبووە قوتابخانە، هەموو جارێکیش لێم دەبیستن کە چوونە قوتابخانە بۆ کچ نابێ)) (شار: ٥٣). لێرەشدا بیروبۆچوونی دواکەوتووانە زاڵ بووە بەسەر هزری تاکەکانی کۆمەڵگە و وای کردووە کچان لە خوێندن بێ بەش بکرێن، دیارە کەسانی وەکو مامۆستا (گەلاوێژ) بەرپەچی ئەو بیروبۆچوونە دواکەوتووانەیان داوەتەوە و هەوڵیان داوە خەڵک وشیار بکەنەوە لەو دیاردەیە. لەدیمەنێکی دیکەدا رۆماننوس لەلایەکەوە ئاماژە بە (فەرهاد)ی کارەکتەر دەکات و بەهۆی خوێندنییەوە رەهەندی کەسایەتییەکەی بەدیار دەخات (( ئەمێک کە هەموو ساڵێک یەکەمی پۆلەکەی دەبوو، سەلماندبووی کە تا چ رادەیەک هۆگری خوێندنە و بۆی ئامادەیە، بەڵام کە پۆلی شەشەمی بڕی و کار هاتە سەر ناردنی بۆ شار، بۆ بەردەوامبوون لەسەر خوێندنە، باوکی لەبەر هەژارییەکەی ،سەری دنیای لێ هاتەوە یەک. چەندی هێنای و بردی، شان بداتە بەر مەسرەفەکەی، ئەگەر لەبەشی ناوەخۆ وەرنەگیرێ، ئینجا لەبەر ئەوەش وەها لەدڵ گرتبوو کە تا خاوەن پشت و دەستڕۆیشتووان راوەستابن وەرگرتن لەو بەشەدا بەر کورەکەی ئەم ناکەوێ، بریاری دا سەری خۆی لێ سووک بکا و وازی پێ بێنێ لە خوێندن)) (شار :٢٥٩)، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی ئەو رووداوەوە هەڵوێستی مامۆستا (رسول) نیشان دەدات کە چۆن بەهانایەوە

دێت و کێشەکە چارەسەر دەکات و لەگەڵ باوکی لەوبارەیەوە گفتوگۆ دەکات و پلانێکی بۆ دانا کە ئەگەر خزمێکیان لە شاردا هەبێت کارەکە مەیسەر دەبێت و کێشەکەش چارەسەر دەبێت، ئەویش لەوەڵامدا ئەوەی روون کردەوە کە ماڵی ئامۆزایەکی لەشارە و هەر چەندە هەژارن، بەڵام دەکرێ پشتیان پێ ببەسترێت، کە بووە مایەی خۆشحاڵی مامۆستا، ئەمەش ئەوپەڕی هەڵوێست و جوامێری مامۆستا پیشان دەدات و رۆڵی گەورەی لە بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە روون دەکاتەوە وئەوەش بەدیار دەخات کە مامۆستایان هەمیشە لەپێناو خزمەتگەیاندن بە کۆمەڵگە درێخیان نەکردووەو هەمیشە خاوەن هەڵوێست و بیروباوەڕی پێشکەوتووانە بوون، سەرەڕای ئەمەش، ئەم هەڵوێستە رۆڵی بەرزی مامۆستا لەبواری کۆمەڵایەتی، هاوشان لەگەڵ بواری رۆشنبیری و پەروەردەییدا، بەدیار دەخات کە جگە لە ئەرکی پێگەیاندنی نەوەی نوێ، لەخەمی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانیشدا بووە.

هەر لەم چوارچێوەیەدا رۆماننوس لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییەوە، کەپەیوەندی خۆشەویستییە، ئاوڕ لەلایەنی پەروەردەدە و خوێندن دەداتەوە. لەیەکێک لەو پەیوەندییە خۆشەویستییانە کە لەنێوان (خورشید و ئەختەر)دا هەیە، قوتابخانە رۆڵی ئەوەی هەیە کە ببێتە جێگەی ژوانیان، لەگەڵ ئەوەشدا خوێندن لەلایەکەوە جیاوازی چینایەتی نێوانیان پیشان دەدات و لەلایەکی دیکەشەوە دەبێتە کۆسپێک بۆ بەیەکتر گەیشتنیان، لەبەر ئەوەی (ئەختەر)ی خۆشەویستی قوتابییە، ئەویش کرێکاری قورە، ناهاوسەنگییەک لەنێوانیاندا هەیە، هەرچەندە پەیوەندییە خۆشەویستییەکە لەو شتە بەهێزترە. بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەش لەلایەن (ئەورەحمان)ەوە پێشنیاری ئەوە دەکرێت دووبارە دەست بە خوێندن بکەنەوەو تاوەکو لەلایەکەوە درێژە بەخوێندنەکەیان بدەن و تەواوی بکەن، لەلایەکی دیکەشەوە زاڵ بن بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی بەهۆیەوە هاتۆتە ئاراوە، ئەمەش دەبێتە هەواڵێکی دڵخۆشکەر بۆ (ئەختەر) و لەلای (خەجێ)دا بەخۆشحاڵییەوە دەیدرکێنیت، بەمجۆرە دەستیان بەخوێندن کردەوە و چۆن نەخشەیان بۆ دارشتبوو وەها لەسەری رۆیشتن و سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، سەرەڕای ئەمانەش کۆسپێکی دیکە دێتە رێگایان، ئەویش بەشوودانی (ئەختەر)ە کە بەهۆی (مەجی)برایەوە نەخشەی بۆ دادەرێژرێت، لە گێڕانەوەی ئەمەشدا سوود لە قوتابخانەو پرۆسەی خوێندندا وەرگیراوە و کاتێک لە قوتابخانە گەڕاوەتەوە میوان هاتوون بۆ داخوازیکردنی، بەڵام ئەو رازی نابیت و لەگەڵ هاتنەوەی براکەشیدا دەبێتە دەمەقاڵەیان و ئەویش هەڕەشەی وازهێنان لەقوتابخانەی لێ دەکات، بەڵام ئەو نەخشەیەی بۆ ناچێتە سەر و شکستی لێ دەهێنێت و ئەو لەسەر خوێندنەکەی خۆی هەر بەردەوام دەبێ، لەم دیمەنانەدا رۆماننوس لە رێگەی دەقەکەی ژیانی خوێندەواربوونی ئافرەتانی لە کۆمەڵگەی کوردی لەو سەرەدەمەدا پیشان داوە کە چەند سەخت بووەو هەمیشە لەژێر هەڕەشەی ئەوە دابوون کە لە قوتابخانە بیانهێنە دەرەوە، رەنگە زۆرێکیش بەهۆی ئەو هۆکارانەی کە رۆماننوس باسی کردووە لە خوێندن بێبەش کرابن.

لەرۆمانی (کانگەی بەلا)ی (حسام بەرزنجی)دا قوتابخانە وەکو دەزگایەکی پەروەردەیی ئەوەندە رۆڵی نییە، بەڵکو کاری قوتابیبوونی کارەکتەرەکان لەناو رەوتی رووداوەکاندا ئەرکیان هەیە و بەشێک لە رەهەندەکانی کارەکتەرەکان دیاری

دەکەن. بۆ نموونە لەباسکردنی کارەکتەرێکی وەکو (خورشید)ی کە برای کارەکتەری سەرەکی (دارا) یە، رۆماننوس بۆ دیارخستنی لایەنی رۆشنبیری ئەوە ئاماژە بەوە دەکات کە خوێندنی تەواو کردووەو خاوەنی بڕوانامەیە، لەمەشدا خوێنەر ئاشنای لایەنی پەروەردەیی ئەو کارەکتەرەو ئاستە رۆشنبیرییەکەی دەبێت. لەدیمەنێکی دیکەدا رۆماننوس لە باسکردنی ژیان و گوزەرانی (سەرگوڵ) و خانەوادەکەیدا، ئاماژە بەوە دەکات کە سەرەڕای خراپی بارودۆخی بنەماڵەکەیان لەدوای ئەوەی گوندەکەیان وێران دەکرێت و دەست بەسەر زەوی وزارەکانیان دەگیرێت و بەناچاری بەرەو شار کۆچ دەکەن، ئیدی (سەرگوڵ) سەرەڕای ئەوەی لە خوێندن دادەبڕێت، چونکە لەلایەکەوە قوتابخانەی گوندەکەشیان وێران بووە و لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی خراپی باری ئابووری و داراییانەوە بەناچاری کرێکاری لە کارگەکەی بنەماڵەی (دارا) دەکات، بەڵام دواتر دەچێتەوە قوتابخانەی شەو و درێژە بەخوێندن دەدات، هەروەها کاتێک کارکتەری سەرەکی لەسەروبەندی پەیوەندیی هاوڕێیەتییدا، ئەو هاوڕێیانەی خۆیمان پێ دەناسێنێت، ئاماژە بە (سەرهید) دەکات و ئاستی خوێندنی دیاری دەکات (( ئەگەر چی (سەرهید) لەمن و (مازن) دەوڵەمەندتر بوو، بەڵام کردبوومانە دەمڕاستی خۆمان. ئەو کات تازە بەتازە، لەیەک لە ئامۆژگاکان دا دەیوت قوتابیم، لەهەردووکمان بەتەمەنتر بوو، بەڵام لەخوێندن گەلێک دواکەوتبوو)) (کانگەی بەڵا: ٨٨). لەتەواوی ئەم دیمەنانەدا رۆماننوس تەنیا وەکو ئاماژەپێدان و زانیاریی خستنەڕوو ئاماژەی بەلایەنی پەروەردەیی و ئاستی خوێندنی کارەکتەرەکان داوەو نەبرژاوەتە سەر ئەوەی باس لەخودی دەزگای قوتابخانە بکات، یاخود ژیان و گوزەرانی قوتابییەتی کارەکتەرەکان بخاتەڕوو، بەڵکو ئەو زانیاریی و ئاماژانەی کەداون، بەمەبەستی تەواوکردنی وێنە گشتییەکە بووە لەسەر کارەکتەرە، و بەهیچ شێوەیەک شوێنی رووداوەکان ناچنە ناو دەزگایەکی وەکو قوتابخانە و رەوتی رووداوەکان تەنیا لە روونکردنەوەی رەهەندەکانی کارەکتەرەوە پێکدەهێنن.

لەرۆمانی (هەڵکشان بەرەو لوتکە)ی (عەبدوڵڵا سەراج)دا لەرێگەی دوو کارەکتەرەوە ئاماژە بە قوتابخانە و رەوشی خوێندن و پیشەی مامۆستایەتی کراوە و بەهۆیەشەوە رەهەند و لایەنەکانی ژیانی ئەوانیان روونکردۆتەوە، ئەوانیش (تۆفیق)ی کارەکتەری سەرەکی و خانەوادەکەی و (سالار)ی کارەکتەرەوە. کاتێک باس لە (تۆفیق)ی کارەکتەری سەرەکی دەکرێت، ئاماژە بەوە دەکرێت کە ئەو نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات، ئەمەش بەهۆی بارودۆخی هەژاری بنەماڵەکەیان و هەروەها مردنی باوکی، کە وایان لێکردووە واز لەخوێندن بێنێت و روو لە کارکردن بکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بارودۆخی خێزانی و هەژاری ونەبوونی کاریگەری راستەوخۆیان هەبووە لەسەر رەوشی پەروەردە و فێرکردن و، لەمپەرێک بوونە لەبەردەم رەوشی خوێندن و پەروەردەوە. لەشوێنێکی دیکەدا هەر لە زاری (تۆفیق) خۆیەوە ئاماژە بە لایەنە پەروەردەی وەرزشی لە قوتابخانەکان دەدرێت، بەتایبەتیش لەو کاتانەی کە ئەو لە قوتابخانە بووە، هەژاری قوتابی و مامۆستایەکان و هەروەها کەم بایەخدانی حکومەت بەلایەنی پەروەردەی وەرزشییەوە وای لێیان کردبوو بەو جلی شڕو وڕەوە بە تۆپی پەڕۆینەوە یاری بکەن ((سەردمی ئێمە تۆپمان نەبوو، بەهەزار ناری عەلی چەرمە تۆپێکمان پەیداکرد و ناوەکەیمان بەکا و پەڕۆ ئاخنی! بە مەکتەبەکەیان دەوتین مەکتەبی پەڕۆ چونکە زۆربەمان سترەو بانتەڵۆنی شڕی لەبەر

بوو، حەمیدە فەنیش خوا عافووی کات لە قوتابیان شرتری دەپۆشی!)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە :١٤٩). لێرەشدا بارودۆخی گشتی قوتابیان و هەروەها مامۆستایانیش بەرچاو خراوە کە لەوپەڕی خراپیدا بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە وانەی وەرزشیش بە بایەخ بووەو تۆپیان لە پەڕۆ دروست کردووە، ئەمەش ئاستی خراپی پەروەردە لەو سەرەدەمەدا نیشان دەدات. لەدیمەنێکی دیکەشدا ئاماژە بە رەوشی پەروەردەیی منداڵەکانی (تۆفیق) دەدرێت، بەتایبەتیش کە خانەوادەکەی (تۆفیق) لەڕووی ئابوورییەوە لەژیان و گوزەرانێکی خراپدان و کرێچین، ئەو کرێچیایەتییە کاریگەری گەورەی لەسەر رەوشی پەروەردەیی و فێرکردنی منداڵەکانیش هەبووە، چونکە بەهۆی گواستنەوەی بەردەوامی کرێچییەکان لەم گەڕەک بۆ ئەو گەڕەک، دەبوایە منداڵەکانیش لە قوتابخانەی گەڕەکەکانیش بگوزارێنەوە، ئەمەش وا دەکات ئاستی فێربوونیان جێگیر و سەقامگیر نەبێت و کاریگەری دەروونی و کۆمەڵایەتیشی بۆ دروست دەکردن، چونکە ژینگەی هەر قوتابخانەیەک بۆ ئەوان تازە بوو و پێویستی بە کات هەبوو تا لێی ڕادەهاتن، لەگفتوگۆی نێوان (تۆفیق) و خێزانەکەیدا ئەم مەسەلەیە باسی لێوە دەکرێت (( ـ ئەی منداڵەکان؟

ـ دەیانگوازینەوە قوتابخانەی سەرکەوتن و خانزاد، نەوزادیش با پاسکیلێک بکرێ و هامشۆی قوتابخانەکەی پێبکات)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە :١٣٥). لێرەدا سەرەڕای ئەوەی ناوی قوتابخانەکان تۆمار کراوە، لەهەمانکاتیشدا ئێش و ئازاری کرێچیایەتی لەڕووی پەروەردەییەوە بەرچاو خراوە. هەر ئەمەش هانی (تۆفیق)ی داوە بەشێوەیەک لە شێوەکان قەرەبووی ئەو رەوشە بکاتەوە و لە پێویست زیاتر بایەخ بە منداڵەکانی بدات، لێرەدا سووربوونی باوکیان لەسەر بایەخدان بە رەوشی منداڵەکانی بەدیاردەکەوێت، سەرەڕای ئەوەی کە هەژار و دەستکورتیشن. رۆماننوس باس لە پلە و ئاستی ئەو منداڵانەش دەکات کە لە قوتابخانە دەخوێنن کە دووبارە هۆکاری هەژاری و نەبوونی کاریگەری و کارتێکردنیان لەسەر رەوشی پەروەردە هەبووەو وایان لە (نەوزاد) ی کوڕی کردووە لە پێناو دابینکردنی بژێوییان واز لەقوتابخانە بهێنێت و لە خوێندن داببڕێت. دیارە دوای باشتر بوونی رەوشی ژیانیان، (نەوزاد) دووبارە ڕوو لەخوێندن دەکاتەوە، هەرچەندە لەسەر کارکردن بەردەوام دەبێت و بۆ خوێندنەکەشی شەوان دەچێتە قوتابخانە، لەشوێنێکی دیکەشدا ئاماژە بە ئەرکی ماڵەوەی قوتابی دەکرێت، ئەمەش یەکەم جارە بەم شێوەیە لەرۆماندا باس لەو ئەرکەی خوێندنە بکرێت. کاتێک دایکیان داوا لە منداڵەکان دەکات ئەرکی ماڵەوەیان بکەن (( ـ دە تۆ خوێندنت تەواوکە.

ـ خوێندنم نی یە تەنیا پێنج دێرم هەیە لەبەری دەکەم)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە :٢٢٢).لێرەشدا ئاماژە بە لەبەرکردنی شیعر دەکرێت کە لەوانەی کوردیدا لە قوتابیان داوا دەکرێت لەبەری بکەن.

لەلایەکی دیکەشەوە لەرێگەی (سالار)ی کارەکتەرەوە ئاماژە بە خوێندن لە پەیمانگەکان و پیشەی مامۆستایەتی دەکرێت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە (سالار) چۆتە داخوازی (نەخشین) و پەلەیەتی لە پێکهێنانی ژیانی خێزانیدا، داخوازیکەران بە باوکی (نەخشین) رادەگەیەنن کە ئەو تازە بە مامۆستایەتی دامەزراوە، ئەمە لەلایەکەوە ئەوە روون دەکاتەوە کە مامۆستای تازە دامەزراوە سەرەتا دەبێ لە قوتابخانەی گوندەکاندا خزمەت بکەن و لەوێ خۆیان پێبگەیەنن، لەلایەکی دیکەشەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە پیشەی مامۆستایەتی پیرۆز بووەو خەڵک خۆزگەی ئەوەیان خواستووە کە

کچەکانیان بە مامۆستا بدەن، چونکە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزیان هەبووە، لەبەر ئەوەشە باوکی (نەخشین)ی بە کراسی بەری خۆیەوە پێشکەش دەکات. لەدیمەنێکی دیکەشدا ئاماژە بە پسپۆری (سالار) دەکرێت و لەزاری خۆیەوە گوزارشت لە پسپۆرییەکەی و چالاکییەکانی تایبەت بەو پسپۆرییە دەخرێتەڕوو ((من ئێستاکە دەرچووی هونەرە جوانەکانم و نیازم وایە لەم رۆژانەدا، پیشانگایەک لە کتێبخانەی گشتیدا بکەمەوە)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە: ١٠٢)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە مامۆستا تەنیا ئەرکی وانەگوتنەوە نییە، بەڵکو لەپسپۆرییەکی خۆشیدا پێویستە چالاکی و داهێنانی هەبێت و بەشدار بێت لە رەوشی رۆشنبیری گشتی کۆمەڵگەدا.

لەوێستگەیەکی دیکەدا رۆماننوس ئاماژە بەو گوندە دەکات کە (سالار) تێیدا مامۆستایە، بەهۆیەوەش خراپی هۆیەکانی گواستنەوە دەخاتەڕوو کە کاریگەری لەسەر رەوشتی خوێندن و پەروەردەوە هەیە (( سالار سەر خەوێکی شکاند و لەپڕ راچڵەکی، سەرنجی کاتژمێرەکەی مەچەکی داو دڵنیابوو لەوەی کە شەمەندەفەرەکە هێشتاکە (هەفتاغاز)ی جێ نەهێشتووە. دەنا دەبوایە بەیانی زوو لە (خورماتوو) بە ئۆتومبێل هەڵگەڕێتەوە بۆ هەفتاغار. ئەویش لەسەری بەگران دەوەستا، درەنگ دەگەیشتە قوتابخانە و ئەستەڕەکەی لەلا گرانتر دەوەستا لەڕووەکە، بەوەی بەڕەنگاری پرسینەوەو بۆڵە بۆڵی کەریم ئەفەندی دەبوو لەگەڵ مزەمزی دارا بەگی سەرۆک هۆز)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە :١٨٢). بەو واتایەی هۆیەکانی گواستنەوە کاریگەری و کارتێکردنی راستەوخۆی لەسەر رەوشی پەروەردە هەبووەو هۆکارێکی خراپیش بووە لەسەر رەوشی بژێوی چینی مامۆستایان. هەر لەم میانەیەشدا ئاماژە بە خراپی رەوشی پەروەردەیی سەردەمی پاشایەتی لە کۆمەڵگەی گوندنیشنەکانەوە دراوە، بەوەی لە چەند گوندێک دەزگایەکی گرینگی وەکو قوتابخانەی نەبووە، بەڵکو هەر وەکو لەو رۆمانەدا ئاماژەی بۆ کراوە بە سێ گوند قوتابخانەیەکیان هەبووە. سەرەڕای ئەوەش لەڕووی میلاک و دابینکردنی مامۆستایانیشەوە حکومەت کەمتەرخەم بووە، لەوە بەدیار دەکەوێت کە (سالار) جگە لە پسپۆری خۆی کە نیگار بووە، وانەی ئەلف و بێشی وتووەتەوە کە پسپۆری ئەو نەبووە. بەشێوەیەکی گشتی لەم رۆمانەدا بارودۆخی خراپی قوتابخانەو رەوشی پەروەردەیی لە گوندەکان خراوەتەڕوو، لەشارەکانیشدا بەهۆی هەژاری و نەبوونییەوە خەڵکانێک نەیانتوانیوە درێژە بەخوێندن بدەن و لێی دابڕاون.

## سەرچاوەکان:


١. د. محمد علی البدري، دارسات سوسيولوجية، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠٠٤.
٢. ئیبراهیم ئەحمەد، ژانی گەل، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی پێنجەم، هەولێر، ٢٠١٠.
٣. ئیسماعیل رۆژبەیانی، نازە، دار العراق للطبع و النشر، بغداد، ١٩٨١.
٤. حسین عارف، شار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١١.
٥. حسام بەرزنجی، کانگەی بەڵا، مطبعە الحوداث، بغداد، ١٩٨٨.
٦. عەبدوڵڵا سەراج، هەڵکشان بەرەو لوتکە، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩.

# پەروەردەی کوردی

## لەژێر سێبەری کۆلۆنیالیزمدا








**سەلام ناوخۆش**

لەدایکبووی ١٩٦٦ هەولێر. ماستەر لە زمانی ئینگلیزی. پرۆفیسۆری یاریدەدەرە لە زانکۆی سەلاحەددین. نزیکە (٦٠) بەرهەمی چاپکراوی هەیە.

## دەروازە

ئینگلیز وەک کۆلۆنیالیزمێک پاش ئەوەی هەر سێ ویلایەتی بەسرە و بەغدا و موسڵی داگیر کرد، بیری لەوە کردەوە (مهاراجایەک) دروست بکات. سەرەتا پێش ئەوە لە هەردوو ویلایەتە عەرەبییەکە، بەسرا و بەغدا، دەوڵەتی عێراق دروست بکات؛ لە مانگی یازدەی ١٩١٨دا حوکمڕانییەکی کوردیی لە سلێمانیی دروست کرد. لە ڕووی مێژوویی و سیاسییەوە زۆر لەسەر ئەو حوکمرانییە نووسراوە، بۆیە ئەم نووسینە لەسەر پرسی پەروەردە و زمانی کوردییە لە سەردەمی بەراییەکانی کۆلۆنیالیزم لە خوارووی کوردستاندا. کۆلۆنیالیزم لە عێراقدا پاش حوکمی ئیتحاد و تەرەقی هات، هەردووک بۆ کورد نیشانەی داگیرکردن بوون. لێرەدا گرینگە ئەو دوو قۆناغە لەم کورتە توێژینەوەیەدا، توێژینەوەی لەسەر بکرێت.

## کۆتاییەکانی حوکمی ئیتحاد و تەرەقی و سەرەتای کۆلۆنیالیزم

نەک هەر تەنیا ئیتحاد و تەرەقی (١٩٠٨-١٩١٨)، بەڵکوو خودی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕووی زمان و پەروەردەوە ئەوە دەهێنێ هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەین. لە ڕاشیدی و ئەمەوی و عەباسی، هەژموونی زمانی عەرەبی بەسەر ئەو دووە (زمان و پەروەردە) دیار بوو.

ئەوەی ڕوویدا لە دەوڵەتی عوسمانیدا، مەسەلەی زمان تەواو جودا بوو لەو سێ خیلافەتە!

لە دەوڵەتی عوسمانیدا زمانی عوسمانی لە ئیدارەی دەوڵەت لە سەرەوەی زمانی عەرەبیش بوو. چۆن؟! زمانی عوسمانی زمانی نەتەوەیەک نەبوو، بەڵکو لینگوا فرانکایەک بوو بۆ نەتەوە ئاسیاییەکان. عوسمان ٢٠١٧، ل١٧٧ لە پێناسەکردنی زمانی عوسمانی دەنووسێت: «زمانی عوسمانی زیاتر لە تێکەڵەیەک بوو لە زمانی فارسی و کوردی و عەرەبی و تورکی هەروەها لە یاسای ڕێزمانییەکەشدا سوودی لە ڕێزمانی ئەو زمانانە وەرگرتووە.»

لەگەڵ ئەو هەمووەشدا هەتا کۆتایی ئیتحاد و تەرەقیش زمانی عوسمانی هەر وەک زمانی ئیمپراتۆریەت ماوە، نەک زمانی نەتەوەیەک بە تایبەتی لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی!

لەو ڕوانگەوە ئاساییە، کە زمانی پەروەردە لە دەوڵەتی عوسمانی، عوسمانی بێت.

هیلالی ٢٠١٧ ، ل١٧٧ کە ئاماژە بە خوێندن لە کۆتایی دەوڵەتی ئیتحاد و تەرەقی (عوسمانی) دەکات لە ویلایەتی مووسڵ، نموونە بە شاری مووسڵ دەهێنێتەوە و دەنووسێت:

١٣٠ قوتابخانەی نموونەیی
٨٥ قوتابخانەی ئیتحاد و تەرەقی
٥٣ قوتابخانەی میاسەی سەرەتایی
١٢٥ قوتابخانەی جامع خزام-ی سەرەتایی
٦٠ قوتابخانەی کورە باش-ی سەرەتایی
٣٣ قوتابخانەی شێخ موحەمەدی سەرەتایی•

ئەو شەش قوتابخانەیەی سەرەوە لە سەردەمی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٤ لە ناوەندی مووسڵ هەبوون، هەروەها ئەو چوار قوتابخانەیەی خوارەوە لە گوندەکانی سەر بە مووسڵ هەبوون:

٢٠ قوتابخانەی نەینەوای سەرەتایی
٢٠ قوتابخانەی یارمجەی سەرەتایی
١٥ قوتابخانەی کوکجەلی سەرەتایی
٢٨ قوتابخانەی ڕەشیدیە

بۆتانی ٢٠٠٢ باوەڕی وایە، کە قوتابخانەی (کۆکجەلی) بە زمانی کوردی بووە، کەوابێت لە سەردەمی عوسمانی قوتابخانە هەبووە کوردی بێت هەروەها گۆڤار هەبووە نیوەی بە زمانی کوردی بێت. لەوانەیە بەراوردێک سادە لە نێوان ڕەوشی قوتابخانە لە سەردەمە کۆتاییەکانی عوسمانی و سەرەتاکانی ئینگلیز لە دوو ویلایەتەکەی تر و ویلایەتی مووسڵ بکەین ، خراپ نەبێت.

بۆ زۆربەی خەڵکانی ویلایەتی مووسڵ هەریەک

لە ئیتحادیەکان و ئینگلیزەکان داگیرکەر بوون، منەوەری کورد وایان تەڵقین دابووین: ئینگلیز بۆ ڕزگارکرن و بڵاوکردنەوەی مەعریفە هاتوونەتە کوردستان، بەڵام چەندان کەسی وەک دکتۆر کەمال مەزهەر پێچەوانەکەی دەڵێن ! دکتۆر مەزهەر ١٩٨٣ ، ل٢٦-٢٧ لەم بارەیەوە دەنووسێت: ڕەوشی هەبوونی قوتابخانە لە دەوڵەتی عوسمانی زۆر باشتر بوو بە بەراورد بە سەردەمی کۆلۆنیالیزم، وەک دەنووسێت: « هەموو ئەو پارەیەی ئینگلیزەکان ساڵی ١٩١٩-١٩٢٠ بۆ کاروباری خوێندنیان دانا بریتی بوو لە ٧٠ هەزار لیرەی عوسمانی، واتە دوو هێندەی ئەو پارەیەش نەدەبوو کە عوسمانییەکان ساڵی ١٩١١-١٩١٢ تەنها بۆ ویلایەتی بەغدایان دانا. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە ژمارەی قوتابخانەکانی هەموو عیراق هاتە سەر نیوەی ژمارەیان لە ساڵی ١٩١٤ دا بن»، لەمەزیاتر بۆتانی ٢٠٠٢ ، ل٣٥ دەنووسێت: لە شارێکی وەک موصڵ لە سەردەمی کەوتندا لە١٠\١١\١٩١٨ شەش قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان و سێ قوتابخانەی سەرەتایی کچان و یەک ئامادەیی و یەکی پیشەسازیی و خانەی مامۆستایان هەروەها چەند قوتابخانەیەکی گاوران و جولەکانی لێبوو.» سەرچاوەی تر ژمارەی زیاتر لە مەزهەر ١٩٨٣ و بۆتانی ٢٠٠٢ دەڵێن، بۆ نموونە هیلالی ٢٠١٧، ل١٧٧ دەنووسێت: جگە لەو (دە) قوتابخانەیەی سەرەوە ناوی سێ قوتابخانەی تر لە سەردەمی عوسمانی دەهێنێت، کە بریتی بوون لە (تەتبیقاتی خانەی مامۆستایان)، (قوتابخانەی دار العرفان)، (قوتابخانەی شمس المعارف).» پاش نەهامەتییە -کانی ئیتحاد و تەرەقی ١٩٠٨-١٩١٨ خەڵک چاوەڕێی زۆری لە کۆلۆنیالیزمی بەریتانی دەکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی ویدرۆ ولسنی سەرۆکی ئەمریکا (بڕیارنامە چواردە خاڵیەکەی) دەرکرد و لە خاڵی دوازدە وتی : «گەلانی غەیرە تورک ئۆتۆنۆمی سەربەخۆییان پێدەدرێت....». بە پێچەوانەوە هەر لە ساڵی یەکەمی داگیرکردندا کاپتن پیرسنی بەرپرسی کاروباری مەعاریف لە موصڵ زۆربەی ئەو قوتابخانانەی سەرەوەی داخست بە بیانووی ئەوەی ئەو قوتابخانانە قوتابخانەی حیزبین (مەزهەر ١٩٨٣، ل٢٧ هەروەها بۆتانی ٢٠٠٢، ل٣٥). میس بێل لە یاداشتەکانی دەنووسێت: ئەو سێ قوتابخانەیەی، کە ژمارەی قوتابییەکانی پێکەوە ٢٥٩ بوو، هیچی نەمان هەموو داخران. ئەو دەم سێ شاری هەولێر و سلێمانی و کەرکوک جموجۆڵی پەروەردەیی لێبوو، بۆ نموونە:

هەولێر لە سەردەمی هاتنی ئینگلیز قەزایەک بوو سەر بە لیوای کەرکوک بوو، عەبدولقادر ٢٠١٢، ل٩٢ دەنووسێت: «لە ماوەی دوای جەنگ تەنها دوو قوتابخانەی فەرمی لە قەزای هەولێر هەبوون، کە لە (نۆ) پۆل و (دووسەد و بیست) قوتابی و (سێزدە) مامۆستا پێکهاتبوون، بەڵام هیچ قوتابخانەیەکی ناوەندی لە شارەکە نەبوو.» کەچی جۆزەلی٢٠١٩ ئاماژە بە دۆکیومێنتێکی عوسمانی دەکات کە لە هەولێر لە سەردەمی عوسمانی (یازدە) قوتابخانە و (شەش) مەکتەبی لێ هەبووە.

سلێمانی لە قوتابخانە لە هەولێر باشتر نەبوو. سۆن دوای ڕوخاندنی حوکمداریەکەی شێخ مەحمود لە حوزەیرانی ١٩١٩ بووە حاکمی موتڵەقی سلێمانی. لە سەردەمی سۆندا ١٩١٩_١٩٢٢، سۆن پتر لە ٣ ملێۆن ڕوپیەی وەک باج لە سلێمانی کۆکردەوە، مەزهەر ١٩٨٣، ل٢٧ دەنووسێت: « سۆن لەو برە پارەیە تەنها ٦٣ هەزار ڕوپییەی بۆ کاروباری خوێندن تەرخان کرد، واتە نزیکەی لە ٪ ٢ داهاتی ناوچەکە..» هیلالی ٢٠١٧ ، ل١٧٨_١٨٠ دەنووسێت: سلێمانی (دوو) قوتابخانەی سەرەتایی لێبو، کە (هەشتا قوتابی)-_ان لە خۆ گرت بوو لەگەڵ ڕوشدیەک کە (١٣٨ قوتابی) هەبوو.» ڕوشدیە وەک فێرگەیەکی سەربازی وابوو، بۆیە تەنیا کوڕی دەرچووی سەرەتایی وەردەگرت نەک کچ، مەزهەر ١٩٨٣ جگە لەمانە ئاماژە بە هەبوونی ناوەندیەکیش دەکات.

مەزهەر ١٩٨٣،ل٢٧ ئەوها قسە لە سەر ڕەوشی خوێندن لە دوا ساتەکانی سەردەمی عوسمانی لە سلێمانی دەکات و دەنووسێت: «لە شار دوو قوتابخانەی سەرەتایی و یەکێکی ناوەندی و فێرگەیەکی سەربازی هەبوو.»

بێگومان لە سەردەمی سۆن چاوەڕێ دەکرێت، کە ژمارەی قوتابخانەکان زیاتر بێت، چونکە ئەو ڕۆژنامەی هێنایە خوارووی کوردستان، بە ڕواڵەت زۆر گرینگی بە زمانی کوردی دا(١).

ئەحمەد خواجە، کە لە سەردەمی شێخدا خەزنەدار –گەنجینەدار بوو، لە ل٧١-٧٢ بەرگی یەکەمی کتێبی (چیم دی) باسی هەوڵی کردنەوەی قوتابخانەیەک لە سەردەمی مێجەر سۆن ١٩١٩-١٩٢٢ ئەوها دەگێڕێتەوە: بە مضبطە بیانامەی زۆر داوای کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی و یەکیکی ناوەندی ئەکرا، کە لە سلیمانیدا بکریتەوە. لە دوا کەشماکەشێکی زۆر بە کردنەوەی سەرەتاییەک بۆ خوێندنی انگلیزی و تەنیا دوو سعات لە شەودا دلخۆش کران...بۆ پێشکەشکردنی مضبطەکە بە حاکم سیاسی میجر سون..*. ئەویش داواکەی قەبوڵ نەکرد..!» لە کۆتاییەکانی بوونی لە سلێمانی, ئینگلیز بیری لە کردنەوەی قوتابخانە کردەوە، مەزهەر ١٩٨٣، ل ٢٧ دەنووسێت: لە سەرەتادا تەنها قوتابخانەیەکی سەرەتاییان لە سلێمانی کردەوە و لە کۆتایی بیستەکان تەنها (١٠) قوتابی ناوەندی هەبوون، کەچی لە سەردەمی عوسمانی ژمارەی قوتابیان بە سەر یەکەوە ٣٣٠ کەس بوون، واتە ژمارەی قوتابی لە سەردەمی ئینگلیز شازدە جار کەمتر بوو لە دوا ڕۆژەکانی سەردەمی عوسمانی -١٩١٤.»

کەرکوک هەر لە سەرەتاوە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی کوردی بوو•• ڕەفیق حیلمی لە ل١٤٠-_١٤٩بەرگی سێیەمی یاداشت باسی ڕەوشی خوێندن لە دوای کەوتنی حکمداری شێخ لە کەرکوک دەکات و دەنووسێت لە ١٩٢١، مامۆستایەک تەنیا لەسەر بڵاوکردنەوەی وتارێک کە لەگەڵ بیروبۆچوونی ئینگلیز نەگونجاوە ، لە وەزیفە دەرکراوە.»

وەک گوتمان کۆلۆنیالیزمی بەریتانی بۆ بڵاوکردنەوەی زمان و کەلتووری ئینگلیز سلکی پەروەردەی بە باشترین ناوەند زانیوە، کاپتن فارل، کە لە سەردەمی بەرایی کۆلۆنیالیزم بووە بەرپرسی یەکەمی مەعاریف لە عێراق، وەک کاکەسور ٢٠٠٣ لە لاپەڕە ٥٧ی دکتۆراکەی دەنووسێت: «کابتن فارل لە قۆناغی سەرەتایی زمانی ئینگلیزی و خەتی ئینگلیزی لە پەروەردەی عێراق سەپاند بۆ ئەوەی ئاسەوارەکانی عوسمانی بسڕێتەوە.» جگە لە سەپاندنی زمانی ئینگلیزی لە پەروەردە، کردنەوەی تیاترۆخانە هەوڵێکی دی داگیرکاری بوو، مەزهەر ١٩٨٣، ل٢٥ لەم بارەیەوە دەنووسێت: « ئینگلیزەکان لە شارەکانی کوردستاندا ئاشکرا ڕێگەیان دا بە زۆر کەس نەک هەر تەنها مەی، بەڵکو تەنانەت بەنگیش بفرۆشن، شاری واش هەبوو نەک تەنیا تیاترۆیان تیا دانا، بەڵکو کارخانەشیان تێدا کردەوە.» هەریەک لە خواجە لە (چیم دی) و حیلمی لە ( یاداشت) باس لە کردنەوەی تیاترۆخانە لە سلێمانی دەکەن.» ئەم دیاردە نامۆیە بە کۆمەڵگای کوردی کاریگەری هەتا لە کۆمەڵگای موحافیزکاریش کردبوو، مائی ١٩٦٠ ، ل١٨٤-٥ دەنووسێت: هەر خودی هاتنی ئینگلیزەکان کاری کردۆتە سەر ڕەوشتی بەشێک لە بادینیەکان.»

ئینگلیز وەک ئیستعمارێک بیری دەکردەوە نەک وەک مرۆدۆستێک. ئامانجی ئینگلیز لە کوردستاندا بریتی بوو لە کەمکردنەوە یا نەهێشتنی هەژموونی زمانی عوسمانی لە کوردستاندا هەروەها فەرزکردنی زمانی ئینگلیزی، کاکەسور ٢٠٠٣ ، ل٥٩-٦٠ لەم بارەیەوە دەنووسێت: «جگە لە پۆلە یەکەمینەکان لە پۆلی پێنجەم و شەشەم هەفتەی نۆ کاتژمێر زمانی ئینگلیزی خوێندراوە کە ئەو مادانەی لە خۆگرتبوو: گفتوگۆ، خوێندنەوە ، خەت، ڕێزمان، وەرگێڕان لە کاتی نەبوونی مامۆستا هەندێ بەرپرسی گەورەی ئینگلیز لە سلێمانی لەوانە کاپتن هۆلت دەرسی ئینگلیزی بە پۆلی

دواین ئەوتەوە.»**

کۆلۆنیالیزم بۆ کوردی باشوور دەرفەتێک بوو دەربارەی ناسنامە و قەوارەی کوردی. کورد گەر یەک ڕا بووایە، بەڵام ئەفسووس ئەوها نەبوو، ململانێی شێخ مەحمود و منەوەرەکان ئەو دەرفەتەی لەباربرد، کورد لەو قۆناغەدا هەروەک قۆناغی میرنشینە کوردیەکان دەژیا زمانی کوردی لای ئەو زمانی میرنشین بوو، نەک نەتەوە، بۆیە دەبینی لەو چەند قوتابخانە سەرەتاییەی لە ١٩١٩ لە سەرانسەری باشووری کوردستان هەبوو هەر یەکەی بە دایەلێکتێکی ناوچەکە بوو، بۆ نموونە لە گۆگجەلی قوتابخانە بە دایەلێکتی شەبەک بوو، لە هەولێر بە سۆرانی، لە دهۆک بە بادینی هەروەها لە سلێمانیش بە شێوەی سلێمانیی بوو (مەزهەر ١٩٨٣، ل٢٧ ، بۆتانی ٢٠٠٢، ل٣٦، عەبدولقادر ٢٠١٢، ل٩٢).

ئەگەرچی ئیدارەی ئینگلیز تا رادەیەک یارمەتی بە کوردیکردنی هەندێ لە پرۆگەگرامەکان لە لایەنی زمانەوە داوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک هەوڵی بە کوردیکردنی ئەم پرۆگرامانەی لە رووی فیکری و ناوەڕۆکەوە نەداوە. کۆلۆنیال لە پاڵ هەر وەزیرێکی عێراقی موستەشارێکی بەریتانی دادەنا وەک مستەر نورتون، مستەر لیونێل سمیث لە پاش ئەوان کاپتن فارل. ئینگلیز وەک کۆلۆنیالێک رەفتاری دەکرد، بۆیە لە رووی پەروەردەیش لەگەڵ کورد دۆست نەبوو (کاکەسور ٢٠٠٣ ، ل٥٩) بەهۆی نەبوونی ئامادەیی لە کوردستان لە ئەو شاندە زانستیەی ساڵی ١٩٢٢ ناردرا بۆ هەندەران یەک قوتابی لە کوردستان تێدا نەبوو (بۆتانی ، ل٣٦).

## خوێندن لە سەردەمی ماندێت «ئینداب» لە ویلایەتی مووسڵ (١٩٢١ ــ ١٩٣٢)

پاش ئەوەی ئینگلیز لە زۆر بەشی ویلایەتی مووسڵ بە چەک وەڵامی درایەوە، بە تایبەتی لە بادینان و سلێمانی و هەولێر، دەرکی بەوە کرد، کە زۆربەی عەشایەری کورد ئەوها ئاسان دەستەمۆ ناکرێن، بەڵام چەند رەگەزێک لە نێو رۆناکبیری کورد هەن، دۆست نین بە سیاسەتی ئاغا و بەگ و شێخی کوردی، دەکرێ لە رێگای ئەوانەوە سەقامگیریەک بۆ خۆی مسۆگەر بکات، ئەویش کردنەوەی قوتابخانە و باشترکردنی رێگا و بان و رەوشی کوردی. وێرای ئەوەش چاندن و پەڵکیشکردنی بەشێک لەو منەوەرانەی کورد و دوورخستنەوەیان لە دەرەبەگی کوردی چەکدار، وایکرد رووبکاتە کردنەوەی قوتابخانە.

گرینگیدان بە پەروەردە و خوێندن و ئەو فیگەرانەی کورد، کە وەک شێخ مەحمود بیر ناکەنەوە یەکێ لە ئەلتەرناتیڤەکان بوو.

لەو هەڵمەتە نوێیەدا ئینگلیز چۆن دەرگای لە سەر کردنەوەی قوتابخانەی مەسیحییەتدا ئەوهاش دەرگای لە سەر قوتابخانەی ئیسلامیشدا کردەوە. هیلالی ٢٠١٧، ل١٠٧ دەنووسێت: پاش هێوربوونەوە، کۆلۆنێل لیچمن حاکمی سیاسی مووسڵ سێ قوتابخانەی سەرەتایی بۆ کوڕان و کچان لە مووسڵ کردەوە، ئەوەی کوڕان ناوی قوتابخانەی (خەزرەجی) بوو، دووەکەی کچانیش یەک بەناوی (حديقة المعرفة) ئەویتر بەناوی (خەزامی) بوو، جگە لە مووسڵ لە هەولێر و گوێر و تەلعفەر و دهۆک و ئاکرێ و زاخۆ هەتا سلێمانی ئەو قوتابخانانەی بەهۆی شەڕ داخرابوون، دووبارە کردیەوە.» ئەو دەرگاکردنەوەی قوتابخانەکان لە لایەن ئینگلیزەوە سەقامگیری و ئاشتەوایی زێتر کرد لە کوردستاندا. لە دیسەمبەری ١٩١٩ کە کاپتن جیروم فارل لە سەردەمی سۆن زیارەتێکی بۆ سلێمانی کرد، بینی لەو شارە خوێندن بە کوردیە، بەڵام هیچ کتێبی رێزمانی کوردی و ئیملای کوردی نییە، بۆیە فەرمانی دەرکرد کە رێزمان و رێنووسێکی کوردی بنووسرێت و چاپبکرێت.

ئینگلیز لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١ دەوڵەتی عێراقی لە غیابی شێخ مەحمود دروست کرد. دەوڵەتی عێراق لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکی سوننەی عەرەب بوو،

لەبەر ڕاپەڕینی شێخ مەحمود لە ١٩١٩ و شیعە عەرەب لە شۆڕشی ١٩٢٠ ئەو دووە لەو حکومەتە دوورخرانەوە. تریپ ٢٠١٨ ، ل٤٨-٤٩ دەنووسێت: پاش ڕیفراندۆمی ساختە، کە ئیدیعای ئەوە کرا لە (سەدا نۆوەد و شەش-_٩٦٪) دەنگی بە مەلیک فەیسەڵ داوە، تاجی مەلیکی عێراقی لە سەرنرا.

پرسی زمانی قوتابخانە لە دەوڵەتی عێراقی نوێدا یەکێک لە پرسە چاوەڕێکراوەکان بوو، چونکە لە عێراق نەتەوەی جیا دەژین. لە ١٩١٩ دا (٧٥ قوتابخانەی سەرەتایی) لە تەواوی عێراق هەبوو، لە (٥٦)ی خوێندن بە عەرەبی بوو، لە ( ١١ ) خوێندن بە تورکی بوو، تەنها لە (٦-_شەش) قوتابخانە خوێندن بە کوردی ناوەند بوو، هەروەها تەنها لە قوتابخانەیەک خوێندن بە شێوەی شەبەک بوو، لە گوندەکانی نزیک مووسڵ ( هیلالی ٢٠١٧ ، ل١١٠)(٢). هەروەها ئینگلیز لە عەمکاوەی هەولێر لە ١٩٢١ قوتابخانەیەکی سەرەتایی بۆ دیانەکان کردەوە ، بەڵام بە زمانی عەرەبی.

## ئینگلیز و سیاسەتی زمانی قوتابخانەکان

ئینگلیز کەس ڕاستگۆ نەبوو، ئەو قوتابخانەیەی لە ١٩٢١ لە عەمکاوە (عەنکاوە) کردیەوە بە زمانی عەرەبی بوو، نەک سریانی(٣) سیاسەتی زۆرینەی دانیشتووان، نەک ناسنامەی شوێنەکە بووە مەرجێک لای ئینگلیز بۆ ئەوەی هەر قوتابخانەیەک بەو زمانە بخوێنێت. بە پێی برگەکانی ٣١ و٤٣ ڕاپۆرتی ئەدمۆنس ئاساییە منداڵانی سوبارشی یان گوندەکانی گراوی و قەرەتەپە و ئاکرێ بە زمانی کوردی بخوێنن، هەروەها دەبێ زمانی کوردی لە قوتابخانە کوردییەکانی گەڕەکە کوردییەکان کەرکوک بخوێنرێت (عەلی ٢٠١٣ ، ل ١٦٥). ئینگلیز یەکەم دەسەڵات بوو لە ڕێگای بەندی هەشتەمی یاسای زمانە لۆکالیەکان دیاردەی (جووتستانداردی کوردی) لە پەروەردە داهێنا بەوەی بادینیەکان ئازادن کوردیەکەی هەولێر و سلێمانی و کەرکوک بەکارنەهێنن، بەڵکە هی خۆیان بەکاربێنن، هەروەها لە چەند ناحیە و قەزایەکی هەولێر و کەرکوک زمانی کوردی لە پەروەردە دوورخستەوە!!

ئینگلیز هەر بە پەرتکردنی سیاسی و هزری و پەروەردەیی ڕانەوەستا، بەڵکە (پەرتکردنی شاریی ) شی داهێنا. لە ڕاپۆرتە نهێنیەکانی ئینگلیز هاتووە، کە هەندێ پیاو ماقووڵ و زانای کورد لەگەڵ بیرکردنەوەی چەکداری نین، هەروەها هاوسۆز نین لەگەڵ شێخ مەحمود. یەکێ لەو زانایە مەلا گەورە کۆیی و مەلا ئەفەندی هەولێر بوو. بە پێی دۆکیومێنتی بەریتانی ئێف ئۆ. ٣٧١\٥٠٦٩ نامەیەکی هاوبەشی مەلای گەورە هەیە، کە داوا لە بەریتانیا دەکات حاکمێک لە ناو خۆمان دیاری بکات، هەتا هاوکاری گەلەکەمان بێت بۆ بوژانەوە...» هەروەها مەلای گەورە جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ڕاوێژ بە پیاوماقووڵانی کورد بکەن پێش ئەوەی حەمدی بەگ بە حوکمدار دابنێن ( عەلی ٢٠١٣ ،ل١١٤ و ١١٨). بێخاڵی ١٩٩١، ل ٣٢ دەنووسێت: لە سەردەمی ئینگلیزدا هەولێر کرا بە لیوا و ئەحمەد عوسمان کرایە یەکەم موتەسەریفی هەولێر لە ١٩٢١.» دوای کەوتنی ئەزمونی شێخ مەحمود لە ١٩١٩دا ، ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە لە بێباوەڕبوون بە ئینگلیز و هەڵسوکەوتی کەسی وەک مێجەر سۆن ئەو خودی خۆی هۆکار بووە بۆ هێنانی تورک بۆ باشووری کوردستان. ئەوسا حوکمڕانی عوسمانی ببووە دوو بەش: بەشێک ناسرابوو بە حکومەتی ئەستەمبۆل، ئەویدی حکومەتی ئەنقەرە بوو، مستەفا کەمال سەرکردایەتی دەکرد. ئەوەی دووەم لە باشوور لە ڕێگای ئەحمەد تەقیەوە ببووە ئەلتەرناتیڤی ئینگلیز. ئەو کارەساتەی کورد بە دەست حوکمی ئیتحاد و تەرەقی دیتی بووی، زۆربە بە حوکمی عوسمانی ڕازی نەبوون، تەنها چەند ئاغا و سەرۆک هۆز و شێخێک نەبێ. بە پێچەوانەوە کەسانی تر هەبوون هێشتا باوەڕیان بە ئینگلیز هەبوو، یەکێ لەوانە مەلا ئەفەندی هەولێر و مەلای گەورە لە کۆیە.

## ئەنجام

زمانی عوسمانی لە پەروەردەدا بۆ هەمووان وەک یەک بوو، واتە کورد و عەرەب و تورک بە یەک زمانیان دەخوێند، ئەو زمانە زمانی نەتەوە نەبوو، بەڵکو زمانی ئیمپراتۆریەت بوو. لە خراپترین سەردەمی عوسمانی قوتابخانە زیاتر بوو لە سەردەمی بەرایی ئینگلیز. لە سەردەمی ئینگلیز دەرفەتێک بۆ کوردی باشوور دروست بوو، بەڵام تورکخوازەکانی دەورەی شێخ لەگەڵ منەوەرە ئینگلیز دۆستەکان بوونە هۆی لەباربردنی ئەو هەوڵە. پاش ئەوەی ئینگلیز لە شەڕ فەشەلی هێنا، بەکردنەوەی قوتابخانە ڕەوشەکەی هێورکردەوە، کەواتە پەروەردە ناوەندێکی گرینگ بوو بۆ دەرکەوتنی زمانی کوردی لە پەروەردەدا.

## پەراوێزەکان:

١. سەیری ل٤٥-٦٩ی کتێبی شکستی حوکمرانی کورد لە سەدەیەکدا ١٩١٩-٢٠١٩ بکە.
٢. ئینگلیز لە کردنەوەی قوتابخانەش ستەمی لە کورد دەکرد.
٣. قسەکردن لەگەڵ پەروەردەی دەشتی هەولێر فەهمی صلیوە.

## سەرچاوەکان:


١. ئیدمۆنز، سیسیل ٢٠٠٤ کورد، تورک، عەرەب، و.گەوهەری. هەولێر: ئاراس.
٢. بەکر، سەلام ناوخۆش ٢٠١٨ کاریگەری قورئان لە سەر زمان و ئەدەبی کلاسیکی کوردی. هەولێر : لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی تەفسیر.
٣. بەکر، سەلام ناوخۆش ٢٠٢٠ ئیسلامفۆبیا و منەوەری کورد. هەولێر: نارین.
٤. بێشکچی، ئیسماعیل ٢٠٠٢ کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی، و. حەمە ڕەشید. سلێمانی: لە بڵاوکراوەکانی سەردەم.
٥. بوتانی، عبدالفتاح ٢٠٠١ مدرسة ١١ اذار کوردیة فی مینة الموصل. اربیل.
٦. تەقی، ئەحمەد ١٩٧٠ خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا. بەغدا: چاپخانەی سلمان ئەلئەعزەمی.
٧. خواجە، ئەحمەد ١٩٦٨ چیم دی، بەرگی یەکەم. بەغدا: شەفیق.
٨. حیلمی، ناهیدە ٢٠٠٥ بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی. سلێمانی: لە بڵاوکراوەکانی حکومەتی هەرێم.
٩. مائی، انور ١٩٦٠ الاکراد فی بهدینان. الموصل.
١٠. مەزهەر، کەمال ١٩٨٣ شۆڕشی بیست، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٠، ل٢١-٣١.
١١. عەبدولقادر، نەهرۆ موحەمەد ٢٠١٢ هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩١٨ -١٩٢٦. هەولێر: چاپخانەی موکریانی.
١٢. کاکەسور، موحەمەد ٢٠٠٣ گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عێراق دا، دکتۆرانامەی چاپنەکراو، ئاداب \ سەلاحەدین.
١٣. هاوار، م.١٩٩٠ شێخ مەحمودی قارەمان، بەرگی یەکەم. لەندەن.
١٤. گۆڤاری کاروان، ژ.١٠ ، ١٩٨٣.
١٥. گۆڤاری توێژەر، ژ.٢ ، ٢٠١٨، گۆڤاری ڕامان، ژ.٢٦٠ ، ٢٠١٩.

# ڕێسای پەروەردەی هەرێمی کوردستان و مەرامە نیۆلیبڕالیەکان






**پەشێو م. نوری - زانکۆی مۆناش، ئوستراليا**

قوتابی دکتۆرایە لە ڕێسای پەروەردەیی و پەیوەندیەکانی نێوانی مامۆستا و ڕێسای پەروەردەیی لە زانکۆی مۆناش لە ئوستراليا. ماستەری لە مەنهەج و فێرکردن هەیە لە زانکۆی سینسیناتی لە ئەمریکا. مامۆستا بووە لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی تیشکی نێودەوڵەتی (ئیشک).




## پێشەکی

لەم نووسینە شیکارییە، نیەتمە ئاماژە بە ڕەنگدانەوەی چەند مەرامێکی نیۆلیبراڵی لە ڕێسای پەروەردەی هەرێمی کوردستان-عێراق بکەم. بۆ ئەمەش سوود لە سێ چەمکی دیاری بواری لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی وەردەگرم و وەکو ئامرازێکی شیکاریی بەکاریان دەهێنم کە ئەوانیش ‹جیهانگیری› و ‹بەئەورووپاییکردن› و ‹بەنێودەوڵەتیکردن›ن. سەرەتا ‹نیۆلیبرالیزم› وەکو چەمکێک دەناسێنم و ئەو شوێنانە دەستنیشان دەکەم کە لێیەوە دەستلەملانی مەجال و مامەڵە پەروەردەییەکان بووە. پاشان، باس دەخەمە سەر جیهانگیری (عەولەمە) وەکو وەسیلەیەکی هاوچەرخ بۆ بە پایانگەیاندنی و پەرشکردنی ئەم مەرامە نیۆلیبرالیانە، لەکۆتاییدا هەردوو چەمکی ‹بەنێودەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن› بەکاردەهێنم بۆ دەستنیشانکردنی ئەو پرۆژە و ڕێسا پەروەردەییانەی هەرێمی کوردستان کە بەرجەستەکاری مەرامە نیۆلیبرالیەکانن و وەکوو نموونەی زیندو و کارای نیۆلیبرالیزم لە پرۆسەی پەروەردەی فەرمی هەرێمی کوردستان دەستنیشانیان دەکەم.

بەڵام پێمخۆشە لە سەرەتا چەند چەمکێک کە لە درێژەی ئەم نووسینە دووبارە دەبنەوە، پێناسە بکەم. بە نموونە چەمکی ‹ڕێسای پەروەردە› کە پێی مەبەستم (Education Policy) زمانی ئینگلیزیە و لە زمانی عەرەبی و کوردی بە ‹سیاسەتی پەروەردە› پێناسە کراوە. بەڵام من پێم باشە لە جیاتی ‹سیاسەت›ی پەروەردە ‹ڕێسا›ی پەروەردە بەکاربێنم، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە ‹سیاسەت› وەکو وشە لەنێو عەوامی ئێمە بە ‹حیزبایەتی› لکێنراوە، لەگەڵ ئەوەش دەمەوێ خۆم لەو لێتێکچون لە نێوان policy و politics ڕزگار بکەم کە لە زمانەکانی کوردی و عەرەبی دیسان بە ‹سیاسەت› وەرگێردراون. جا من لێرە مەبەستم (Education Policy) ە کە بە ڕێسای پەروەردە وەریدەگێرم، کە ئەویش بە جۆرەها شێواز و لە پەنجەرەی جیاجیاوە پێناسە کراوە. بەڵام من مەبەستم پێی هەمو ئەو بنەما، و یاسا (قانون) و ڕێبەریی و ڕێبەندانەیە کە دەستەیەکی خاوەن دەسەڵات دەریدەکات بۆ بەڕێوەبردنی سیستەمێکی پەروەردە.

هەروەها، وشەی ‹گشتی›م لە جیاتی ‹حکومی› بەکارهێناوە. بە نمونە دەڵێم ‹قوتابخانەی گشتی› یا ‹کەرتی گشتی› لە جیاتی ‹قوتابخانەی حکومی› و ‹کەرتی حکومی›. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە من باوەڕم وایە هەروەک چۆن حکومڕان و دەسەڵات و بەڕێوەبەران پێکهاتون لە خەڵک، بەهەمان شێوەش حکومەت و دەسەڵات و بەڕێوەبردن لە پێناو خەڵکە. واتە ئەم دوانە بەرامبەر یەکتر نین بەڵکو لەگەڵ یەکترن. دوو دەستەی دژیەک نین، بەڵکو هاوڕێ و هاوشان و هاکاری یەکترن. یەک ئەوەیتر ناچەوسێنێتەوە بەڵکو هۆکاری خزمەتی یەکترن. جا بەم پێیە بێت، هیچ دەستەیەک نابێتە خاوەنی مولکێک، بەڵکو هەموشتێک هی هەمووانە (گشتە). بۆیە لای من حکومەت خاوەنی قوتابخانە و پەروەردە نییە تاوەکو قوتابخانە ‹حکومی› بێت، بەڵکو قوتابخانە و پەروەردە هی گشتە و بۆ گشتە. جا من لێرەوە بە ‹قوتابخانەی گشتی› یا ‹کەرتی گشتی› ناویان دێنم. لەوانەیە بپرسی جا بەم پێیە بێت جیاوازی ‹کەرتی تایبەت› چییە؟، من دەڵێم جیاوازیەکەی لە ناوەڕۆکی ئەم نووسیەنەیە. لەگەڵم بەردەوام بە.

### ١. دونیای نیۆلیبراڵ و بە کەرەستەکردنی پەروەردە

نیۆلیرالیزم لە دیدی فیۆنا پاتریک (Patrick, ٢٠١٣)، بریتییە لە «ئایدیۆلۆژیایەکی بەهێز و زاڵی سیاسی کە ئامانجی گواستنەوەی کۆنترۆڵی ئابوورییە لە چنگی حکومەتەوە بۆ بازاڕی تایبەت» (لا٢). لە چوارچێوەی فکری نیۆلیرالیزم، بازاڕ دەبێتە

بنەمای بنچینەیی بۆ بڕیارە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. بەمەش زەمەنی نیۆلیبراڵ زەمەنێکە گشت کایە و لایەنێکی ژیانی مرۆڤ بە کەرەستە دەکات و وا دەکات بازاڕ و سەرمایە لە کەشوهەوای هەر مامەڵەیەکی سیاسیی و هەر قوژبنێکی کۆمەڵگای مەدەنی باسی سەرەکی بێت. لە بەکەرەستەکردنیان، ئەدگارێکیان پێبدەبەخشێ کە قابیلی کڕین و فرۆشتن بن. ستیڤن بۆڵ (Ball, ١٩٩٨) بە دوو وشە ناواخنی نیۆلیبرالیزممان بۆ دەخاتە بەردەم کە بە ‹ئایدیۆلۆژیاکانی بازار› ناوی دەبات. لەمەش ئەولاتر و بەگوێرەی دیدی ڕۆهیت چۆپرا (Chopra, 2003) بێت، ئەم مەوجی نیۆلیبرالیزمە لە گوتارێک و کردەی هەژمونیی دەرچوە و بوەتە عەقیدەیەکی مناقەشەهەڵنەگر، بەشێوەیەک کار دەکات وەک ئەوەی حەقیقەتی بێ لەکە بێت.

لە ئێستادا بە دوورونزیک هەموو دەستتێوەردانێک لە ڕێسای و پرۆگرامی پەروەردەیی، و ئەرک و ماف و بەرپرسیاریەتی ئەکتەرە پەروەردەییەکان مەرامێکی بازاڕیی و بە کەرەستەکردنی لە پشتەوەیە. مەعریفە (وەکو ناوەڕۆکی مەنهەج) و ئەکتەرە پەروەردەیەکانیش (بە تایبەتی مامۆستا و فێرخواز) نوێنەری سیمبولیی شتومەک و کەلوپەلن. لە دیدی هەردو کۆمەڵناس و بیرمەندیی پەروەردەیی نیوزلەندی (James Reveley و Michael A. Peters 2014)، ژیری هەریەک لە کارەکتەرە پەروەردەییەکان (کە ئەوان بە کرێکاری مەعرفیە ناویان دەنێن) گرنگترین سەرچاوەی بەرهەمهێنانن لەم دونیا نیۆلیبراڵە. پێیان وایە، یەکەی بەرهەمهێنان لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵگا دایە، بۆیە ڕۆڵی قوتابخانەکان بریتییە لە پێگەیاندنی ئەم تاکانە و گەشەدان بە ژیری و توانستەکانیان بۆ گەشەسەندنی سەرمایەی مرۆیی. کەواتە بەهای مەعریفە لەم جۆرە دونیابینیە، لە بەکارهێنان و قابیلی بەکارهێنانی مرۆڤە بۆ پەرەدان بە سەرمایەی مرۆیی وڵات. ئەم زەمەن و دیاردەیەش لە ئاستی ناوخۆیی و سنوری وڵات تێپەڕیوە و بوە بە دیاردەیەکی جیهانی کە جیهانگیری (گلۆبالیزم یاخود بەگلۆباڵکردن، هەروەها بەنێودەوڵەتیکردن و بە ئەورپیکردن) وەکو میکانیزمێک بووە بە وەسیلەی بەئەنجامگەیاندنی ئەم مەرامە نیۆلیبرالیانە. دواتر دەگەڕێینەوە سەر بابەتی جیهانگیری.

لێکۆڵینەوەی زۆر هەن (بە نموونە ;Ball, 2009 Robertson et al. 2012; Verger, Fontdevila, and Zancajo 2017) سەلمێنەری ئەوەن کە پەروەردە لە زەمەنێکی نیۆلیبراڵی وەکوو ئەوەی ئێستامان، بە کەلوپەل کراوە. واتە پەوەردەش وەکوو هەر یەکێکی تر لە خزمەتە کۆمەڵایەتی و ناکۆمەڵایەتییەکان بەهایەکی ماددی هەیە بۆ کۆمەڵ، و لایەنە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیەکەی پەروەردەی وەلا ناوە. بە نمونە، توانست و کارامەیی مامۆستایەک کە بتوانێ وانە بەشێوەیەک بڵێتەوە ئاسان بێت بۆ تێگەیشتن یا ئەوەتا ببێتە هۆی ئەوەی قوتابیەکانی نمرەی بەرز بهێنن، ئەم توانست و کارامەییەی وا دەکات ئەم مامۆستایە وانەی تایبەت بڵێتەوە. یا ناوەندی پەروەردەیی تایبەت ڕاوی دامەزراندنی دەکەن. نرخی وانەی تایبەتی هەر مامۆستایەکی ئاوا دەکەوێتە سەر ئەم ‹کارامەیی و توانست›ەی بۆ بەرزی نمرەی قوتابیەکانی. نرخی وانەوتنەوە بەرزترە، گەر مامۆستایەکی کارامەتر بێ. بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەربارەی ئەم دیاردەیە لە عێراق و هەرێمی کوردستان زۆر دەگمەنن یا هەر نییە! (من خۆم تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەک ئەکادیمی زانستیم نەبینیوە لەم بارە).

بەگوێرەی لێکۆڵەر و پیتۆڵانی ڕێسا و سیاسەتی پەروەردە (Rizvi, F., & Lingard, B., 2009) گۆڕانێکی جیهانی هەیە کە بەهای پەروەردە لە بەرئەنجام و بەرهەمە بازاڕیەکەی دەدۆزێتەوە. ئەمەش وا دەکات زۆر بەئاسانی بەها نیۆلیبرالیەکان بە باشترین

شێوە لە پرۆژەی بەتایبەتکردنی پەروەردە خۆی تەجەللا بکات. لە گوتاری ڕێسای پەروەردەییش (بە نمونە لە وتار و قسەکانی وەزیری پەروەردە و سەرۆکی حکومەتان) ئەمەش جەخت کردنەوەیە لەسەر بنیاتنانی سەرمایەی مرۆیی وڵات گوایە بازاڕی نوێ، مەعریفە و زانیاری و کارامەیی تازەی پێویستە بۆ ئەوەی وڵات بتوانێ بگاتە ئاستی ئابووری جیهان و پێشبڕکێش بکات. یەکێ لە پرۆژە هەرە دیارەکانی پەروەردەی هەرێمی کوردستان کە نوێنەرایەتی ئەم جۆرە دونیابینیە دەکات و هەڵگری بەها و ناسنامەی زەمەنێکی نیۆلیبرالیە، پرۆژەی یاسای قوتابخانە تایبەتیەکانی ساڵی ٢٠١٢ی پەرلەمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو. ئەوەی ئەم یاسایە بەدوای خۆیدا هێنا، لێشاوێکی زۆری بێ چاودێریی قوتابخانەی تایبەت و سەنتەری تایبەتی فێرکردن بون. یەکێ لە ئامانجەکانی ئەم یاسایە ڕەخساندنی زەمینەیەک بو «بۆ کێبەرکێ لە بواری پەروەردە و فێرکردن بە مەبەستی پەرەپێدانی ئاراستەی گەشەپێدانی مرۆیی و داهێنانی زیاتر لە بوارەکانی پەروەردە و فێرکردن لە چوارچێوەی بەرنامە و سیستەمێکی نوێدا». جگە لەمە، ئەم یاسایە بوو بە هەلێک بۆ بازرگانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیی بۆ دروستکردن و بنیاتنانی بزنسی پەروەردەیی کە ئەمەش لە چوارچێوەی ‹قوتابخانەی تایبەتی بیانیی› و ‹قوتابخانەی تایبەتی نێودەوڵەتیی› ناو یاساکە خۆیان دەبینیەوە. نموونەیەکی تری ئەم مەرامە نیۆلیبرالیانە لە پەروەردەی هەرێمی کوردستان (بە تایبەتی لە خوێندنی باڵا) بەرهەمهێنانی گوتارێک و واقیعێکی ناچاریی وایە کە بابەتە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان دەکرێنە قوربانیی مەرامە ئابووریەکان. لە وادەی دەچونی پۆلی ٢٠١٧ی زانکۆی سەلاحەدین، ڕاگری کۆلێژی ئەندازیاریی ئەم زانکۆیە بە شانازیی و متمانەوە پێشنیاریی لابردنی چەند بەشێکی خوێندن دەکات، گوایە ئەم بەشانە یاخود ئەم جۆرە مەعریفەیە، بە قسەی خۆی «هەست دەکەم بازاڕی کاری نییە» (ئیبراهیم حمەڕەش، حوزەیران ی ٢٠١٧). د. ئیبراهیم حمەڕەش ئەم بەشانە بە نموونە دێنێتەوە (مێژوو، و فەلسەفە، و زمانی عەرەبیی، و خوێندنی ئیسلامیی)، و داوا دەکات «زانکۆکان جورئەتی ئەوەیان هەبێ دایانخەن». ئەم جۆرە لە ووتار و پێشنیارە بەرهەمی کەش و گوتارێکی ئاوای وەکوو نیۆلیبرەلیزمە. جا گەر لە زاری دەسەڵاتبەدەستێکەوە بێت، ئەمە بە کرداربوونی ئەم بەهایانە. جا دەکرێ لێرە بپرسین، فکری ئاوا چۆن خۆی لە شوێنکاتی کوردیی ڕۆژهەڵاتی دۆزیوەتەوە؟ بۆ ئەمە پێویستە باس بخەینە سەر جیهانگیری. کە لەم بەشەی خوارەوە درێژەی پێدەدەم.

## ٢. جیهانگیریی و سەفەری ئایدیۆلۆژیا

بەدرێژایی مێژوو، دەسەڵاتە خۆسەپێنەکان، بزاوتی ئایینی، یاخود هێڵ و کاری بازرگانی، هەریەکەیان بەشێوازی جیاجیا ڕێبازی تابیەت و هەمەجۆری بەکلتورکردن و فێرکردن و فێربونی لەگەڵ خۆی هێناوە. هەرە دیارەکانیان ئەوانەی سەدەکانی ١٩م و ٢٠من، ئەو کاتەی دەسەڵاتە داگیرکارەکان (کۆلۆنی) سیستەمە پەروەردەییەکانی رۆژئاوایان بە جیهاندا گواستەوە. بەڵام پەروردە لە ناوەڕاستی سەدەی ٢٠مەوە بوو بە بابەتێکی جیهانی بۆ ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان. دامەزراندنی ’یونێسکۆ‘ و بڵاوکردنەوەی ‹جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ› سەردەمێکی نوێیان بۆ ڕێسا و سیاسەتی جیهانی دەستەبەرکرد کە لەم ڕێیەوە ئاسانکاریی بۆ ڕێکخراوی جیاجیا و زلە و زۆروزەبەند کرا تاوەکو کاریگەریی بخەنە سەر سیستەمە پەروەردەییەکان و ستانداردی جیهانی بۆ پەروەردە دامەزرێنن (Mundy, Green, Lingard, & Verger, 2016). بەمەش سەردەمێکی نوێی زادە و دەستەمۆی هزر

و ئایدیۆلۆژیای جیاجیا دەرئەنجامی جیهانگیری (عەولەمە) بوون. وای لێهات هەرچی ڕیفۆرمی پەروەردەیین بوون بە بەرسڤێکی ناچاریی ئەم سەردەمە نوێیە. بەڵام ‹جیهانگیری› چییە؟ لێرە پێویستدەکات پێناسەی جیهانگیری بکەین. من نامەوێ لەم نووسینە بچمە ناو گەنگەشە جیاجیاکان دەربارەی جیهانگیری و ڕەهەندەکانی. بەڵکو، بە پشتبەستن بە پێناسەکەی دەیڤد هێڵد (Held, D. ١٩٩٩) بەردەوامی بە گەنگەشەی ئەم بابەتە دەدەم. بەپێی بیروڕای دەیڤد هێڵد، جیهانگیری؛

پرۆسەیەک (یاخود چەند پرۆسەیەک)ە کە بەرجەستەکاری وەرچەرخانێکە لە پەیوەندی و مامەڵە کۆمەڵایەتییەکان. ئەو پەیوەندی و مامەڵانەش بە درێژمەودایی و چڕیی و گوڕ و کاریگەریەکانیانەوە هەڵدەسەنگێنێ. لەگەڵ ئەمەش چەندان ڕێڕەو و تۆڕی چالاکی، و کارلێکردن، و بەکارهێنانی هێز لە شوێنکاتی نێوهەرێمی و قارەبڕی دروست دەکات. (لا.١٦).

ئەمڕۆ، حکومەتە جیاجیاکانی وڵاتانی جیهان بەردەوام مژۆڵی ئەوەن کە چۆن کاری پەروەردەی وڵاتیان بەجێ بهێنن. پەیوەندییەکانی نێوانی نیۆلیبرالیزم و جیهانگیری پەیوەندیەکی تەواوکارن. جیهانگیری بەم هێز و گوڕەی کە هەیەتی بەسەر مامەڵە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەک لە پێناساکەی سەرەوە دەردەکەوێ؛ هەروەها نیۆلیبرالیزمیش بەم هەژموون و گوتارەی کە بەئاسان تێکەڵ بە قەناعەت و دیدگای تاک دەبێ، کاردانەوە و وەڵامدانەوە ناچار دەکەن.

ئەوەی کە لە ناخی جیهانگیری شاراوەیە، سیستەمێکی ناچاریی بە نێودەوڵەتیکردنی سیستەمە پەروەردەییەکانە. یەکێک لە جۆرەکانی قوتابخانەی تایبەت لە یاسای قوتابخانە تایبەتەکانی پەرلەمەمانی کوردستان، ڕێگەدان و بە کردنەوەی ‹قوتابخانەی تایبەتی نێودەوڵەتیی›. کە ئەمە ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەوخۆی مەرامی نیۆلیبراڵیزمە. بەتایبەتکردنی بەرژەوەندیی تاک لە ئاستی ناوخۆیی، و کشانەوە لە بەرپرسیاریەتی گشتی لەلایەنی حوکمڕان و پاشان دەستەوسانبوون لە بەنێودەوڵەتیکردنی سیستەمی فێربوون و فێرکردن و بەڕێوەبردن. دەرئەنجامێکی تری ناچاریی ئەم دەستەوسانبوون و خۆبەدەستەوەدانە بە جیهانگیری، تەکاندنی دەسەڵاتە لە ناوەندێکی حوکمڕان و سەپێن بۆ دەستە و یەکە ناحکومیە تایبەتەکان. ساجید عەلی (Ali، ٢٠١٧) لە لێکۆڵینەوەکەی ئەمە ڕووندەکاتەوە کە جیهانگیری دەسەڵاتی نەریتیانەی دەوڵەت (واتە، یەکەی حوکمڕان)ی لە ڕەگەوە گۆڕیوە کە بەسەر پرۆسەی دانانی ڕێسا و یاسا پەروەردەیی هەیبوو. چونکە ئیتر دەسەڵات بەشێوەیەکی موتلەق و گشتی لەدەستی یەکەی حوکمڕان نەماوە، بەڵکو ئەم دەسەڵاتە پشکی جیاجیای دەکەوێتە دەست چەند یەکەیەکی تری نیشتمانیی و نێودەوڵەتیی. ئەم دیاردەیە لە کەرتی تایبەتدا زۆر زەقترە. هەروەک (Rizvi, F., & Lingard, B., ٢٠٠٩) زۆر بە ڕوونی ئاماژەیان پێداوە. بابەتی متمانەبەخشینی نێودەوڵەتیی (accreditation) و پرۆسەی بۆلۆنیا و پرۆژەی دڵنیایی جۆری لە خوێندنی باڵای هەرێمی کوردستان (بە گشتی و تایبەتیەوە) نموونەی دیاری پەرش و بەشبوونی ئەم دەسەڵاتەیە.

بەشبوون و لەناوەند- دەرچونی دەسەڵات لە دەرئەنجامی ئەم پرۆسە خاوەن-هێز و سنووربەزێنەی جیهانگیری، وەکوو لە پێناسەکەی سەرەوە دەردەکەوێ، وا دەکات دەزگا ناحکومیە پەروەردەییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ لە ئاستێکی نێودەوڵەتی چالاکتر بن و مارکێتەکانیان بەرفراوانتر کەن. ئێستاش کە دەیبینین، مۆری پێشکەوتویی و ‹مۆدێرن›بوون و سەرنجڕاکێشبوونی هەر سیستەمێکی پەروەردەیی، وا لەدەستی دەزگا و ڕێکخراوی زەبەلاحی نێودەوڵەتی پەروەردەیین. هەربۆیە قوتابخانە تایبەتیەکان هەمیشە هەوڵ

دەدەن بۆ؛ بە دەستهێنانی متمانە (accreditation) لەم جۆرە دەزگایانە، و بنیاتنانی پەیوەندی، و دروستکردنی پرۆژەی هاوبەش لەگەڵیان. ئەمە لە ئێستادا کەسێکی دیاری قوتابخانە و زانکۆ تایبەتەکانی کورستانە. ئەگەرچی لە کوردستان هێشتا زۆر لەسەرەتای ئەم پرۆسەیەین. چونکە هەروەکو عەبدولڕەحمان ئەحمەد (٢٠٢٠) تێبینی ئەوەی کردوە کە «خەسڵەتی نەگۆڕ»ی پەروەردەی فەرمی هەرێمی کوردستان لە سوڕانەوەیە بەدەوری چەقێک کە ئامادەی جوڵەکردن نییە. واتە، بەهێزکردنەوە و چڕترکردنەوەی ڕێکارە بیرۆکراسییەکانی پرۆسەی پەروەردە بوەتە پێوەر بۆ هەموو ئەو هەولانەی کە دەدرێن بۆ گۆڕان و بەرەوپێشبردنی پەروەردە. لە جیاتی ئەوەی پەروەردە و فێربوون بکرێتە پێوەر بۆ پرۆسەی پەروەردە.

نموونەی دیاری وەڵامدانەوە بۆ فشارەکانی جیهانگیری زۆرن. دیارترین دوو نموونە کە بەریەککەوتنی ڕاستەوخۆمان لەگەڵیان هەبن، ‹قوتابخانەکانی بزاوتی خزمەت› و ‹قوتابخانەکانی سابیس›ن لە هەرێمی کوردستان. هەریەکەیان تۆڕێکن ئاستێکی بەرفراوانی قاڕەبڕ و زمان و نەریت و کەلتور پەڕن. لە هەمان کاتیشدا بە نموونەی یەکێک لەو چوار گرووپی ‹هاوپەیمانی زاڵ› لەقەڵەم دەدرێن کە گرامشی بە ‹پۆپۆلیزمی دەسەڵاتدار› لە تیۆریای ‹بلۆکی هەژمونی نوێ› ناویان دەبات (Apple, Oct ٢٠١٦).

پرۆژەی تری زۆر هەن بۆ ئەوەی وەکوو نموونە بیانهێنمەوە کە سەلمێنەری ئەم چەند خاڵەی سەرەوە بن. بەڵام لێرە ئەوەندە بەسە کە بیسەلمێنین جیهانگیری وەسیلەی گواستنەوەی ئایدیۆلۆژیا گلۆباڵیەکانە و هەرێمی کوردستانیش بێ بەش نەبووە لە بەرکەوتنی. بۆ زیاتر تیشک خستنە سەر ئەم بابەتە، لە بەشی داهاتوو دوو چەمکی دیاری دونیای لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی دەخەمە بەر باس. ئەم دوو چەمکەش ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن›ن.

٣. دوو چەمک و دونیای پەروەردەی کوردی: بەنێوەدەوڵەتیکردن و بەئەورووپاییکردن

یەکێکی تر لە بەرئەنجامە ناچاریەکانی دونیای پەروەردەی زەمەنێکی نیۆلیبراڵ و دەستەمۆی جیهانگیری، هەردو دیاردەی ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن›ن. وای بۆ دەچم ئەمانە دوو چەمکی نوێ بن لە لێکۆڵینەوەی کوردی. بەڵام لە بینینی من کورد بەریەککەوتنێکی مێژوویی هەیە لەگەڵیان. پرۆژەکانی یونێسکۆ لەبواری پەروەردە ئاسانترین نموونەن بۆ ئاماژەپێدان. ئامانج لە دۆزینەوەی پەیوەندیەکانی نێوان جیهانگیری و (بەنێوەدەوڵەتیکردن و بەئەورووپاییکردن)، هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لەو هۆکارە دەرەکیانەی کە کاریگەری دەخەنە سەر ناسنامە و بەها و بڕیار و ڕێسای دەزگاکانی حوکمڕانی پەروەردە. بە نموونە، وەزارەتی پەروەردە کە حوکمڕان و ڕێساڕێژی هەمو کردە پەروەردەییەکانە لە هەرێمی کوردستان. پێش ئەوە دەبێ بپرسین، چەمکی ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن› چین؟ وەکو چەمک و گوتار ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن› هاومانای ‹جیهانگیری›ن، بەڵام ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن› زیاتر خۆیان لە گوتاری پەروەردە و ڕێسای کۆمەڵایەتی دەبیننەوە. بۆ زیاتر زانیاری سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە (Dale & Robertson, ٢٠٠٩).

بەنێوەدەوڵەتیکردن ئاماژەدانە بە بەیەکەوەلکان و پابەندبونی خەڵک و دەزگاکان بەیەکەوە لە ئاستێکی جیهانی. لە هەمان کاتیشدا، بەنێوەدەوڵەتیکردن وەسیلەیەکی گاریگەر و ڕاستەوخۆی بە جیهانیکردنی ناوخۆییەکانە. لە پەروەردەی فەرمی هەرێمی کوردستان، بۆشایی و هەلی بە نێودەوڵەتیبون بە ئەدگارێکی ئەرێنی

پەروەردەی سەردەم لە قەڵەم دەدرێت. ئەمەش لە وتارەکانی وەزیرانی پەروەردە وخوێندنی باڵا و هەروەرها وتاری سەرۆکی حکومەتی هەرێم لە کردنەوەی دەرگای قوتابخەنەکان و سەرۆکی حکومەتی هەرێمی پێشوش، زۆر بە ڕوونی دەرکەوتوە. پێشتر ئاماژەمان بەجۆرەکانی قوتابخانەی تایبەت دا لە یاسای قوتابخانە تایبەتیەکانی پەرلەمانی کوردستان. یەکێک لە جۆرەکانی ڕێگەدان، ڕێگەدان بوو بە کردنەوەی ‹قوتابخانەی تایبەتی نێودەوڵەتی›. دەکرێ ئەوەش بە تێبینی وەربگرین کە لە یاساکەدا، بەهیچ شێوەیەک پێناسەی ‹قوتابخانەی نێودەوڵەتی› لە چوارچێوەی ستاندارد و ڕێسا پێناسە نەکراوە.

زۆر تا کەم، پێدانی مۆرکی نێودەوڵەتی بەردەوام لەلایەن ئەو وڵاتانەوەیە کە ئینگلیزی زمانن، یا ئەوەتا ئەوروپین. ئەمە خۆی لە خۆیدا مایەی تێڕامان و شیکردنەوەیە. مایەی پرسیارخستنە سەر توانستی داهێنانکاریی و متمانەی خودی خۆمانە. ئەو دەزگایانەی کە متمانەبەخشین (accreditation) ئەنجام دەدەن یا ئەوانەی کە پێداویستی و سەرچاوە بۆ قوتابخانەکان دابین دەکەن لە هەرێمی کوردستان، زۆربەیان بیانین. بە نموونە دەزگای ASIC کە متمانەبەخشی چەند قوتابخانە و زانکۆیەکی هەرێمی کوردستان بوە و بە ‹نێوەدەڵەتی›یان کردوون. وەکو قوتابخانەکانی کامبردجی نێودەوڵەتی لە پیرمام، کامبردجی نێودەوڵەتی لە هەولێر، فینلەندیی نێودەوڵەتی لە هەولێر، ڕۆناکیی کوران و کچان لە هەولێر، یونایتد ساینس لە سلێمانی، و هەردوو زانکۆی تیشک و زانکۆی کوردستانیش لە هەولێر (بە گوێرەی وێبسایتی ئایزک، ٢٠٢٠ - www.asicuk.com). یاخود ئەو دەزگایانەی کە کاری چاپکردن بۆ وەزارەتی پەروەردە دەکەن. جگە لەمەش، هەڵسەنگاندن و لیکۆلینەوەی پەروەردە لەلایەن وەزارەتی پلاندانانەوە دراوەتە دەست دەزگای ڕاند لەساڵی ٢٠١٦. کە ئەمەش دەزگایەکی ئەمریکی نێودەوڵەتییە. ڕاپۆرتی لێکۆڵینەوەکە لە سەرچاوەکان دانراوە (Vernez, G., Culbertson, S., Constant, L., & Karam, R. ٢٠١٦).

لەلایەکی ترەوە، بەئەوروپاییکردن (هاوشانی ‹بەڕۆژئاواییکردن›) بریتییە لە پرۆسەیەک کە لە ڕێگەیەوە بە بەکارهێنانی میکانیزمی جیاجیای پەروەردەیی و ناپەروەردەیی ئەدگاری ئەوروپی بە کولتور، ناسنامە، زمان، شار و خەڵک، و ڕێبازی کارکردن دەبەخشێت. جیاوازیەکی تری بەئەوروپاییکردن لەگەڵ جیهانگیری لە بیروڕای تاڤیس جولس (Jules, ٢٠١٠) ئەوەیە کە بەئەوروپاییکردن دەرئەنجامی هەرێمگەرایی یەکێتی ئەوروپایە و یەکەیەکی بەرگریە بۆ ڕەتکردنەوەی بەرەنگاریەکانی جیهانگیری لە هەرێمی ئەوروپا. بەڵام من پێم وایە لە ئێستادا و بەو دەستتێوەردانانەی ئەوروپا لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجامیان دەدات، ئەم ‹یەکەی بەرگری›ە بوە بە وەسیلەی هێرشکردن و بەردەوامیدان بە برەودان بە بەها (پەروەردەیی، سیاسی، ئابووری، و کەلتووری)ە ئەوروپییەکان لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لیکۆڵینەوە هەن کە ئەم جۆرە دەستتێوەردانە لە کاروباری وڵاتانی ڕۆژهەڵات بە درێژەدان بە پرۆژە داگیرکاریەکان (کۆلۆنی) لە قەڵەم دەدەن. ئاغایەتی و خاوەن دەسەڵاتی و زاڵی ڕۆژئاوا دەخەنەڕوو. ئەم دەستتێوەردانانە لە دیدی تاڤیس مۆدێلێکی ئەورپاسەنتەریی وایە کە چالاکییە ئابووریەکانی بەهەند وەردەگرێ و ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکان وەلا دەنێت. ئەمەش دوبارە گەڕانەوەیە بۆ مەرامی نیۆلیبراڵی لەم جۆرە پرۆژانە.

تازەترین پرۆژە کە ڕەنگدانەوەی ئەم قسانەی سەرەوەن، پرۆژەی ‹بنیاتنانی تواناکان لە خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی-باشترکردنی کواڵیتی و

یەکسانی› یەکێتی ئەورپایە و لەلایەن British Council کە ڕێکخراوێکی سەر بە حکومەتی بەریتانیایە. خەرجی ئەم پرۆژەیە ١٤ (چواردە) ملیۆن یۆرۆیە و لەلایەن یەکێتی ئەورووپاوە بۆی دابین کراوە. ئەم پرۆژەیە بە هەڵە بە (سیستەمی بریتش کاونسڵ) لە کوردستان ناوی نراوە. بەگوێرەی وێبسایتی بریتش کاونسڵ بێت (British Council, ٢٠٢٠ لە لیستی سەرچاوەکان دانراوە) لەڕێگەی ئەم پرۆژەیەوە چوارچێوەی کاری سەرپەرشتی پەروەردەیی گۆڕاوە و بوە بە پرۆسەیەک کە مەبەست تێیدا هەڵسەنگاندن بێ بە نیازی چاکترکردن و بەرەوپێشبردن، نەوەک تەنها پشکنین (تفتیش)کردن بێ و بەس وەکو کە پێشتر کردەی باو بوە. لەگەڵ ئەمەش ڕاهێنانی مامۆستایان و بەرەوپێشبردنی مەنهەج دەکەوێتە چوارچێوەی کاری ئەم پرۆژەوە. بەڵام جێی سەرنجدان ئەوەیە، لەناو پەروەردەکار و پیتۆڵ و لێکۆڵەران و میدیای پەروەردەیی هەرێمی کوردستان، لە کار و پرۆژەی ئاوادا ئەوەی کە نابێتە مایەی گفتوگۆی پەروەردەیی مەرام و نیازەکانی پشت ئەم جۆرە پرۆژانەیە. چونکە دەستەوسانیی و خودلەبیرکردن و لە بەرامبەردا ‹مۆدێرن› بوون و ڕوکارئەرێنی سروشتی جیهانگیریی و ‹بەنێودەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن›ن. ئەمەش دەکرێت لە دەرئەنجامی ئەو ‹تێچوی عەتفی›ە بێت کە جیهانگیری هەیەتی (Elliott and Lemert, ٢٠٠٩). چونکە لەلای ئیلێت و لێمێرت جیهانگیری؛

أ. هەم ئەوە دەگۆڕێت کە ئێمە چۆن تێکەڵاوی دونیامان دەبین و چۆن ئەزموونی دونیامان دەکەین، هەمیش چۆن ئەزموونی خودی خۆمان دەکەین،

ب. چۆنیەتی قسەکردنی خەڵک دەگۆڕێ لەوەی کە چۆن باس لە خۆیان و غەیری خۆیان دەکەن،

ت. هەروەها هۆشیاری و نەریت و میزاج و کاریگەریەکانی خەڵک دەگۆڕێت.

لە کۆتایی ئەم بەشە، پێم باشە بە لیستێک ئاماژە بەو پرۆژە و ڕێسا پەروەردەییانەی پەروەردەی فەرمی هەرێمی کوردستان بدەم کە، بە دیدی من، هەم دەرئەنجام و هەم نوێنەرایەتی مەرامە نیۆلیبرالیەکان و هەم جیهانگیری و ‹بەنێودەوڵەتیکردن› و ‹بەئەورووپاییکردن› و ‹بەرۆژئاواییکردن› دەکەن. بێگومان دەکرێت هەمان گەنگەشە بۆ ‹بەئەمەریکیردن›یش لە دیدگایەکی کۆمەڵناسی پەروەردەوە بکرێت.

١. یاسای قوتابخانەی تایبەتی پەرلەمانی کوردستان و لێشاوی قوتابخانەی تایبەت و خوێندن بە پارە.

٢. تاقیکردنەوەی نیشتمانیی، و بە ‹هەڵبژراندن›کردنی پرسیاری تاقیکردنەوەکان، و بەکارهێنانی نمرە بۆ یەکلاکردنەوەی داهاتوی قوتابی (مرۆڤ).

٣. مامۆستای تایبەت لە دەرەوەی سنووری یاسای ئیداریی و ستانداردی پیشە و پابەندی ئەخلاقیاتی پیشەیی کاری مامۆستایی وەزارەتی پەروەردە. ئەم دیاردەیە پێی دەگوترێت (پەروەردەی سێبەر).

٤. پرۆەژی گۆڕینی مەنهەج؛ ١) کۆبیرخستە سەر وانەی ئینگلیزی و بیرکاری و زانستەکان، ٢) بە ئینگلیزی کردنی زمانی فێرکردن، ٣) زیادکردنی وانە و پەرتوکی (کارامەیی و بەها کۆمەڵایەتییەکان) لە پۆلی ١ەوە تاوەکو ٩ وەکو وەڵامێک بۆ دەستپێشخەری یونسێف لە پرۆژەی ‹فێربونی کارامەییەکانی ژیان و هاووڵاتیبون لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقا›.

٥. گوتاری وەزیری و سەرکردەکانی وڵات لە بەیەکەوە لکاندنی پەروەردە بە بازاڕی کار. نموونەیەکمان لەپێشتر ئاماژە پێدا.

٦. پرۆژەی ‹بنیاتنانی تواناکان لە خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی-باشترکردنی کواڵیتی و

یەکسانی› یەکێتی ئەوروپا. ئەوەی کە بە هەڵە لەناو ئەهلی پەروەردە بە ‹سیستەمی بریتش کاونسڵ› ناووبانگی دەرکردوە. بێگومان ئەم هەموو دەستتێوەردانە دەرەکیانە لە کایەی پەروەردەیی هەرێم و گورج و گۆڵی بەڕێوەبەرانی پەروەردەی هەرێم لە بەدەمەوە هاتنیان، زۆر شت دەربارەی توانستی داهێنانکاریی خۆمان دەڵێ! ئەم پرۆژەیە لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە لە ساڵی ٢٠١٥ەوە وەکو «پرۆژەیەکی ستراتیژی درێژخایەن» (بە گوێرەی کتێبی، ڕێبەری بەڕێوەبەرانی سەرکردە) ناسێنراوە.

٧.	کۆبونەوەی وەزیری پەروەردەی کابینەی نوێیەم لە کۆڕبەندی جیهانی پەروەردە لە مانگی ١ی ٢٠٢٠ لەگەڵ چەندە دەزگایەکی پەروەردەیی کە بە ئەکتەری نێودەڵەتی و یەکێک لە ئەدگارە دیارەکانی جیهانگیری لەقەڵەم دەدرێن. هەرلەوێش هەوڵی بەشداریکردنی لوتکەی ئاسیا دەدات. کە لوتکەی کۆبونەوەی وەزیرانی پەروەردەی وڵاتانە.

٨.	خۆبەدەستەوەدانی گوتاری پەروەردەیی بە کەشێکی زاڵی بازاڕیی و ڕیکلامگێڕی و بەتایبەتکردن. هەمو پێزانین و دانپییانان بە وجودی کەشێک و گوتارێکی پەروەردەیی لە کورتە ڤیدیۆیەکی بازرگانی دەبینرێتەوە، کە تێیدا زەردەخەنەی منداڵ و دەستی مامۆستایەک بەسەر پشتی فێرخوازێک (وەکو نیشانەیەک بۆ پەیوەندییە پەروەردەییەکانی ناو قوتابخانە) و چوستی مامۆستا لە کاتی وانەوتنەوە، هەوێنی سەرنجراکێشانی باوانێک و منداڵێکی موشتەرییە. ئەمەش غیابی گفتوگۆیەکی پەروەردەی لەئاستێکی نیشتمانی لەناو پەروەردەکاران و مامۆستایان و لێکۆڵەرانی پەروەردەیی لەگەڵ خۆی هێناوە.

٩.	سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەڕێز مەسرور بارزانی لە کاتی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان لە سەرەتای ئەم ساڵی خوێندن، لە پۆلێکدا چەند دەقەیەک قسە بۆ قوتابیەکان دەکات و سێ پەیام دەگەیەنێ. یەکێ لە پەیامەکانی پاراستنی ژینگە و پاک و خاوێنی هەوا بو. ئەم پەیامە وەکوو تموحی ڕێسارێژی پەروەردەیی سروشتێکی جیهانگیری و دەرئەنجامێکی دونیای نیۆلیبراڵە.

ئەمانە نموونەی پەروەردەی ئاستەکانی باخچەی ساوایان تا پۆلی ١٢ن. لەگەڵ ئەوەش خوێندنی باڵاش لە نیشانەکانی ئەم دیاردەیە پشکی شێری بەر دەکەوێ. چەند نموونەیەکم پێشتر ئاماژە پێدا، بەڵام ئەوە بۆ لێکۆڵەرانی خوێندنی باڵا بەجێدێڵم.

## کۆتایی

لەگەڵ زیاتر و زیاتر بە جیهانیبونی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوا، لە بەرامبەردا وڵاتە ڕۆژهەڵاتیەکانیش لە پرۆسەیەکی چاولێکەریی و لاساییکردنەوە کەوتونە پێشبڕکێی پێڕاگەیشتنیان. بیردۆز و چەمک و مۆدێلە ڕۆژئاواییەکان ئاوا جیهانیی بوین کە بونە بە بەشێک لە عەقڵی ناهۆشیاری تاکە نارۆژئاواییەکە و داڕێژەری بناغەی گوفتار و ڕفتاریەتی. ئەم دیمەنە لە دونیای پەروەردەی کوردی لە دەستەوسانبوونی داڕێژەری سیستەم و بڕیاربەدەستی پەروەردەی کوردستان دەردەکەوێ. هەروەک لەسەرەوە بە بەکارهێنانی چەمکەکانی جیهانگیری، بەنێوەدەوڵەتیکردن، و بەئەوروپاییکردن شیکاریان بۆ کرا.

دەمەوێ لە کۆتاییدا لێکۆڵەران (و خۆم) جێبێڵم لەگەڵ ئەم پرسیارانەی خوارەوە. هەریەک لە پرۆسەی ‹جیهانگیری› و دیاردەکانی ‹بەنێوەدەوڵەتیکردن› و ‹بەئەوروپاییکردن› مانایان چییە بۆ مامۆستا و کاری مامۆستایی؟ ژیانی ئەکادیمی و ژیانی شەخسی مامۆستا چۆن کەوتۆتە بەر چنگەکانی هەریەک لەم دیاردانە؟ کاریگەریی و بەرئەنجامەکانی هەریەک لەم دیاردانە چین لەسەر ناسنامەی مامۆستایەتی و پەروەردەکاریی مامۆستا؟ چین لەسەر بیر و ئەندێشەی پەروەردەیی مامۆستا؟ چۆن مامۆستای بنیاتناوە یا گۆڕیوە؟

# سەرچاوەکان


1.Vernez, G., Culbertson, S., Constant, L., & Karam, R. (2016). Initiatives to Improve Quality of Education in the Kurdistan Region-Iraq. RAND Education.

2. Verger, A., C. Fontdevila, and A. Zancajo. 2017. “Multiple Paths Towards Education Privatization in a Globalizing World: A Cultural Political Economy Review.” Journal of Education Policy 32 (6): 757–787. doi:10.1080/02680939.2017.1318453.

3. Tavis D. Jules. (2010). Globalisation and Europeanisation in Education by Roger Dale and Susan Robertson. Comparative Education Review, 54(1), 136-138. doi:10.1086/650707

4. Sajid Ali (2017) The sphere of authority: governing education policy in Pakistan amidst global pressures, Globalisation, Societies and Education, 15:2, 217-237, DOI: 10.1080/14767724.2015.1127575

5. Robertson, S. L., K. Mundy, A. Verger, and F. Menashy, Eds. 2012. Public Private Partnerships in Education: New Actors and Modes of Governance in a Globalizing World. Cheltenham: Edward Elgar Publishing.

6. Rizvi, F., & Lingard, B. (2009). Globalizing education policy. Routledge.

7. Peters, M. A., & Reveley, J. (2014). Retrofitting Drucker: Knowledge work under cognitive capitalism. Culture and Organization, 20(2), 135-151.

8. Patrick, F. (2013). Neoliberalism, the knowledge economy, and the learner: Challenging the inevitability of the commodified self as an outcome of education. ISRN education, 2013.

9. Mundy, K., Green, A., Lingard, B., & Verger, A. (Eds.). (2016). Handbook of global education policy: John Wiley & Sons, Ltd.

10. Ladi, Stella, Globalization and Europeanization: Analysing Change (December 2006). IBEI Working Paper No. 2006/4. Available at http://dx.doi.org/10.2139/ssrn.960767

11. Held, D., A. McGrew, D. Goldblatt, and J. Perraton. 1999. Global Transformations: Politics, Economics And Culture. Cambridge: Polity Press.

12. Hamarash, Ibrahim. (2017, July). Asty zansty derchwany zanko. YouTube, https://www.youtube.com/watch?v=UNS3--aaUDo

13. EU Schools Program (accessed 2020). Linkhttps://iraq.britishcouncil.org/en/eu-schools-program?fbclid=IwAR2d-BU7Kk09WBkDswIlpHNq8Jg5_aDF3fKOGRZSnhdinKZITXIUap1WoE

14. Elliott, A., & Lemert, C. (2009). The New Individualism: The Emotional Costs of Globalization REVISED EDITION. routledge.

15. Dale, R., & Robertson, S. (Eds.). (2009, May). Globalisation and Europeanisation in education. Symposium Books Ltd.

16. Chopra, R. (2003). Neoliberalism as doxa: Bourdieu›s theory of the state and the contemporary Indian discourse on globalization and liberalization. Cultural studies, 17(3-4), 419-444.

17. CEPS Ljubljana (12 Oct 2016). Michael W. Apple: Power, policy, and the realities of curriculum and teaching. YouTube https://www.youtube.com/watch?v=YcPv0Pk7Uqs

18. Ball, S. J. (1998). Big policies/small world: An introduction to international perspectives in education policy. Comparative education, 34(2), 119-130.

١٩. ڕێبەری بەڕێوەبەرانی سه رکردە: بنیادنانی تواناکان لە خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی- باشترکردنی کوالیتی و ی یەکسانی. ئامادەکردنی ئەنجومەنی ڕۆشنبیری بەریتانی.

٢٠. عەبدوڕەحمان ئەحمەد وەهاب. ٢٠٢٠. بەڵگەنامەکانی سیاسەتی پەروەردەیی چیمان پێ دەڵێن؟. کوردستان تایمز.

ئەگەر ئاوڕێک لە ڕابردووی زانین و زانست بدەینەوە لە مێژووی ئیسلامیدا، دەتوانین بەوپەڕی متمانەوە بڵێین کە مسوڵمانان لەوپەڕی پێشکەوتندا بوون لە ڕووی فێربوون و فێرکردن و زانستەکانەوە، خاوەنی چەندین قوتابخانەی زانستیی گەورە بوون لە پایتەخت و شار و شارۆچکەکانی ژێر قەڵەمڕەویاندا، پێشەنگ بوون لە داهێنانی چەندین زانستی نوێ و پێشخستن و فراوانکردنی چەندین زانستی تر. لە جیهانی ڕۆژئاوای ئەو کاتەوە کە نغرۆ بووبوو لە دواکەوتوییدا، خەڵک دەنێردرا بۆ فێربوون لە قوتابخانە و سوودوەرگرتن لە زانایانی ئیسلام. ئەمانە هەمووی لە مێژوودا چەسپێنراون و نەک خۆمان، بەڵکوو ناحەزانیش دانیان بەم ڕاستییانەدا ناوە.

بەڵام ئاریشەکانی گەلانی مسوڵمان لە ڕووی زانست و فێربوونەوە؛ کاتێک سەریان هەڵدا کە مسوڵمانان سیستمی ژیارییان تێک چوو و ڕۆژئاوا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پێش کەوت و ئارامیی بەخۆیەوە بینی لە ڕووی شەڕ و ئاشووب و کاولکارییەوە، ئەو کێشانە گوازرانەوە بۆ کۆمەڵگا ئیسلامییەکان. لە هەموو سێکتەرەکانیش زیاتر زیان بەم سێکتەرە گەشت، چونکە ئەم بوارە بوو کە تەنها مسوڵمانان بتوانن لە ڕێیەوە هەڵبستنەوە.

بەداخەوە هەژموونە ڕۆژئاواییەکە لەسەر مسوڵمانان ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر بوو، بە هۆی ئەو بیردۆزە خەلدوونییەی کە جەخت دەکاتەوە لەوەی کە گەلانی دواکەوتوو و ژێردەستە هەمیشە لاسایی گەلانی خاوەن ژیار و پێشکەوتوو دەکەنەوە، تەنانەت لە جلوبەرگیشدا دەیانەوێت وەک ئەوان بن. هەر بۆیە بواری فێربوون و فێرکردنیش خاڵی نەبوو لە لاساییکردنەوە و کاریگەربوون بە ڕووگە ڕۆژئاواییەکەوە، جیاکردنەوە لەنێوان زانستە ئایینی و بوارەکانی تری زانست وەک هەموو سێکتەرەکانی تری ژیان پیادە کرا، دەتوانین بڵێین ئەمە لە گەورەترین ئاریشەکانی ئەم بوارە بوو لەلای مسوڵمانان کە جیاکاری کرا لەنێوان بەها ئایینییەکان و ڕووگە دنیاییەکاندا، بە مەبەستی جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان. زانستە ئایینییەکان وا نیشان دران کە ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە ژیانەوە نییە و پچڕاون لە کاروبارە دنیاییەکان و واقع، لێکۆڵینەوەکان لەم بوارەدا کورت هەڵهێنران لە لێکۆڵینەوە لە ئایین و زانستەکانی وەک بابەتێکی مێژوویی ڕووت، بەبێ ئەوەی کە پەیوەست بێت بە سلووکی مرۆڤەکان و مامەڵەی لەگەڵ واقعدا، دوور خرانەوە لە ئامانجەکانی ژیان، بەداخەوە ئەم بۆچوونە بوو بە بیرووباوەڕ لەلای زۆرێک لە مسوڵمانان. ئەمەش بوو بە یەکەم درز و کەلێنی گەورە لە پرۆژەی هەستانەوەی مسوڵمانان، بەتایبەت لە بواری فێربوون و فێرکردندا.

هەر لە سەدەکانی پێشووەوە مسوڵمانان و زانا و بیرمەندانی ئیسلامی هەستیان بەوە کردووە کە چیتر نابێت مسوڵمانان بەم شێوەیە بمێننەوە، بەڵام هەم نەیارەکانیان زۆر بەهێزەوە کاریان لە پەکخستنی پرۆژە چاکسازییەکانیان کردووە، هەم بۆخۆشیان خەتابار بوون لە کەمتەرخەمی و هەنگاونانی هەڵە، بۆ نموونە؛ مسوڵمانان وایان زانیوە هۆکاری دواکەوتنی ئێمە لەوەدایە کە پزیشک و ئەندازیار و جیۆلۆجی و خەڵکانی پسپۆڕمان کەمە لە بواری زانستە تەجریبییەکاندا، هەر بۆیە لە ماوەی دەیان ساڵدا هەزاران لەو پسپۆڕییانەمان بەرهەم هێنا، بەڵام تازە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەوە کێشەی گەورەی دواکەوتنی مسوڵمانان نییە، بەڵکوو کێشەی سیستمی سیاسی و بەڕێوەبردن و گەورەی حەکیم و ئازادیخوازمان هەیە کە نەلکابێت بە کورسییەکەیەوە و خۆی نەدۆڕاندبێت... دەیان هەڵەی کوشندەی تر، کە کاتی زۆری لەدەست داوین بۆ هەستانەوە.

ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر و شەڕەکانی دوای ئەم ڕووداوە؛ ئەوەندەی تر کارەکەی ئاڵۆزتر کرد، چونکە پێش ئەو ڕووداوانە چەند ئاسۆیەکی گرنگ هەبوون کە جێگەی دڵخۆشی بوون بۆ



دەتوانین بڵێین ئەمە لە گەورەترین ئاریشەکانی ئەم بوارە بوو لەلای مسوڵمانان کە جیاکاری کرا لەنێوان بەها ئایینییەکان و ڕووگە دنیاییەکاندا.

هەستانەوەی مسوڵمانان لە بوارەکانی زانست و مەعریفەدا و ڕووتێکردنێکی باش هەبوو بەرەو چاکسازی لە فێربوون و فێرکردن لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەت لە بواری فێربوونی زانستە مرۆیی و ئیسلامییەکاندا و ئاوێتەکردنیان لەگەڵ پەیڕەوی پسپۆڕییەکانی تر. بەڵام دوای ئەم ڕوداوانە، دەوڵەتە زلهێزەکان دەستیان خستەوە بینەقاقای جیهانی سێیەم و هەموو هەژموونی خۆیان خستە گەڕ بە ناوی وشککردنی سەرچاوەکانی تیرۆرەوە، بۆ گۆڕانکاری لە پەیڕەوەکانی خوێندن و پەککخستنی هاوکاریی دارایی بۆ تەواوی دامەزراوە و ڕێکخراوەکان لە وڵاتە ئیسلامییەکان، هێواش هێواش ئەم هیوایەشیان لەگۆڕ نا و هەستانەوەی مسوڵمانانیان لاواز کردەوە. ئەگەر خوێندنەوەیەک بۆ پرۆسەی فێرکردن و فێربوون و ئاستی زانستەکان بکەین لە جیهانی ئەمڕۆی ئیسلامیدا، بەتایبەت زانستە مرۆیی و ئیسلامییەکان، دەبینین کە بە چەندین ئاریشەی ئاڵۆزەوە دەناڵێنێت، لێرەدا بەکورتی تیشک دەخەینە سەر هەندێکیان:

### یەکەم: نەبوونی تەواوکاری لەنێوان زانستەکانی وەحی و زانستەکانی تردا

لەژێر کاریگەریی هەژموونی ڕۆژئاوادا، زانکۆکانی گەلانی مسوڵمانیش بە هەمان سیستمی زانکۆ ڕۆژئاواییەکان کار دەکەن. ڕۆژئاوا بە دیدێکی مادییانە دەڕوانێتە سەرچاوەکانی زانست، پێیان وایە کە زانست و مەعریفە لە عەقڵ و ئەزموون (تجربة) ەکانەوە وەردەگیرێن، بەڵام ڕۆشنفکرانی مسوڵمانان پێیان وایە ئەم دیدە نوقسانە و پێویستە سەرچاوەیەکی تر بۆ سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە زیاد بکرێت، ئەویش سرووش (وحي)ی خوداییە، بە شێوەیەک ببێتە تەواوکار بۆ ئەو دوو سەرچاوەی تر.

هەر بۆیە لە زانکۆکان و دامەزراوە زانستییەکانی جیهانی ئیسلامی، ئیزدواجیەتێکی ناقۆڵا بەدی دەکرێت، لە لایەک هەمووان لە فێرخواز و مامۆستا و زانایان خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، کەچی ئەوەی خوێندکاران وەریدەگرن لە بابەت و تێکستەکان، بنیات نراوە لەسەر بیرۆکەکانی مارکس و فرۆید و فەیلەسووفەکانی تری ڕۆژئاوا. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەم سەرچاوە مەعریفی و هزرییانە بۆ ڕۆژئاوا دروست بێت، بە هیچ شێوەیەک بۆ مسوڵمانان ڕاست و پێکاو نین. ئیزدواجیەت دروست دەکەن، چونکە تاکی مسوڵمان وا پەروەردە بووە کە هەمیشە وەحی سەرچاوەیەکی دانەبڕاوە لە بیر و ئەندێشەکانی، کاتێک کە لە ناوەندەکانی خوێندندا ئەم زانستانە شتێکی تر بدەن بەگوێیدا، ئەوا زۆربەیان بە چاوی نەنگی و پرسیارەوە سەیری تەواوی بیرۆکەکانی ئەو زانستە دەکەن و بەگومانەوە کار لەسەر بەرجەستەکردنی دەکەن.

### دووەم: دوورکەوتنەوەی ئەم زانستانە و فێربوونیان لە ئامانج و ئەرکەکانی خۆیان

لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکی لە فێربوون و فێرکردنی زانستەکان، بۆ خزمەتی مرۆڤایەتییە بەگشتی. فێربوون و بەرجەستەکردنی زانستە ئیسلامییەکانیش، بۆ خزمەتکردنی دەق و تێکستە

# گرنگینەدانی حکومەتەکان بە ئایین و زانستە ئایینییەکان ئەمەش بەشێکی گرنگی ئاریشەکانە، لە ناوەندە زانستییەکاندا زۆر بەڕوونی بەدی دەکرێن



قورئانی و فەرموودەییەکانی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر)، بە مەبەستی ئاسانترکردنی تێگەیشتن لێیان و ڕاڤەی دروست بۆیان و ڕوونکردنەوەی مەبەستی خودایی لە تەشریعکرنی ئەحکامەکانیان.

بەڵام بەداخەوە ئەوەی کە ئەمڕۆ لە زۆرێک لە ناوەندە زانستییەکاندا دەیبینین، لە زانکۆ و کۆلێج و پەیمانگاکاندا بەدیی دەکەین، ئامانجی سەرەکیی فێرخوازان تەنها مەبەست لێی بەدەستهێنانی بڕوانامەیەکی ئەکادیمییە، خوێندکار دەیەوێت لە ڕێی ئەم بڕوانامە ئەکادیمییەوە پارووی ژیانی دەست بکەوێت و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەدەست بهێنێت یان بە پلە وەزیفییەکانی زانکۆدا سەر بکەوێت و کرێ و دەرماڵە و پارەی پێ زیاد ببێت. بەداخەوە ئامانجی زۆرێک لە خوێندکاران و نوخبەکان لەم بوارەدا بووە بەم ئامانجە کە زۆر دوورە لە ئامانجە ڕاستەقینەکە، بەم شێوەیەش زانستەکان سەریان کێشاوە بۆ رووکەشبوون و دوور کەوتوونەتەوە لە داهێنان و قووڵبوونەوە تیایاندا و سوودنەبینین لێیان لە ژیانی کرداریی ڕۆژانەی مسوڵمانان.

هەروەها زۆر بەڕوونی هەست بەوە دەکەین کە هەڵگرانی ئەم زانستانە کەمیان بەها زانستییەکان تیایاندا ڕەنگی داوەتەوە، کە دەبوو ئەوان لەپێش هەموو خەڵکدا ڕەوشت و بەهاکانی ئەم زانستانە تیایاندا بەرجەستە بووایە. لە هەمووشی تاڵتر ئەوەیە کە هەندێک لە مامۆستایان و ئەکادیمیستەکانی بواری ئەم زانستانە، تێز و توێژینەوەکانیان دووبارەیە یان هەوڵ و کۆششی خەڵکانێکی ترە دزیویانە؛ داویانەتە پاڵ خۆیان بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئەکادیمی یان بەرزکردنەوەی پلەی زانستی، ئەمەش مانای وایە کە هەموو ئەو شتانەی کە خوێندوویانە و فێری بوون، کاریگەریی لەسەر خودی خۆیان نەبووە بە پلەی یەکەم و ڕۆڵی نەبووە لەسەر چاککردنی ڕەوشتی خۆیان چ جای کۆمەڵگاکانیان، ئەگەرچی لۆژیک وایە کە یەکەم کەس دەبوو ئەوان سوود لەو زانستانە وەربگرن.

### سێیەم: گرنگینەدانی حکومەتەکان بە ئایین و زانستە ئایینییەکان

ئەمەش بەشێکی گرنگی ئاریشەکانە، لە ناوەندە زانستییەکاندا زۆر بەڕوونی بەدی دەکرێن کە بەرپرسانی زانکۆکان و دەسەڵاتداران بە شێوەیەکی بەرنامەبۆداڕێژراو کار لەسەر بێبەرزشکردنی هەندێک لە پسپۆڕییەکان دەکەن، لە پەیڕەو (مناهج)ەکانی خوێندندا هەمیشە وانە ئایینییەکان و زانستەکانی پشتگوێ دەخەن، چەقی گرنگی و بودجەی تەرخانکراو دەخەنە بەردەم بەشێک لە پسپۆڕییە پزیشکی و زانستە تەجریبییەکان و پسپۆڕییەکانی تر پشتگوێ دەخەن، لە زۆرێک لە وڵاتانی بە ناو ئیسلامی تەنانەت چاودێریی توند و دانانی بەربەستی زۆریش دەخرێنە بەردەم پسپۆڕی زانستە ئیسلامییەکان بە بیانووی جۆراوجۆر، ئەمە بەوەندەش کۆتایی نایەت، بەڵکوو جیاکاری دەکرێت لە دامەزراندنی ئەو دەرچووانەی لە پسپۆڕییە

ئایینی و مرۆییەکاندا دەردەچن لەگەڵ دەرچووانی تردا، بە هۆی ئەمەشەوە ڕووتێکردنی ئەم زانستانە لاواز دەبێت و بەناچاری خوێندکاری کەم و ئاستنزم وەردەگیرێت لەم جۆرە پسپۆڕییانەدا.

## چوارەم: بێئەرزش نیشاندانی زانستە مرۆییەکان

یەکێکی تر لەو ئاریشانەی کە بۆتە هۆی دواکەوتنی پرۆسەی فێربوون و فێرکردن لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، بە کەم ڕوانینە بۆ هەندێک پسپۆڕی و شێواندنی وێنەی هەندێک لەو زانستانە، بەتایبەت زانستە ئیسلامییەکان لەلایەن خودی مسوڵمانان خۆیانەوە، بەتایبەت لەلایەن ئەوانەی زۆر کاریگەر بوون بە ڕۆشنبیریی ڕۆژئاواییەوە و زانیارییان کەمە لەسەر ئیسلام، بە چاوی گوماناوی سەیری زانستە مرۆیی و ئیسلامییەکان دەکەن، هەڵگرانی ئەم زانستانە لە مامۆستایانی ئایینی و شەهادەدارەکانیان دەشوبهێنن بە قەشە و خەڵکە قوڵبڕ و فاڵچییەکانەوە، یاخود هەندێکیان بە سەرچاوەی توندڕەوی و تۆقاندنیان دەزانن. لە لایەکی تریشەوە خاوەن پسپۆڕییە جیاوازەکانی تر وا سەیری شارەزا ئەکادیمییەکانی بوارە مرۆییەکان دەکەن کە ئەوانە خەڵکی فزوڵین و دەم لە هەموو زانستێک وەردەدەن، کە لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی ڕاستە. خەڵکانێکی زۆر دەم وەردەدەنە ئایین و ڕای خۆیان لەسەر تێکستەکان دەردەبڕن، کە شارەزاییەکی کەمیان هەیە لەو زانستانەدا. ئەم ڕوانین و بێئەرزشکردنە تەنها زانستە ئیسلامییەکانی نەگرتۆتەوە، بەڵکوو خەڵکانێک بە کەم دەڕوانن تەواوی پسپۆڕییە مرۆییەکان و بە زۆر وتن و قەڵەباڵغکردنی زانستەکانی دەزانن، کە بەداخەوە نازانن کە ئەوە زانستە مرۆییەکانن کە دەتوانن گۆڕانکاری لە هزر و ئەندێشەدا بکەن، مرۆڤی تەندروست لە ڕووی دەروونی و سلووکەوە بۆ وڵات پەروەردە بکەن و بەرەو ئارامی و پێشکەوتنی بەرن.

## پێنجەم: ڕووکەشیی زانکۆ و دامەزراوە ئەکادیمییەکان

دامەزراوە ئەکادیمییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا زۆر لاواز و ڕووکەشن، نوێگەری و گۆڕانکاری لە سیستەم و پەیڕەوەکانیاندا زۆر خاو و دوورن لە واقعەوە، دانانی بەرپرس و بەڕێوەبەرانیان لەسەر ئاستی زانستی و خوێندەواری نییە، بەڵکوو لەسەر دابەشکاری و حزبایەتی و نزیکی لە بەرپرس و دەسەڵاتدارەکان دادەنرێن.

لە لایەکی ترەوە خوێندن لەم دامەزراوانەدا زۆر تەقلیدی و کۆنن، بەکارهێنانی هۆکارەکانی فێرکردن و تاقیگە و کارە مەیدانییەکان لە ئاستێکی زۆر نزمدان. سەبارەت بە زانستە مرۆییەکان و زانستە ئیسلامییەکانیش بە هەمان شێوە، زۆر نەزۆکانە لێکۆڵینەوە دەکرێت تیایاندا و زۆربەی دووبارەن، لە هەمان کاتیشدا لە ڕووی پراکتیکییەوە هەڵوێستی شەرعی لەمەڕ مەسەلە هەنووکەییەکان و کێشە هاوچەرخەکان وەک پێویست نین. هەر بۆیە دامەزراوە حکومییەکان و کۆمپانیاکان هیچ سوودێکی ئەوتۆ نابینن لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە زانکۆکاندا بەرهەم دێن، هەم لەبەر نەبونی هەماهەنگیی پێویست و هەم لەبەر ئەو ڕووکەشی و دواکەوتوویەی کە زانکۆکان هەیانە.

ئەمانە چەند دیاردە و ئاریشەیەکن لە بواری فێربوون و فێرکردن لە جیهانی ئیسلامیدا، کە لە ڕاستیدا کۆی ئەو کێشانە بە ڕای بەندە؛ دەگەڕێنەوە بۆ دوو خاڵ:

١. ناجێگیری و قۆرغکاریی سیستەمی سیاسی لەم وڵاتانەدا، کە وای لە خوێندەوار و عاقڵمەندەکان کردووە کە نەتوانن چارەسەری گونجاو بۆ ئەم کێشانە بدۆزنەوە، دیکتاتۆریەت؛ حەکیم و لێهاتووەکانی بێدەنگ کردووە و ناتوانن ڕاستییەکان وەک خۆی بگەیەنن.

٢. بەهێزیی ناحەزانی ئەم دەوڵەتانە و

چاوبرسێتییان و چاوبڕینیان بۆ نەوت و بەرهەمە فەراهەمەکانی گەلانی ئەم ناوچەیە، بە شێوەیەک ناهێڵن هەڵبستنەوە و قەیران لەسەر قەیرانیان بۆ دروست دەکەن

چارەسەر بۆ ئەم دۆخەی کە زانست و فێربوون پێوەی دەناڵێت لەم جیهانی ئیسلامییەدا، لابردنی ئەم ئاستەنگ و ئاریشانەن و گەورەبوونی عەقڵی تاکی مسوڵمانانە و دووربینی و فراوان بیرکردنەوە و گەڕانەوە بۆ ڕەسەنایەتی و چاکسازییە لە سیستمی سیاسیی مسوڵمانان و هەڵتەکاندنی داو و فێڵ و تەڵەکەکانی دوژمنان و چاوبرسییانی دەوڵەتە زلهێزەکانی دنیایە بەرامبەر بە خاک و دەوڵەتانی گەلانی مسوڵمان، تا ئەو کاتە مسوڵمانان هەمیشە لەم حاڵە باشتر نابن و هەمیشە دەبنە بار بەسەر زانستی جیهانەوە.

لەسەروو ئەمانەشەوە، پێویستە مسوڵمانان زانستە بەرهەمهاتووەکانی جیهان ئاشنا بکەنەوە بە ئیسلام، واتە زانستەکان مسوڵمان بکەن. ئەو فەلسەفە و بیرۆکە و هەنگاوانەی لەسەر بنەمای دژایەتی لەگەڵ سرووش (وحي) بنیات نراون، لای بەرن و سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە لەگەڵ سرووش (وحي)دا ئاویتە بکەن و تەواوکاری بنیات بنێت لەنێوان ئەم سەرچاوەیە و تەواوی زانستەکاندا، بەم شێوەیە دەتوانن متمانەیان بە زانستەکانیان زیاد ببێت و تاکی فێرخواز و زانای بەرجەستەکار بەرهەم بهێنن.

## سەرچاوەکان:


ئەو سەرچاوانەی کە بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوودیان لێ وەرگیراوە:

ـ منهجية التكامل المعرفي: د. فتحي حسن الملكاوى.

ـ حصائل الأعمال العلمية لملتقى دور العلوم الإسلامية في إرساء الهوية ومواجهه التحديات المعاصرة: جمع وتقديم د. مبروك زيد الخير، ورقة: أزمة العلوم الإسلامية في واقع الأمه: د. مسعود فلوسي.

ـ أزمة التعليم الديني في العالم الإسلامي: د. خالد الصمدي، د. عبد الرحمن حللي.

ـ أزمة التعليم المعاصر وحلولها الإسلامية تأليف: أ. د. زغلول راغب النجار.

# پەروەردەی ئایینی لە گەرمیان





**سەباح عەلی جاف**

کەلار/ نووسەر و ڕۆژنامەنووس، لە ساڵی ١٩٨٣ لەدایکبووە. بەکالۆریۆس لە مێژوودا هەیە، جگە لە چەندین نووسین و لێکۆڵینەوە، سێ کتێبی چاپکراوی هەیە.



پێش هەموو شتێک دەبێت لەم بابەتەدا ئاماژە بۆ خاڵێک بکەین، ئەویش ئەوەیە دەستنیشانکردنی سنووری گەرمیان ڕەنگە جێگەی مشتومڕ بێت و بەئاسانی نەتوانرێت ئەم خاڵە یەک لا بکرێتەوە، بۆیە دەکرێت کارکردن لەم سنوورەشدا بێ کێشە نەبێت، هەر بۆیە دەکرێت سەرەتا بزانین گەرمیان کوێیە و کوێ دەگرێتەوە!

محەمەد شاکەلی لە کتێبی «گەرمیان ڕابردووی نزیک و ئایندە»دا ئەم پرسە دەورووژێنێت، بۆ ئەم مەبەستە پشتی بە چەند سەرچاوە و ڕای کەسانی تر بەستووە، لەوانە کتێبی «داقوق، دقوقاء فی التاریخ»ی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی بە زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٥٤ نووسراوە و تێیدا دوای شیکردنەوەیەکی مێژوویی و جوگرافی، وەک خۆی دەڵێت ئەم بابەتە جێگەی لێکۆڵینەوەی ووردترە، دەگاتە ئەوەی کە ئەم ناوچەیە دەکرێت بەم شێوەیە دیاری بکرێت: «گەرمیان: لە شاخەوە بۆ شاخە و لە زێوە بۆ زێیە، واتە لە باکووریەوە شاخی سەگرمە و لە باشووریشیەوە بەرزاییەکانی حەمرین، لە ڕۆژهەڵاتیەوە ڕووباری سیروان، لە ڕۆژئاوایشەوە ڕووباری زێی بچووکە.» باس لەوەیش دەکات گەرمیان هەموو پارێزگای کەرکووک دەگرێتەوە، ئەو سنوورەی پێش ساڵی ١٩٧٥ دەستکاری بکرێت(١). لە زۆربەی سەردەمەکاندا گەرمیان لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە کەرکووک بووە و ئەمیش لە کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بنکەیەکی بەڕێوەبەردنی سەر بە ولایەتی موسڵ بووە و ناوبەناویش بەستراوەتەوە بە بەغدادەوە، بەر لەوەی بکرێت بە لیوا؛ ناوەندی ولایەتی شارەزوور بووە. دوای دامەزراندنی یەکەم حکومەت لە عێراق، کەرکووک یەکێک بووە لە لیواکانی کە پێکهاتەی ئیداریی بریتی بووە لە قەزاکانی (چەمچەماڵ، داقوق، کفری و ناوەندی کەرکووک)(٢).

ناوچەی گەرمیان بۆخۆی سنوور و چوارچێوەیەکی فراوان دەگرێتەوە، ئەمەیش لە شارەکانی چەمچەماڵ و کەرکووک و دووزخورماتوو بگرە تا دەگاتە شارەکانی تری کفری و کەلار و خانەقین بە دەربەندیخانیشەوە دەگرێتەوە. هەردوو شاری کفری و خانەقی لە ڕۆژهەڵاتی گەرمیان، لە دێرزەمانەوە ناوچەیەکی گرنگ و ئاوەدان بوونە(٣). بەم شێوەیە دەردەکەوێت سنووری گەرمیان کوێیە و کوێ دەگرێتەوە، تەنانەت هەندێک جار سنوورەکە باقوبەیشی گرتووەتەوە، ئەمەیش بەوەی لە لێکۆڵینەوەیەکی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیدا لەژێر ناوی «بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەرمیان لە هەفتەنامەی ‹پێشکەوتن›دا (١٩٢٠–١٩٢٢)»، چەندین ناوی شوێن و جێگە دێنێت، لەوانە: (بەعقوبە، قەرەخان واتە جەلەولا، قۆرەتوو و خانەقین)(٤)، بەم شێوەیە دەردەکەوێت گەرمیان سنوورێکی فراوان دەگرێتەوە، لە چەندین گوند و ناحیە و قەزا و پارێزگا پێک دێت، هەر بۆیە قسەکردنی ئێمە وەک لە سەرەوە وتم، ڕەنگە بە چاوپیاخشاندێک لەم ڕووە بژمێردرێت و هەوڵ دەدەین تیشک بخەینە سەر چەند لایەنێکی گرنگی ئەم بابەتە لە شوێنە جیاوەزەکان، ڕەنگە لەم دەرفەتەدا نەتوانین باس لە هەموو شوێنێکی گەرمیان بکەین و هەر بۆیە قسە لەسەر جێگە سەرەکی و دیارەکان و شوێنە نزیکەکانی بەشی سەرەکیی لێکۆڵینەوەکەمان (کفری، کەلار) دەکەین.

وەک جێگەکانی تری کوردستان، لە ناوچەی گەرمیانیش بۆ بەدەستهێنانی زانست و خوێندەواری، منداڵ و گەنج ڕووی لە مزگەوت و تەکیە و شوێنە تایبەتەکان دەکرد بۆ ئەو مەبەستە. فەقێ جاران ئازاد بوو، بە ئارەزووی خۆی کوێی بویستایە؛ ڕووی تێی دەکرد بۆ خوێندن. بەم جۆرە بۆ بەدەستهێنانی ئیجازە، ئەم شار و ئەو شار و ئەم گوند و ئەو گوندیان دەکرد، تا

به‌ ئه‌و پله‌یه‌ی ده‌یانویست؛ ده‌گه‌یشتن(٥). وه‌ک ده‌رده‌که‌وێت یه‌که‌مین ده‌زگای په‌روه‌رده‌یی له‌ کۆمه‌ڵگه‌ی کوردیدا خێزانه‌، که‌ به‌ درێژایی مێژوو خێزان گرنگی و پیرۆزیی خۆی هه‌بووه‌ و رۆڵی گرنگی له‌ ژیانی تاکدا گێڕاوه‌. به‌و پێیه‌ی بنیادی کۆمه‌ڵگه‌ی کوردی وه‌ک زۆربه‌ی کۆمه‌ڵگه‌کانی تری جیهان؛ بنیادێکی خێڵه‌کییه‌، واته‌ کۆمه‌ڵگه‌ی له‌م شێوه‌یه‌ هه‌ڵگری خه‌سڵه‌ته‌کانی هۆز و خێڵه‌، زۆرتر ئه‌مه‌ش ره‌نگدانه‌وه‌ی راسته‌وخۆی له‌سه‌ر خێزان و تاکه‌کانی ده‌بێت(٦). کۆمه‌ڵگه‌ی کوردی که‌ ناوچه‌ی گه‌رمیانیش به‌شێک له‌و پێکهاته‌یه‌یه‌، له‌ژێر کاریگه‌ریی خێزانێکی خێڵه‌کیدا په‌روه‌رده‌ ده‌بن و ئه‌م جۆره‌ په‌روه‌رده‌یه‌؛ کاریگه‌ریی له‌سه‌ر قۆناغه‌کانی تری ژیان ده‌بێت.

له‌ گه‌رمیان منداڵان پاش ئه‌وه‌ی له‌ناو خێزاندا په‌روه‌رده‌ ده‌کران، ده‌نێردرانه‌ حوجره‌ی مزگه‌وته‌کان بۆ خوێندن و له‌به‌رکردنی قورئان، پاشتر ده‌رسه‌کانی تر که‌ چه‌ندین بابه‌تی له‌خۆ ده‌گرت. ئه‌م جۆره‌ خوێندنه‌ له‌لای مامۆستایانی ئاییني له‌ سنووره‌که‌دا له‌ زۆر جێگه‌ هه‌بووه‌ و له‌ خزمه‌تی مه‌لاکانی ئه‌و ده‌مانه‌دا جگه‌ له‌ خوێندنی قورئان، بابه‌ته‌کانی تری وه‌ک: (عوامل جورجاني: نه‌حو، فتح قریب: له‌ بواری فیقهدا) ده‌خوێنران. زۆر جار منداڵان گه‌ر له‌ گونده‌که‌یان مزگه‌وت هه‌بووایه‌، ئه‌وا هه‌ر له‌وێدا ده‌یانخوێند، به‌ڵام گه‌ر نه‌بووایه‌، ئه‌وا ده‌بوو بچن بۆ جێگه‌یه‌کی تر. به‌م شێوه‌یه‌ درێژه‌یان به‌ خوێندن ده‌دا، تا دوا دواجار ئه‌و که‌سه‌ ده‌یتوانی ئیجازه‌ی مه‌لایه‌تی وه‌ربگرێت. ژیان و گوزه‌رانی مه‌لایه‌تیی ئه‌و ده‌مه‌ی گه‌رمیان زیاتر له‌سه‌ر زه‌کات و سه‌رفتره‌ بووه‌، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا زۆر مه‌لا پشتی به‌ خۆی به‌ستووه‌ و ئیشوکاری کشتوکاڵی کردووه‌ له‌پاڵ مه‌لایه‌تیدا. خوێندکاری ئاییني‌یش که‌ «فه‌قێ»یان پێ ده‌وت، هیچ داهاتێکیان نه‌بووه‌، جگه‌ له‌وه‌ی خه‌ڵک پێی داون. فه‌قێ له‌سه‌ر «راتبه‌» ده‌ژیا، ئه‌ویش بریتی بووه‌ له‌وه‌ی ئه‌و که‌سه‌ ماڵ به‌ ماڵ ده‌گه‌ڕا پێداویستییه‌کانی له‌ خواردن که‌ بریتی بووه‌ له‌ شه‌کر و چا و نان، پێداویستیی رۆژانه‌یان پێ پڕ ده‌کرده‌وه‌. به‌ هۆی هه‌ستی به‌رزی ئاییني خه‌ڵکییه‌وه‌، زۆر هاوکاریی ئه‌و فه‌قێیانه‌یان ده‌کرد، ئه‌مه‌یش ده‌ریده‌خات خه‌ڵکی کوردستان پابه‌ندی ئاییني ئیسلام بوونه‌ و رێزیان له‌ هه‌موو پیرۆزییه‌کانی ئه‌و ئایینه‌ گرتووه‌(٧).

فه‌قێیه‌کان له‌ «حوجره‌(٨)»ی مزگه‌وته‌کاندا ده‌یانخوێند، ئه‌ویش له‌ کاتی دروستکردنی مزگه‌وتدا بناغه‌ی بۆ داده‌نرا، پێک هاتبوو له‌ چه‌ند ژوورێک که‌ بۆ خوێندن و پشوویان بووه‌. له‌و حوجره‌یه‌دا فه‌قێیه‌کان به‌ زمانی عه‌ره‌بی ده‌یانخوێند، به‌ڵام راڤه‌کردنیان به‌ کوردی بووه‌. شێوازی خوێندن خۆی ده‌بینییه‌وه‌ له‌ رێگه‌ی خوێندنه‌وه‌ و له‌به‌رکردن و پێداچوونه‌وه‌ی پرۆگرامه‌کان، ئه‌مه‌یش به‌پێی ماده‌که‌، رۆژ هه‌بووه‌ یه‌ک تا دوو ماده‌ خوێنراوه‌. سه‌باره‌ت به‌ پشووه‌کانیان، له‌ رۆژانی هه‌ینی و سێشه‌ممان و له‌ هه‌ردوو جه‌ژنی ره‌مه‌زان و قورباندا بووه‌. له‌ خوێندنی ئاییني‌دا وه‌ک هه‌ر خوێندنێکی تر، سێ کاره‌کته‌ر بوونیان هه‌بووه‌، ئه‌وانیش بریتی بوونه‌ له‌: (پرۆگرام، قوتابی و مامۆستا). وه‌ک له‌ ته‌وه‌ره‌کانی پێشوودا باسمان کردووه‌، ئه‌م جۆره‌ خوێندنه‌ ئامانج لێی گه‌یشتن بووه‌ به‌ پله‌ی مه‌لایه‌تی و زانستی به‌رزتر(٩).

ئامانجی خوێندنی ئاییني له‌ گه‌رمیاندا گرێدراو بووه‌ به‌ خوێندنی ئه‌و سه‌رده‌مه‌وه‌ تێیدا منداڵان فێری بابه‌ت و زانسته‌ ئاییني‌یه‌کان کراون له‌پاڵ خراپیی گوزه‌رانی خه‌ڵکی و که‌میی ئاستی هۆشیاری و خوێنده‌واری، به‌ڵام ئه‌و که‌سه‌ی رووی له‌ خوێندنی ئاییني بکردایه‌، ئه‌وا به‌ رێگای سه‌خت و دژواردا ده‌گه‌یشته‌ دوا پله‌ی خۆی. سه‌رباری ئه‌و زه‌حمه‌ت و ده‌رده‌سه‌رییه‌ی ژیانی فه‌قێ، به‌ڵام بیره‌وه‌ری و یادگاریی خۆشیشی بۆ ئه‌و که‌سانه‌ تێدا بووه‌ و توانیویانه‌ به‌ جۆرێک له‌ جۆره‌کان له‌ خوێندنی ئاییني‌دا بخوێنن.

## ١. حوجرەی مزگەوتەکان:

لە گەرمیان سەرەتای دەستپێکردنی خوێندنی ئایینی بۆ حوجرە و مزگەوتەکان دەگەڕێتەوە، یاخود کەسێک لەلای مامۆستایەکی ئایینی بە شێوەیەکی تایبەت خوێندوویەتی و پێگەییوە. لەو سەردەمەدا خەڵکانی خوێندەوار هەر مەلاکان و قوتابیی فەقێکان بوون، حوجرە و مزگەوتەکانیش ناوەندی مەعریفی و خوێندن بوونە. فەقێی ئەو دەمە؛ شار بە شار و گوند بە گوند بەدوای زانست و زانیاریدا دەگەڕا، تا فێر ببێت و ئیجازە وەربگرێت(١٠). لە کەرکووکدا بنەماڵە ناودارەکانی کورد بنیادنەری مزگەوت و تەکیە و خانەقا بوونە، ئەمەیش دەیسەلمێنێت کورد دانیشتووی ڕەسەنی شارەکەیە. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کورد بەبەردەوامی هەڵگری ڕۆحی ئیسلام بوونە لە کەرکووکدا، هەر بۆیە دەبینین مزگەوتەکانی شارەکە و دەوروبەری و ناوەندە ئایینییەکان بەزۆری بە دەست پیاوانی ئایینیی کوردەوە بوونە، ئەمەیش بە سەلماندنی چەندین بەڵگە دەردەکەوێت. زانا و ناوداری کورد لە گەرمیان و کەرکووک لە سەردەمەکانی پێشوودا هەڵکەوتوون، لەوانە لە دەستنووسێکدا بۆ ساڵانی (١٧٠٥ز) دەگەڕێتەوە، باس لە کەسایەتییەکی ئایینی دەکات بە ناوی «زەینولعابدین کوڕی مەلا حاجی کوڕی تاجەدینی کوڕی محەمەد ئەردەڵانی»، کە دەستنووسێکی تۆمار کردووە، لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغداد پارێزراوە(١١).

بەپێی سەرچاوەیەکی مێژوویی لەنێوان ساڵانی (١٨٩٠-١٨٩٥) لە پاریس چاپ کراوە و لە نووسینی «ڤیتال کیۆنێ«یە، باس لە تورکیای ئاسیاوی دەکات، لە بەرگی دووەمیدا بەزۆری باس لە ولایەتە کوردنشینەکان دەکات، گەلێک زانیاریی وردی تێدایە، لە باسی ولایەتی موسڵدا لەو بەشەی تایبەتە بە سەنجاقی شارەزوور (کەرکووک)؛ گەلێک بابەت و وردەکاریی تێدایە، ئەم سەنجەقە لە ڕووی ئیدارییەوە بریتییە لە (٦) قەزا و (١٢) ناحیە و (١١٥٠) ئاوایی کە کەرکووک ناوەندی قەزاکەیە و زۆربەی ئەو ناوچانەی ناویان هاتووە، لە ئێستادا بە گەرمیان ناو دەبرێن، تێیدا کفری بە «صەلاحیە» ناوی هاتووە و ناحیەی قەرەتەپە و (٢٥٢) ئاوایی لەسەریەتی لەدوای ناوەندی قەزاکە کە ژمارەی دانیشتووانی بریتیە لە (٣٠٠٠٠) کەس. قەزای کفری لە ڕووی دانیشتووانەوە لە هەموویان گەورەترە. لەو کتێبە مێژووییە گرنگەدا سەبارەت بە دامەزراوەی فێرکردن و فێرکارییە گشتییەکان؛ ئاماژە بەوە دراوە چەندین مەدرەسە (قوتابخانەی ئایینی) کە بەستراونەتەوە بە مزگەوتەکانەوە؛ هەیە، کوڕانیش قوتابخانەیەکیان هەیە، لەگەڵ ئەمەیشدا کلدانییەکانی کەرکووک خاوەنی قوتابخانەیەکن. لە کەرکووکدا (٣٢) مزگەوت و (١٨) قوتابخانەی ئاست جیاواز هەن لەو جێگەیەدا(١٢). لە «قاموس ئیعلامی»ی شەمسەدین سامیدا لە ساڵی ١٨٩٨ لە ئەستەنبوڵ چاپ کراوە، سەبارەت بە کەرکووک و ناوچەی گەرمیانی ئێستا گەلێک زانیاریی بەسوودی تێدایە، لە بەشێکدا هاتووە لە سنووری کەرکووکدا «٣٦ مزگەوت، ٧ مەدرسە و خانەقا»ی تێدایە، واتە لە سنوورەکەدا لە ڕووی ناوەندە ئایینییەکانەوە خاوەن ژمارەیەک ناوەند بووە کە خەڵکی جگە لە لایەنە ئایینییەکەی، بۆ لایەنی فێرکردنیش سوودیان لێ وەرگرتووە(١٣).

لە کتێبەکەی «ڤیتال کیۆنێ«، باس لە چەندین جێگەی تری گەرمیان دەکات، وەک دووزخورماتوو و شوان و گلی و دادوودە. لە باسی دووزخورماتوودا هاتووە، ناوەکەی لە «خوێ و خورما»وە هاتووە، ناحیەیەکی گەورەیە، ژمارەی دانیشتووانەکەی (١٧٥٠) کەسە. سەبارەت بە شوێنە ئایینییەکان و ناوەندە فێرکارییەکان، نووسراوە (٢١) مزگەوت و قوتابخانەیەکی ئیسلامیی تێدایە(١٤). لە خورماتوو، مزگەوتی گەورەی ئەو شارە لە ساڵی (١٨٨٧ز) بنیاد نراوە و بۆ ئەو سەردەمە ناوەندێکی باشی



## تەکیەکان جێگەیەکی باش بوونە بۆ هەڵگرتنی گەلێك دەستنووسی ئەو دەمانە و کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر کتێب بەتایبەت لە ڕووی ئایینییەوە.

بواری خوێندن و خوێندەواری بووە و چەندین کەسی پێگەیاندووە، بەتایبەت لە بواری ئایینیدا کۆمەڵێک مەلا و فەقێ دەرسیان لە حوجرەدا وتووەتەوە، لەوانە: عەبدولقادری کوڕی ئیسماعیل محەمەد فەقێ ئیبراهیم و مەلا تەها، کە ئەمانە ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە فێرکردنی ڕۆڵەی شارەکەدا. لە ساڵی ١٩١٩دا باس لەوە دەکرێت لە شارەکەدا حوجرەیەک هەبووە، بە هۆی پیری و نەشارەزابوونی مەلاکانیەوە داخراوە، ئەمە لە کاتێکدا دوو حوجرەی بچووکتر هەبووە کە ژمارەی فەقێیەکانی (٤٥) فەقێ بوونە. سەرباری خراپیی گوزەرانی خەڵکی، بەڵام دەستهەڵگرتن لە خوێندن کەم بووە و خەڵکی دەستبەرداری خوێندن و زانست نەبوونە(١٥). وەک لە سەرەوەدا ئاماژەمان بۆ کرد، گەر سنووری خانەقین بە بەشێک لە گەرمیان بزانین، ئەوا دەکرێت لێرەدا تیشکی بخەینە سەر وەک ئەوەی «شمس الدین سامی» ئاماژەی بۆ کردووە کە ژمارەی دانیشتووانی بریتی بووە لە پێنج هەزار کەس، لە ئێستادا ئەم سنوورە بریتییە لە: (مەیدان و هۆرێن و شێخان و قۆرەتوو سەعدیە و جەلەولا). لە شوێنێکی وەک خانەقیندا، چەندین مزگەوت و جێگەی خوێندەواری هەبووە، لەوانەی باس دەکرێت مزگەوتی گەورەیە، پێدەچێت لە سەردەمی عوسمانییەکاندا دروست کرابێت، نوێژی هەینیی تێدا کراوە، لەگەڵ قوتابخانەیەکی ئایینیدا کە ماوەیەک لەلایەن قەرەداغییەکانەوە ئەم ناوەندە ئایینییە بەڕێوە براوە و تێدا خەتیب و مەلا و مودەڕیس بوونە، ئەمە و چەندین جێگە و مزگەوتی تر، لەوانە: (مەزگەوت و خانەقای نەقشبەندی)(١٦).

لەو ناوەندە ئایینییانەی سەرەوەدا کە باس کرا، خۆی لە چەندین مزگەوت و قوتابخانەی ئایینیدا لە سنووری گەرمیان دەبینێتەوە، دەردەکەوێت لە زۆربەی سەردەمەکاندا جگە لە پێگە ئایینییەکەیان، بوونەتە ناوەندێک بۆ پەروەردە و فێرکردنی خەڵکی. دوای خێزان، منداڵان براونەتە ئەو جێگایانە و فێر کراون. ئەمە تا سەردەمانێکی زۆر ڕۆڵ و کاریگەریی خۆیان هەبووە، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدە و بیستدا وەک ئاماژەمان بۆ کرد، ئایین کاریگەریی هەبووە بەسەر گشت بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری و هەموو کات کاریگەری و ڕەنگدانەوەی بەسەر دابونەریت و شێوازی بیرکردنەوەی خەڵکی کوردستانەوە هەبووە و زۆرینەی کورد؛ ئیسلام و سوننی و شافیعی مەزهەبن، لە کوردستان گوندێک نییە کە مزگەوت و نوێژ و ڕۆژووی تێدا نەکرێت و نەبێت. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین ڕۆڵی دەزگا ئایینییەکان ئەوەندە بەرچاو و کاریگەر بوون، بە جۆرێک لە نەبوونی دامەزراوەی مەدەنی و پەروەردە و فێرکردندا لە قۆناغەکانی زوودا، دامودەزگا ئایینییەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە کەناڵی سەرەکیی پەروەردەیی بوونە. بەم شێوەیە دەردەکەوێت لە لادێیەکانی کوردستاندا خوێندەوارترین چین مەلاکان بوونە، ئەوانیش دەرس و پەروەردەی منداڵان و قوتابیانیان دەکرد کە بە ئەوانە دەوترێت فەقێ، ئەمەیش لە جێگەیەکدا پێی دەوترێت حوجرە(١٧).

وەک لە بەش و تەوەرەکانی تردا بەگشتی



لە گەرمیان جگە لە خوێندنی حوجرە و تەکیە و خانەقا و خوێندنی تایبەت، دەکرێت ئاماژە بە جۆرێکی تری خوێندن بدەین، ڕەنگە وێنەی کەم بێت، ئەویش قوتابخانە ئایینییە تاکەکەسییەکانە.

باسی خوێندنی ئایینیمان کرد، بە هەمان شێوە لە گەرمیانیش ئەو بابەت و وانە ئایینییانە دەخوێنران. فەقێ و قوتابیانی گەرمیان لە سەردەمەکانی پێشوودا دەچوونە خزمەتی مامۆستاکەیان، یان لە گوند یان لە گەڕەکەکانی شارەکان و دەستیان بە خوێندن دەکرد، بە شێوەیەک لە سەرەتاوە لەلایەن مامۆستاکەیەوە فێری پیتەکان لە (ا - ی) دەکران. پاش فێربوونی پیتەکان، دەستیان بە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەکرد. لەپاش فێربوونی پیتەکان و خوێندنی قورئان، دەستیان دەکرد بە خوێندنی زانستەکانی (نەحو، صرف)، لەگەڵ چەندین زانست و وانەی تردا. ئەو دەمانەی ژیانی فەقێیایەتی لە گەرمیان دژوار و سەخت بووە، ئەویش بە هۆی نەبوونی هۆیەکانی گواستنەوە کە دەبوو قوتابی هەموو پێداویستییەکانی خۆی لەکۆڵ بنایە، هاوکات لە رووی پێداویستی و دابینکردنی لایەنی ئابوورییەوە، ئەوا لەسەر خەڵکی ئەو جێگەیە بووە کە ناوەندە ئایینییەکەی لەسەر بووە و زۆر بەکەمی ڕێک کەوتووە کەسوکاری فەقێ؛ پێداویستی و تێشووی ژیانی خوێندنی نەوەکەیان لە ئەستۆ بگرتایە، لەم ڕووە ئەم حاڵەتە دەگمەن بووە(١٨).

لە کتێبی «عێراقی باکوور»دا، لە ساڵی ١٩٥٥ چاپ دراوە، لە نووسینی (محەمەد هادی دەفتەر، عەبدوڵڵا حەسەن)ە، ناوی ئەو مزگەوتانەی هێناوە سەر بە ئەوقافی کەرکووک بوون، کە بریتی بوونە لە: (مزگەوتی نائیب، مزگەوتی ئیمام قاسم، مزگەوتی ئەرسەلان ئاغا... هتد). لە ناوی ئەو مزگەوتانەدا، ناوی هەریەکە لە مزگەوتی (چەمچەماڵ، داقوق، قادر کەرەم و کفری)، کە بەپێی ئامارەکان لە دەرەوەی ناوەندی شاری کەرکووک باس لە هەشت مزگەوت دەکەن. سەبارەت بە کۆنترین مزگەوتی سنوورەکە و کەرکووک، ئەوە بۆ ساڵی (١١٣٥ک/١٧٢٣ز) دەگەڕێتەوە، ئەویش مزگەوتی «مەلا حەمزە»یە، لەو مزگەوتەدا تەنانەت وانەیش وتراوەتەوە(١٩). بەم شێوەیە دەردەکەوێت لە سنووری گەرمیاندا چەندین ناوەندی ئایینی هەبووە بۆ پەروەردەکردن و خوێندەواری بۆ خەڵکی سنوورەکە، زۆرێک لەوانە تا ئێستاش لە بیرەوەریی خەڵکیدا ماون. واتە دەتوانین بڵێین لە بەشێک لە گوندەکانی سنوورەکەدا مزگەوت هەبووە، کە زۆرێکیان تەنها بۆ نوێژکردن و بەشێکی تریشیان بۆ خوێندن و پەروەردەکردن بوونە. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە چەندین گوند بدەین لەم ڕووەوە، لەوانە مزگەوتەکانی (حەسەن محە، بەرلوت)، ئەوانە مەلایان هەبووە و نوێژیان تێدا کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین جێگەی تر هەبووە کە مزگەوت و حوجرە هەبووە؛ بووەتە شوێنی پەروەردەکردن و تەدریسی خەڵکی، لەوانە لە گوندەکانی (گۆبان، ژاڵەی حاجی قادر، هۆمەر مل، چرچەقڵا، مەسۆی قەرەداغ، مزگەوتی گەورەی دەربەندیخان...)، لە هەموو ئەو گوندانەدا مامۆستایان هەبووە و دەرسی داوەتەوە و چەندین فەقێیان هەبووە کە خوێندوویانە، ئەو مزگەوتانە توانیویانە لە بواری خوێندەواریی ئایینیدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبێت و منداڵان پێبگەیەنن(٢٠).

لە گەرمیان خوێندنی ئایینی ڕۆڵی گرنگ و کاریگەری بینیوە لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا و

زۆر كەس بە هۆی خوێندنی ئایینی و لە ڕێگەی مزگەوت و حوجرەكانەوە پێگەشتوون و ناسراون، بەتایبەت لە بواری ئەدەبیدا توانیویانە ڕۆڵیان هەبێت و دەستێكی باڵایان هەبووە لە شیعرنووسیدا. گەر بۆ مێژووی گەرمیان بگەڕێینەوە، چەندین ناومان بەرچاو دەكەوێت، لەوانە «ئەحمەد بەگی زەنگەنە»، لە ساڵی (١٦٨٠ز) لەنزیك قادر كەرەم لەدایك بووە و لە كۆشك و سەرای خۆیاندا فێری خوێندەواری بووە و زمانەكانی فارسی و عەرەبیی زانیوە، كەسێكی تری وەك محەمەدی كوڕی ئەحمەدی زەنگەنە كە بە خامناكی ناسراوە، لەنێوان (١٦٩١–١٧٨٦) لەم سنوورەدا لەدایك بووە، لە سایەی بنەماڵەكەیاندا كە فەرمانڕەوا بوون، فێری خوێندن بووە(٢١). مستەفا نەریمان لە كتێبی «ئەدیب و نووسەرانی كفری و دەوروپشتی»، لەدوای مردنی؛ ساڵی ٢٠٠٧ لە بەغدا چاپ كراوە، باس لە (٢٤) ئەدیب و شاعیری ئەو سنوورە دەكات، لەوانە: (خەلیل منەوەر، مەلا ئەحمەدی زەنگەنە، شێخ عەلی شاكەل... هتد)، زۆربەی ئەو شاعیرانە لە ڕێگەی مزگەوت و ناوەندە ئایینییەكان، یان لە ڕێگەی مامۆستا و خوێندنی تایبەتەوە؛ فێری خوێندن و خوێندەواری كراون، لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە هەندێك لەو پیاوە ئەدیب و ئایینییانە بكەین كە توانیویانە بۆ خوێندن چەندین شوێن بگەڕێن، مەلا ئەحمەدی زەنگەنە (١٨٨٤–١٩٥٨) لەلای مەلا باشەكانی كفری و خانەقی و سلێمانی خوێندوویەتی و پاش وەرگرتنی ئیجازە و بوونی بە مەلا، لەناو خزمەكانی ماوەتەوە و خزمەتی كردووە، وانەی بە قوتابیان وتووەتەوە و لە نەزانین ڕزگاری كردوون. هەر لەم بەرهەمەدا مامۆستا نەریمان باس لە جۆرێكی تری خوێندن دەكات لە سنووری گەرمیان، ڕەنگە بە جۆرێك لە جۆرەكان لە شوێنەكانی تر جوداتر بێت، ئەویش خوێندنە لەژێر دەواری كۆچەریدا. لەم ڕووە لە باسی ژیانی حاجی برایمی شاتریدا دەنووسێت: «ئەوسا مەلای ناو جاف لەگەڵ ئەم هۆزەدا گەرمیان و كوێستانیان ئەكرد و دەوارێكی تایبەتیان بۆ مزگەوت تەرخان كردبوو كە مەلا عەبدوڵلای كوڕی مەلا محەمەدی ڕەباتی، ساڵ و نیوێك دەرسی ئیبراهیمی داوەتەوە(٢٢).»

لە گەرمیان سەرباری بوونی چەندین مزگەوت و حوجرە و ناوەندی ئایینی بۆ خوێندن و پێگەیاندنی منداڵان، بەڵام زۆر جاران خەڵكی، بەتایبەت كەسە دەوڵەمەندەكان، منداڵەكانی خۆیان دەنارده شوێنانی دەرەوەی گەرمیان، بۆ ئەو مەبەستە ئەوەتا كەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف (١٨٨٩–١٩٤٩) بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری؛ ئەو دەمە چووەتە سلێمانی و لە ماڵی ئەوڕەحمان ئاغای خاڵی بووە، بۆ دەرس وەرگرتن چووەتە حوجرەی مەلا سەعید و لەوێ قورئان و كتێبە فیقهییەكان و وردە كتێبە فارسییەكانی تری تەواو كردووە، پاشان لەلای مەلا سەعیدی قزراباتیش علومی عەرەبیی خوێندووە(٢٣). بەم شێوەیە دەردەكەوێت خەڵكی گەرمیان حەز و ئارەزووی خوێندنیان لە چ ئاستێكدا بووە، بۆ پێگەیاندنی منداڵەكانیان زۆر ڕێگەیان گرتوەتە بەر تا فێری زانستی سەردەمیان بكەن. لە ناحیەی شێروانەدا كە ناوەندەكەی سەرقەڵای سەر بە كفرییە، یەكێكە لە ناحیە كۆنەكانی سنوورەكە(٢٤)، لە ساڵانی جەنگی جیهانیی یەكەمدا وەك زۆر ناوچەی تر حوجرەیەك لەو جێگەیە دەكرێتەوە لەلایەن مەلایەكی خەڵكی سەرقەڵاوە بە ناوی «مەلا غەریب»، منداڵان فێری خوێندن و لەبەركردنی قورئان و زانستەكانی تر دەكات. لەم ناوەندە ئایینییەدا چەندین كەس فێری زانستە ئایینییەكان دەبن، تەنانەت خەڵكی دەوروبەریش لە گوندەكانی ئەو دەمە؛ سوودی لێ وەردەگرن(٢٥).

وەك دەردەكەوێت لە زۆربەی گوندەكاندا مزگەوت و حوجرە هەبووە بۆ پەروەردەكردنی منداڵان، هەر چەندە ئەو گوندە دوورەدەست یان

دوور بێت له شاره گەورەکانەوە. له گوندێکی مەحموود قەجەری سەر بە قەزای خانەقین، بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٣٠دا بەرەسمی مەلای بۆ دابین کراوە لەلایەن میرییەوە، ئەویش بە ناوی «مەلا ئەحمەدی حەوتەغار». ئەم مەلایە جگە لە نوێژ و کارە ئایینییەکانی تر، هەستاوە بە دروستکردنی قوتابخانەیەکی ئایینی بۆ فێرکردنی منداڵان لە ماڵی عەبدولمحەمەد مەحموودا. ئەم قوتابخانەیە نزیکەی (٣٠) قوتابیی هەبووە و وانە ئایینییەکانی ئەو دەمانەی تێدا بە منداڵان فێر کراوە. لە قوتابخانەی ئەم گوندەدا گەلێک کەس پێگەییون، کە دواتر بوونەتە مەلا، لەوانە: (مەلا محەمەدی زەرد، مەلا محەمەدی باجەلان، مەلا محەمەدی شەمێران...).

بەم شێوەیە لە گوندێکی دووری وەک مەحموود قەجەردا، قوتابخانە و مامۆستای ئایینی هەبووە بۆ پێگەیاندی منداڵان، وەک لە ناوی قوتابییەکانیشەوە دەردەکەوێت، لە زۆر جێگەی ترەوە هاتوونە بۆ فێربوون لەم گوندەدا و دواتریش توانیویانە خزمەت بە خەڵک و ناوچەکەی خۆیان بکەن. لەگەڵ دروستکردنی یەکەم مزگەوت لەو گوندەدا، حوجرەی فەقێیش لەیاد ناکرێت. لە ساڵی ١٩٤١ لەپاڵ هۆڵی مزگەوتەکەدا، ژوورێکیش بۆ حوجرەی دەرس خوێندن بنیاد دەنرێت(٢٦).

زۆر مامۆستای ئایینی چ لە رێگەی وانەوتنەوەوە، چ بە رێگەی تر، لەوانە بە شیعر داوایان لە خەڵکی کردووە کە منداڵەکانیان بخەنە بەر خوێندن، بۆ ئەوەی منداڵانی ئەم سنوورەش لە کاروانی خوێندەواری دوا نەکەون. سەرباری کاری ئایینی، لە رێگە و کەناڵی ترەوە ویستوویانە ئەو قەناعەتە لای خەڵکی سنوورەکە دروست بکەن بۆ ئەوەی منداڵانی خۆیان لە خوێندەواری بێبەش نەکەن. واتە لەپاڵ کاری ئایینی و مەلایەتیدا، هەوڵیان داوە بە شیعریش خوێندەواری لای هەمووان شیرین بکەن، ئەمەش دەریدەخات مامۆستایانی ئایینی لە سنوورەکەدا جگە لە کارەکەی خۆیان، خەمخۆری خزم و کەسەکانی خۆیشیان بوونە، بە شێوەیەک نەک تەنها لە رێگەی مزگەوتەوە، بەڵکوو بە شێوەی ئەدەبی و بە شیعریش هانی هاوڵاتیانیان داوە بۆ خوێندن و خوێندەواری.

لەم رووەوە شاعیری گەرمیان؛ «نەوحی(٢٧)» دەڵێت:

**من لەگەڵ تۆمە منداڵی کوردان**
**ئەی نەونەمامی نێو باخی ژیان**
**لەناو خوێندنا خۆت بچورسێنە**
**لە پێگەیینا مافت بسێنە...**

نەوحی لە شوێنێکی دیکەدا لەژێر ناوی «بەهێزیی بیر و زانستی» دەڵێت:

**بە هێز و بیری زانستی، چرایە تازە با هەڵکەین لە هەردەی لێنەزانینا، سەروماڵی کە پێ دەرکەین ئەوەی زۆردارە بێ زۆر و ئەوەی سەردارە بێ سەر بێ ستەم نامێ ئەو کاتە کەوای تازەی بۆ لەبەر بکەین...(٢٨)**

لە سنووری گەرمیان ژمارەیەکی زۆر مامۆستای ئایینی رۆڵیان هەبووە لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی فەقێ و قوتابیانی ئەو دەمانەدا، دەکرێت لێرەدا هەندێکی بهێنینەوە یاد و بەدڵنیاییەوە ژمارەکە زۆر لەمە زیاترە کە دەکرێت ئاماژەیان بۆ بکەین، لەوانە:

١. مەلا مەحموود محەمەد ئەمینی گۆبان (١٩١١-١٩٨٦): شارەزایەکی باشی هەموو زانستەکان بووە، هەمیشە فەقێی هەبوو و توانیویەتی بڕوانامەی زانستییش ببەخشێت بەو فەقێیانەی خوێندنی ئایینییان تەواو دەکرد.

٢. مامۆستا مەلا عەلی وەلی فەیزوڵا: مامۆستایەکی شارەزا و بەتوانا بوو، لە قەرەبلاغی سیامەنسور مەلایەتیی دەکرد، دواجار چووەتە جەلەولا. ساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.

٣. مامۆستا مەلا عەلی کوڕی مەلا محەمەدی

کوڕی فەقێ کەریمی کوڕی کوێخا شاسوار، ساڵی ١٨٩٠ لە گوندی زالیاو لەدایک بووە لە ناوچەی سەنگاو. خزمەتێکی زۆری کردووە. بنەماڵەی مەلا عەلی هەر لە کۆنەوە خاوەن مزگەوت و مەدرسە بوونە کە مەلا و زانای باشیان هەبووە. ئەم مەلایە هەر بەمنداڵی لای باوکی فێری دەرسە ئایینییەکان بووە، پاشان لە سلێمانی ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە و دەستی نووسینی شیعر و کۆکردنەوەی مێژووشی هەبووە، لە هەمان کاتدا چەندین کتێبیشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لەوانە: شیکردنەوەی خەونەکان (تفسیر الاحلام)(٢٩).

٤. مامۆستا مەلا عزیز عەبدولڕەحمان محەمەد دوازدە ئیمامی، ساڵی ١٩١٢ لە گوندی زەرداوای گەورە لەدایک بووە. زۆر جێگا گەڕاوە بۆ خوێندن. لەلای مامۆستا مەلا قادری سۆفی، بڕوانامەی زانستیی وەرگرتووە. خزمەتی لە بواری خوێندن و خوێندەواریدا لەبەرچاوە.

٥. مامۆستا مەلا ڕەشیدی سەرقەڵا (١٨٨٢–١٩٩١): مامۆستایەکی زانا بووە و قوتابخانەی ئایینیی هەبووە، پشتئەستوور بە هێز و بازووی خۆی ژیاوە، خزمەتێکی زۆری کردووە، لە ڕێنماییکردن و ڕێپیشاندانی خەڵکی بۆ دین و ژین دەستێکی باڵای هەبووە، لەگەڵ هەوڵەکانی لە پێگەیاندنی گەنجانێکی زۆر بۆ مەلایەتی(٣٠). قوتابخانەی بەرلوت لەلایەن مەلا مەحموود بەرلوتییەوە (١٨٦٨-١٩٣٤ز) خوێندن و ڕۆشنبیریی تێدا بڵاو کراوەتەوە. قوتابخانەی چیمەن لە سەدەی هەژدەدا مەلا حەیدەر بۆ وانەوتنەوەی ئایینی دروستی کردووە. حوجرەی قەرەبڵاغ لەلایەن چەندین مەلای بەناوبانگەوە وانەی ئایینی تێدا وتراوەتەوە، لەوانە «مەلا سەیید عەبدولحەکیم هۆرێنی»(٣١).

سەربای ئەو مامۆستایانەی ناومان هێنان، دەکرێت ئاماژە بە مامۆستای تر بکەین لە سنوورەکەدا خزمەتیان کردووە و جێپەنجەیان دیار بووە لە بواری خوێندن و خوێندەواریی ئەو سەردەمانەدا، لەوانە: مەلا حەمە غەریبی حەمەی ڕەسووڵ (١٩٢٦–١٩٨٥). پاش خوێندنی لەلای مەلای ئەو سەردەمە، لە گوندەکەی خۆیان خزمەتی کردووە و دەستی شیعر نووسینی هەبووە. مەلا حەسەنی باجەلان یەکێکی ترە لە پیاوە ئایینییەکان، لەلای مامۆستا مەلا ئەحمەدی دەککە و مەلا سەیید حەکیمی خانەقین(٣٢) خوێندوویەتی و دەستی شیعر نووسینی هەبووە(٣٣). مەلا سدیقی قولەبەرز (١٩٢٢–١٩٨٤)، لە چەندین گوندی سنوورەکە خزمەتی کردووە. مەلا عەبدوڵڵای بەرلوت (١٩٢٦–١٩٨٢). مەلا خالیدی ڕەباتی(٣٤)؛ یەکێکی ترە لە مامۆستا شارەزاکانی تری گەرمیان، لە چەندین جێگەی ئەم دەڤەرە خزمەتی کردووە و خزمەتەکانی لەم ڕووەوە بەرچاون. مەلا عەلی مەلا سالح (١٩٢٠-٢٠٠٦)، مەلا قادری کوڕی محەمەد بە مەلا قادری سۆفی ناسراوە، باوکی لە گوندی ژاڵەناو دانیشتووە و هەر بەمنداڵی خراوەتە بەر خوێندن و لە بیارە لەلای مەلا قادری گەورە؛ ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە. پاش ماوەیەک چووەتە شەمێران و لەناو هۆزی یەزدانبەخشیدا خزمەتی کردووە و بە دەرس وتنەوەوە خەریک بووە و فەقێی باشی هەبووە، وەک: (مەلا فەتاحی کاگردەڵی، مەلا فەیزوڵڵای تاڵشی) لە خزمەتی ئەو مامۆستایەدا خوێندوویانە و پێگەییون. پاش خزمەتێکی زۆر لە زۆر جێگەی کوردستان، مەلا قادری سۆفی لە گوندی «بانی خێڵان» نیشتەجێ بووە و تێیدا مزگەوت و مەدرسەی کردووەتەوە خزمەتی تێدا کردووە. ئەم پیاوە یەکێک بووە لە مەلا ئایینییە ناسراوەکانی گەرمیان، تەنانەت زۆر جاران دیوەخانەکەی بووەتە جێگەی زۆربەی خەڵک و مەسرووفی قوتابی و فەقێیەکانی لەسەر خۆی بووە. ئەم مەلا مەزنە لە ساڵی (١٩٥٣ز) کۆچی دوایی دەکات. مەلا قادری مەلا

موئمن لە قزرابات، یەکێکی ترە لەو مەلایانەی لە سنوورەکە لە بواری تەدریسدا جێپەنجەیان دیارە(٣٥). سەربارى ئەو مامۆستایانە، ژمارەیەک مامۆستای ئایینی لە گەرمیان ئیجازەی مەلایەتییان بە دەرچووانی خوێندنی ئایینی بەخشیوە(٣٦). لە سەرژمێری گشتیی ساڵی ١٩٥٧دا، بەم شێوەیە ئاماژە بە ژمارەی مزگەوتەکانی بەشێک لە سنووری گەرمیان دەدات(٣٧):

لە چەمچەماڵ سێ مزگەوت، لە ئاغجەلەر و دووز و قۆرەتوو و جەلەولا؛ هەریەکەیان یەک مزگەوت، لە خانەقین پێنج مزگەوت.

## ٢. تەکیە و خانەقاکان:

لە بەرایی ئەم تەوەرەدا، دەکرێت بزانین تەکیە چییە و کێی لێ کۆ دەبێتەوە و بۆ چ مەبەستێک بەکار دێت! ئەم جێگەیە لای خەڵکی کوردستان و گەرمیان تا چەند پیرۆز بووە! ڕەنگە یەکێک لە باشترین ئەو سەرچاوانەی باس لە تەریقەت و شێخایەتی و تەکیە بکات، کتێبەکەی «مارتین فان برونەسن(٣٨)» بێت بە ناوی «ئاغا و شێخ و دەوڵەت»، کە زۆر لایەنمان لەم ڕووەوە بۆ شی دەکاتەوە. سەبارەت بە تەکیە، دەنووسێت: «مامۆستایانی سۆفیی سەدەکانی نۆیەم تا سێزدەیەم، کە شێخ یاخود مورشیدیان پێ دەگوتن، لەگەڵ قوتابی و ‹مورید›ەکانیاندا لە خەڵوەتگەیەک یاخود ‹زاوییە›یەک، یاخود (تەکیە، خانەقا)یەکدا پێکەوە دەژیان...» بەم شێوەیە دەردەکەوێت تەکیە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکێکی ئاساییە لە ڕووی پێگەی ئایینییەوە لەدەوری کەسێکی بەرزتر. تەکیە و مەرقەدەکان بە سیمای سۆفیانەیانەوە بە یەکێک لە شوێنە پیرۆزەکان دادەنرێن لە ناوچەکانی کوردستاندا، ئەم شوێنانە بوونەتە شوێنی کۆبوونەوە و جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکان. هەندێکیان بوونەتە زیارەتگە و جێنزرگە و پەرستگە و خەڵکی زۆر ڕووی تێ دەکەن. مارتین لە درێژەی

قسەکردن لەم ڕووەوە، باسی ڕووداوێک لە ژیانی خۆی دەکات سەبارەت بە تەکیە، ئەویش کە بۆخۆی لە شوێنێکی مهاباد ئەم ڕووداوە تۆمار دەکات و دەڵێت لە زۆربەی کوردستان بەم شێوەیەیە: «کاتێک لە گەشتێکی ساڵی ١٩٧٣ی مهاباد بووم، حەوتەی دوو جار، هەموو ئێوارانی پێنجشەممووان و دووشەممووانێک، دەروێشانی تەریقەتی قادریی مهاباد ڕوویان دەکردە شوێنی کۆبوونەوەکانیان (خانەقا، یاخود تەکیە)، تا مەجلسی زکری خۆیان گەرم بکەن...» لەم ڕووە دەردەکەوێت کە هەردوو تەریقەتە سەرەکییەکەی کوردستان؛ تەکیە بەکار دەهێنن(٣٩).

وەک دەردەکەوێت ئەو دوو تەریقەتە ژمارەیەکی زۆر هەوادارییان لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بە گەرمیانیشەوە هەیە، ئەمانە لە ڕێگەی تەکیە و خانەقاکانیانەوە بە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی تایبەت و ڕەفتاری جۆربەجۆر، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەتایبەت عەشایەر و لادێنشینەکانیان لە ڕابردوودا لە چواردەوری خۆیان کۆ کردبووەوە. بە هۆی لاوازیی بیری زانستی لە کوردستان، دەتوانین بڵێین زانیاریی ئایینی؛ زۆربەی بۆشاییە مەعریفییەکانی کۆمەڵگەی کوردیی پڕ کردووەتەوە(٤٠). کەسە ئایینییەکانی نێو ئەم کایەیش، زۆرترین خەڵکی لەدەوریان کۆ بووەتەوە و دەتوانن نەخشیان لەسەر زۆر لایەنی ژیان هەبێت، بەتایبەت لە ڕووی پەروەردەییەوە، زۆر جار بە هۆی کاریگەریی ئەمانەوە بووە کە خەڵکی بە پلەی بەرز گەشتوون لە زانست و زانیاریی ئایینیدا، بەتایبەت کە کاریان بۆ تەریقەتەکەیان کردووە. گەرمیان لەم ڕووە بە پێشەنگ دێت و ژمارەیەکی زۆر لە هەوادار و موریدی تەریقەتەکان لێرە هەن.

گەر ئاوڕێک لە گەرمیان بدەینەوە، ئەوا لە ڕابردوودا چەندین ناوەندی ئایینی هەبووە بۆ پەروەردەکردن و پێگەشتنی خەڵکی، بەتایبەت لە سەنجاقی شارەزوور (کەرکووک)دا. لەم ڕووە لە

پەرتووکی گەڕیدە و کوردناسەکاندا زۆر جار باس لە زۆر لایەنی ژیاریی خەڵکی کوردستان کراوە لە سەردەمەکانی ڕابردوودا. وەک لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، لەسەر زۆر لایەنی ئەم سنوورە نووسراوە لە کتێبێکی گەڕیدەیەکی فەڕەنسیدا، لەنێوان سالانی (١٨٩٠–١٨٩٥)دا لە پاریس چاپ کراوە، تێیدا هاتووە لە ناوەندی قەزای کەرکووکی سەر بە سنجاقی شارەزووردا (١٠) تەکیە و شوێنی زیارەت هەیە(٤١). لە قاموس ئیعلامەکەی شەمسەدین سامیدا کە لە ساڵی ١٨٩٨ لە ئەستەنبوڵ چاپ کراوە، هاتووە لە کەرکووکدا (١٥) تەکیە و خانەقا هەیە. هەردوو نووسەر «محەمەد هادی دەفتەر»، «عەبدوڵڵا حەسەن» لە کتێبەکەیاندا ئاماژەیان بەوە کردووە لە کەرکووکدا ٦٢ تەکیە و مزگەوت و زیارەتگە هەن، هەشتیان لە دەرەوەی شارەکەدان(٤٢). بەم شێوەیە دەردەکەوێت لە سنووری گەرمیان بەتایبەت لە کەرکووکدا، ژمارەیەکی زۆر تەکیە و خانەقا بوونی هەبووە، لە زۆر لایەنی ژیانەوە سوودی لێ وەرگیراوە و زۆرێک لەو تەکیانە بوونەتە شوێنێک بۆ هاندان و ڕێگەیەک بۆ خوێندەواریی خەڵکی.

دەکرێت لە دەستپێکی ئەم بەشەدا زیاتر قسە لەسەر ئەو تەکیانە بکەین لە شاری کەرکوودا بوونە و کاریگەرییان لەسەر تەواوی گەرمیان و تەنانەت کوردستانیش هەبووە، یەک لەوانە «تەکیەی تاڵەبانی»یە، ئەمە جگە لە چەندین تەکیەی تر لەو شارەدا، لەوانە: (تەکیەی کەسنەزانی، تەکیەی شێخ حسێن کرپچنەیی، تەکیەی سەیید نوورەدین، مزگەوت و تەکیەی خادم سوجادە...). تەکیەی تاڵەبانی لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەسەر گردێکە بە چەندین ناو هاتووە وەک تەکیەی گەورە، ئەم تەکیەیە بووەتە مەرجەعی تەکیەکانی تری کوردستان و ناوچەکانی تریش، لە چەندین شار لقی هەبووە، بەتایبەت لە هەورامان. سەبارەت بە سەرەتای دروستبوونی، باس لەوە دەکرێت «شێخ مەحموود زەنگەنە» سەرەتا هاتووەتە کەرکووک، موریدێکی زۆری هەبووە کە ماوەیەک لە کەرکووک بووە. پاش مردنی؛ لەوێ دەنێژرێت و دوای ئەو، کوڕەکەی «شێخ ئەحمەد تاڵەبانی» جێگەی باوکی گرتووەتەوە. لەو جێگەی باوکی لێ نێژراوە، تەکیەی تاڵەبانی بنیاد دەنێت لە ساڵی (١٧٠٦ز). لە پاشاندا لەلایەن چەندین کەسی ترەوە ئەم تەکیەیە بەڕێوە براوە. ئەم تەکیەیە بووەتە جێگەی لایەنە ئایینی و گیانییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەریی زۆری لە بواری زانست و زانیاری و بیردا هەبووە. لەم تەکیەوە چەندین کەس پێگەییون(٤٣). لە تەکیە و خانەقاکانی کەرکووکدا، وانەوتنەوەی تایبەت هەبووە بۆ منداڵانی گەورەپیاوان و کاربەدەستان. لەو تەکیەیانەدا چەندین ڕۆشنبیر و مەلای بەرز وانەیان وتووەتەوە، چەندین فەقێ و مەلایان پێگەیاندووە، لەوانە (مەلا ڕەزای واعز، مەلا سلێمانی سالم، مەلا ئەحمەدی فورقان...)، ئەمانە لە بواری ڕۆشنبیری و ئاییندا لە سەردەمی عوسمانییەکاندا توانیویانە خزمەتی ناوچەکە و کەرکووک بکەن. دەردەکەوێت ئەم تەکیەیانە بوونەتە ناوەندێکی گرنگی ڕۆشنبیری لە ناوچەکەدا و کاریگەرییان لەسەر لایەنی خوێندەواریی کەرکووک هەبووە، بەڵام سەرباری لایەنە باشەکانی خوێندنی ئایینی، بەدەریش نەبووە لە کەموکورتی، شێواز و بەرنامەی خوێندن دواکەوتوو بووە، کۆنترین ڕێبازی وانەوتنەوە پەیڕەو کراوە و لە ڕووی تەندروستییشەوە مەرجی تەندروستیی تێدا نەبووە. وانەکان لە ژوورێکی تاریکدا دەخوێنران و وانە زانستییەکان بەگشتی پشتگوێ خرابوون، زۆرتر جەخت لەسەر لایەنی ئایینی کراوەتەوە(٤٤). دەردەکەوێت تەکیەکان لە کوردستاندا سەرباری ئەوەی بۆ لایەنی ئایینی بنیاد نراون، بەڵام لەگەڵیشیدا گرنگییان بە کایەکانی تریش داوە، بەتایبەت بۆ لایەنی کۆکردنەوەی خوێندەواران و شاعیرانی ئەو سەردەمە کە تێیدا قسە و باسی

زۆریان لەسەر زۆربەی لایەنەکانی ژیان کردووە، هەروەها تەکیەکان جێگەیەکی باش بوونە بۆ هەڵگرتن و نەفەوتانی گەلێک دەستنووسی ئەو دەمانە و کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر کتێب بەتایبەت لە ڕووی ئایینییەوە، بە شێوەیەک تەکیەکان بەتایبەت لە گەرمیان و کەرکووکدا توانیویانە ببنە ناوەندێکی ڕۆشنبیری و خوێندەواریی گرنگ لەو سەردەمانەدا(٤٥).

لە سنووری گەرمیاندا، جگە لە تەکیەکانی شاری کەرکووک، چەندین تەکیە و خانەقای تر هەبوون، زۆریان جگە لە لایەنی ئایینی و خوێندەواری، بوونەتە لانەیەک بۆ هەژاران و لێقەوماوان، لەوانە: تەکیەی ماڵباتی (شێخ کەریم، شێخ قادر)، شاعیر لەتیف هەڵمەت لە نەوەی ئەم بنەماڵەیەیە، ئەمانیش خەڵکی کەسنەزانی قەراغن، ئەم دوو زاتە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی قادری هاتوونەتە گەرمیان و لە زۆربەی لادێیەکانی گەرمیان تەکیەیان هەبووە، بەتایبەت لەنێو هەردوو هۆزی (جاف، زەنگەنە)دا، لە ئاواییەکانی (ڕەمەزان کەریم باسام، زۆراو بەگزاوە، سماق، هەوارە قووڵە و ئاوباریک)(٤٦). تەکیەکانی ئەمان زۆرتر هەژاران و لێقەوماوان ڕوویان تێ دەکرد و کەمتر بۆ لایەنی خوێندەواری و زانست و زانیاری بووە، بە شێوەیەک زۆرتر خەڵکی نەخۆش ڕوویان لە تەکیەکانی ئەمان دەکرد، لە ڕێگەی دۆعا و قورئان بەسەر خوێندنی نەخۆشەکانەوە، زۆرێکیان چاک دەبوونەوە(٤٧). بەڵام سەرباری ئەمەش، ئەم بنەماڵەیە خاوەنی کەسایەتیی ئایینی و کۆمەڵایەتی و خوێندەوار و ئەدیبن، لەوانە: شێخ مەحموودی کەسنەزان (١٩٠٥–٢٠٠١)، باوکی واتە شێخ محەمەدی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ حسێنی کەسنەزانە، باوکی شێخی تەریقەتی قادرییە لە گەرمیان، بە سەدان مەرید و دەروێشیان لە سنوورەکە هەبووە. شێخ مەحموود جگە لە کاری ئایینی، لە شیعریشدا دەستی نووسینی هەبووە و خاوەنی چەند بەرهەمێکە، یەکێک لەوانەی لە ساڵی ١٩٨٣ بە ناوی میعراجی ڕاستی چاپ کراوە(٤٨).

بەم شێوەیە دەردەکەوێت تەکیەکانی گەرمیان توانیویانە لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا کاریگەری لەسەر خەڵک دابنێن، بەتایبەت لە بواری ئایینی و خوێندەواریدا، تەنانەت لەو سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر لە دەوریان کۆ بوونەتەوە. ئەم تەکیەیانە تا ئەمڕۆیش لە بیرەوەریی خەڵکی و دەروێشەکانی ئەو دەمانەدا ماونەتەوە و لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوەدا باس دەکرێن.

گەرمیان مەڵبەندی تەکیە و تەریقەتە، بە شێوەیەک کەم گوندی گەرمیان هەبووە لە ڕابردوودا وابەستەی شێخێک یان تەریقەت و تەکیەیەک نەبێت، ئەوەتا شێخ ئەحمەد (١٧٨٠–١٨٤١ز)ی کوڕی شێخ مەلا مەحموودە کە بنەماڵەیەکی خوێندەوار و ناوداری گەرمیان بوونە، دەچێتە ئاوایی «تاڵەبان» لە سنووری چەمچەماڵ، لە ساڵانی ١٨٢٠دا تەکیەیەک دروست دەکات و گەلێک دەروێش و مورید لەدەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و لەسەر ڕێبازی قادری پەروەردەیان دەکات. سەرباری ئەمانەش، یەکێکی تر لەو تەکیانەی گەرمیان خەڵکێکی زۆر وابەستەی بوونە، «تەکیەی کەسنەزانی لە کرپچنە»، دەکەوێتە ئاوای کرپچنەوە لە بناری شاخی سەگرمەی سەر بە سەنگاو، لەم تەکیەدا کەسانی وەک شێخ حسێن (١٨٨٣–١٩٣٨)ی کوڕی شێخ قادری کرپچنەی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان خزمەتیان کردووە، بە سەدان دەروێشیان بە دەوردا کۆ بووەتەوە و لەدوای ئەمیش شێخ عەبدولکەریم (١٩١٥–١٩٨٧)ی برای شێخ حسێن هاتووە، ئەمیش خاوەنی تەکیە و موریدی زۆر بووە، پاشتر شێخ محەمەد هاتووە کە خاوەنی سەدان دەروێشە لە کوردستان و تەنانەت لە دەرەوەشدا. بەم شێوەیە دەردەکەوێت ئەم بنەماڵانە خاوەنی ڕێباز و تەکیە و مورید و دەروێشی زۆر بوونە و کاریگەرییان لەسەر تەواوی خەڵکی هەبووە(٤٩).

لە گەرمیان زۆرن ئەوانەی لە ڕێگەی تەریقەت و سۆفیگەرییەوە پلەیان بەرز بووەتەوە و بەو هۆیەوە خەڵکێکی زۆریان لەدەوری خۆیان کۆ کردووەتەوە، تەنانەت لە بواری پەروەردە و خوێندەواریشدا توانیویانە سوود بە ناوچەکە بگەیەنن. دەکرێت لێرەدا ئاماژە بە کەسێکی وەک «شێخ ئەحمەدی شاکەلی(٥٠)» بدەین، لەپاش وەرگرتنی تەریقەتی تەسەوف وازی لە کاروباری دنیایی هێناوە و زۆربەی کاروباری ژیانی لە ڕێگەی ئاییندا بەسەر بردووە. تا ڕادەیەکی باش پلە گرنگەکانی تەسەوفی بڕیوە، بە شێوەیەک وەک دەوترێت مردنی خۆی پێشبینی کردووە. بە هۆی کامڵبوونی لە ڕێبازی تەسەوفدا، شێخ عوسمانی بیارە بڕیار دەدات خەڵکی گەرمیان بۆیان هەیە بە شێخ ئەحمەدەوە تەمەسوک بکەن و بێنە ناو ڕێبازی نەقشبەندییەوە. بۆ ئەم مەبەستە شێخ عوسمان نامەیەک ئاڕاستەی خەڵکی سنوورەکە دەکات، تێدا جەخت لەو ڕاستییەی سەرەوە دەکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە تەکیەکەیدا ڕۆژانە چەندین مورید هەبێت(٥١). شێخ ئەحمەد وەک وتمان لەلایەن شێخ عوسمانەوە لە ڕێگەی نامەیەکەوە دەکرێتە نوێنەری تەریقەت لە سنووری گەرمیان، لە بەشێکی ئەو نامەدا هاتووە: «بۆ عمومی موحیبان و مەحبوبانی خۆشەویس و مورید و مونسیب برادەرانی عەزیزی گەرمیان و ئەو ناوە... شێخ ئەحمەد شاکەلی... زۆر مەحبووب و خۆشەویسی ئێمەیشە، وە بە ڕاست و دڵسۆزی ئەزانم بۆ هەموو لایەک، وە لە تەرەفی ئێمەوە ئیجازە هەیە بۆ نەسیحەت و تەلقینی ئادابی تەریقە...» لە شاکەلیی گەرمیان نزیکی کەلاری ئەمڕۆ، لە دەمی جەنگی جیهانیی یەکەمدا نزیکەی ٧٠ ماڵێک بووە، تەکیە و مزگەوت و قوتابیی لێ بووە، ئەو تەکیە و مزگەوتە کەوتبووە باشووری گوندەکەوە، لەوێ زۆر کەس بە کاروباری دەرس و خوێندنەوە خەریک بوون و بەوەیش ناسراو بوو، بەڵام مەخابن ئێرەیش وەک زۆر جێگەی تری گەرمیان بەردەوام ڕووبەڕووی ماڵوێرانی بووەتەوە(٥٢).

تەکیە و خانەقاکان بە یەکێک لە سەنتەرەکانی بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری و خوێندەواری لە گەرمیان دادەنرێن، کە تەریقەتی قادری «تەکیە» و تەریقەتی نەقشبەندی «خانەقا» بوون، خەڵکی خوێنەوار و مەلا و دەروێش و سۆفیی دەنگخۆش و شمشاڵ و دەف ژەن لەو جێگەیانە کۆ دەبوونەوە. لەم سەنتەرانەدا جگە لە خواپەرستی، زۆر جاران باسوخواسی دنیایی و لایەنی فکر و سیاسەت و ئەدەب و لایەنی کۆمەڵایەتی شرۆڤە دەکران، زۆر جاران باسی لایەنی نەتەوەییش دەکرا(٥٣). لە گەرمیان جگە لە خوێندنی حوجرەی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و خوێندنی تایبەت، دەکرێت ئاماژە بە جۆرێکی تری خوێندن بدەین، ڕەنگە وێنەی کەم بێت، ئەویش قوتابخانە ئایینیە تاکەکەسییەکانە، لەم سنوورەدا دەکرێت ئاماژە بە قوتابخانە ئایینییەکەی «مەلا کاکە حەمە(٥٤)» بدەین، کە مامۆستا مستەفا نەریمان لەم ڕووە بەسەرهات و چیرۆکی خۆشی بۆ تۆمار کردوین. لە گوندی چەوری لە بناری گل سەری لە قوتابخانەکەی مەلا کاکە حەمە داوە، ئەو خزمەتەی ئەو بە منداڵانی گەرمیانی کردووە، جێگەی ستایش و دەستخۆشییە و لە وێنەی کەمە، بەڕاستی قوتابخانەکەی شێوەی زانکۆی ئەمڕۆی هەیە، «قوتابخانەی میللیی کوردیی داودی»(٥٥).

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


(١) محەمەد شاکەلی، گەرمیان ڕابردووی نزیک و ئاینده، چاپخانەی کارۆ، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل٩-١٦.

(٢) هـ س، ل١٧، ٢٢ و ٢٢.

(٣) ئەحمەد باوەڕ، مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی گەرمیان ١٩٣٩–١٩٧٢، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٧)، ساڵی ٢٠١٣، ل٣٠٣ و ٣٠٤.

(٤) ئەحمەد باوەڕ، بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەرمیان لە هەفتەنامەی «پێشکەوتن»دا (١٩٢٠–١٩٢٢)، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٤)، هەولێر، ساڵی ٢٠١٣، ل١٥٧–١٧٢.

(٥) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، س. پ، ل١٠.

(٦) چنار سەعد عەبدولا، پەروەردە و نەتەوایەتی، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل٣٧.

(٧) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا حەمە ئەمین کەلاری (بەرپرسی لقی گەرمیانی یەکێتیی زانایانی ئایینیی ئیسلامیی کوردستان)، کەلار، ٢٠١٤/٢/١٠.

(٨) بناغەی حوجرە دەچێتەوە سەر ئەو «الکتاتیب»نەی کە لە سەدەی دووەمی کۆچیدا لە مزگەوتدا هاتووەتە ئاراوە بۆ خوێندنی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و زمانی عەرەبی، ئەمەش بۆ ئەوەی منداڵانی عەرەب لەسەر زمانی قورئان ڕابێن و باشتر تێیبگەن، ئەم شێوازەش بۆ سەردەمی پێش ئیسلام دەگەڕێتەوە کە عەرەبەکان منداڵەکانیان لە کەنیسە و پەرستگاکاندا فێری خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکان دەکرد، بڕوانە: حەمە کەریم هەورامی، س. پ، ل٣٢٦–٣٢٧.

(٩) توانا ڕەشید کەریم، س. پ ، ل ٢٢٥ – ٢٢٦.

(١٠) جەمال بابان، س. پ، ل١٨٨.

(١١) کوران فتحی، مدینة کرکوک موجز تاریخ المساجد والجوامع والتکایا والخانقاهات وکبار رجال الدین فیها، ت: کمال غمبار، ط١، طبع بمساعد الاکادیمیة الکردیة، (اربیل: ٢٠١٣)، ص٢٢.

(١٢) ڤیتاڵ کیۆنێ، سنجاقی شارەزوور (کەرکووک و سلێمانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٤ )، ساڵی ٢٠١٣، ل٢٩٧–٣٠٤.

(١٣) کوران فتحی، م. س، ص٢٣.

(١٤) ڤیتاڵ کیۆنێ، س. پ، ل٣٠٨.

(١٥) حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی (١٩١٤-١٩٤٥)، چ١، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکووک، (کەرکووک: ٢٠١٠)، ل١٦٦.

(١٦) محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، خانەقین لە مێژوودا، واتە (گۆڤار)، ژمارە (٢٨)، ئاداری ٢٠١٣، ل٢٣، ٥١.

(١٧) چنار سەعد عەبدولا، س. پ، ل٤٦، ٤٩.

(١٨) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا حەمە ئەمین کەلاری، کەلار، ٢٠١٤/٢/١٠.

(١٩) کوران فتحی، م. س، ص٢٤–٢٥.

(٢٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا حەمە ئەمین کەلاری، کەلار، ٢٠١٤/٢/١٠.

(٢١)ساڵح هەلاج، مێژووی شیعر و شاعیرانی گەرمیان، چ٢، چاپخانەی گەنج، (سلێمانی: ٢٠١٣)، ل١٧، ١٩.

(٢٢) مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، دەزگای ڕۆشبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، (بغداد: ٢٠٠٧)، ل٦٤، ٢٣٠.

(٢٣) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، چ١، (بەغداد: ١٩٩٥)، ل٩٤.

(٢٤) ڕووبەرەکەی نزیکەی ٥٦٠ کیلۆمەتر دووجایە و ٣١ گوندی لەسەرە، لە ئێستادا دانیشتووانەکەی نزیکەی ٥٠٠٠ کەسە و لە ١٠٢٠ خێزان پێک دێت، بڕوانە: بەڕێوەبەرێتیی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی ئیدارەی گەرمیان، کار و پڕۆژە خزمەتگوزارییەکانی ئیدارەی گەرمیان، (٢٠١٠–٢٠١١)، ل١٧.

(٢٥) چاوپێکەوتن لەگەڵ دەروون عومەر خەلیفە مەحموود (ڕووناکبیر)، سەرقەڵا، ٢٠١٤/٣/٢.

(٢٦) مستەفا سەعید عەلی، لاپەڕەیەک لە مێژووی دێی مەحموود قەجەر، (کەلار: ١٩٩٨)، ل٢٦–٢٧.

(٢٧) نەوحی (١٩٠٠–١٩٦٦): ناوی تەواوی؛ مەلا حەسەنی کوڕی سۆفی عەبدولحەسەنی زەنگەنەیە، لە خۆرهەڵاتی کوردستان لەدایک بووە، هەر چەندە سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی ڕای جودا هەیە. بۆ خوێندن و لە ژیانی فەقێیایەتیدا دێتە کوردستان و لە گەرمیان ماوەتەوە و لای مامۆستایانی وەک ساڵح ئەفەندی قەرەداغی و مەلا سەعیدی سیوەیلی مەلا تاهیر لە گەرمیان خوێندوویەتی. ساڵی ١٩٣٧ ئیجارەی مەلایەتیی وەرگرتووە و لە زۆر گوندی گەرمیان مەلایەتی کردووە. نازناوی شیعریی، «نەوحی» بووە. بڕوانە: هەردەوێڵ کاکەیی، دیوانی مەلا حەسەنی نەوحی زەنگەنە، چ١، چاپخانەی شڤان، (سلێمانی: ٢٠١٠)، ل٨–١٠، مستەفا نەریمان، س. پ، ل١١٠.

(٢٨) هەردەوێڵ کاکەیی، ە. س، ل٢٧٤، ٢٩٥.

(٢٩) ساڵح هەلاج، س. پ، ل١٥٤–١٥٥.

(٣٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا حەمە ئەمین کەلاری، کەلار، ٢٠١٤/٢/١٠.

(٣١) حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، س. پ، ل١٦٦.

(٣٢) مەلا سەیید حەکیمی خانەقین: کوڕی مەلا سەیید محەمەدی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدول سەمەدە، ساڵی ١٨٩٢ لە گوندی «هویە»ی سەر بە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایک بووە و بە مەبەستی خوێندن زۆر ناوچەی کوردستان گەڕاوە و لای مەلا گچکەی هەولێر ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە. بۆ یەکەمین جار لە قزرابات جێگیر بووە و دواتر چووەتە خانەقین و لە مزگەوت و تەکیەی شێخ فەتاح بووەتە ئیمام خەتیب و هەر لە خانەقین ژنی هێناوە. لە دامەزرێنەرانی حیزبی هیوا و پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕزگارییە و لە ١٩٥٧/١٢/١٥ لە شاری خانەقین وەفاتی کردووە و لە گۆڕستانی پاشا کۆپری نێژراوە. بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، دۆزی کورد لە پەیوەندییەکانی عێراق و ئێراندا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی: ٢٠١٤)، ل٢٠٧.

(٣٣) ساڵح یان ساڵەح؟ هەلاج، س. پ، ل٢٢٨، ٢٥٣.

(٣٤) مەلا غالی یان مەلا خالید (١٩١٢–١٩٨٦/١/١١): کوڕی مەلا مستەفای مەلا محەمەدی ڕەباتیە، لە ڕەبات لەدایک بووە. کچی مەلا مەحموودی بەرلوتیی خواستووە و پاشان ژنی دووەم دێنێت، ئەویش کچی کاکە عەبدوڵڵای بەرلوت بووە. لە بیارە ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە و لە زۆر جێگەی گەرمیان خزمەتی کردووە، سەرەتا لە ژاڵەی حاجی قادر و پیباز و پاشان بە مەلایەتی زۆر جێگەی تری گەرمیان گەڕاوە. مەلا خالید زۆر جێگەی بڕوای مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بووە. مەلا خالید لە کەلار کۆچی دوایی دەکات. بڕوانە: کاروان، مەلا غالی یان مەلا خالیدی ڕەباتی، گەرمیانی ئەمڕۆ (مانگنامە)، ژمارە (٤١)، شوباتی ٢٠١٠، ل٦.

(٣٥) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، ب٢، چ٢، چاپخانەی ئاراس، (هەولێر، ٢٠١١)، ل٤٣٣، ٥٢٢–٥٢٣.

(٣٦) چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا حەمە ئەمین کەلاری، کەلار، ٢٠١٤/٢/١٠.

(٣٧) مديريه النفوس العامه، الدليل العام لتسجيل النفوس العام لسنه ١٩٥٧، ص٤٤٧.

(٣٨) مارتین فان برونەسن: لە ساڵی ١٩٤٦ لە هۆڵەندە لەدایک دەبێت. بۆ یەکەمین جار سەردانی باکووری کوردستان دەکات و زۆر عاشقی خاک و خەڵکی کوردستان دەبێت. لە ساڵانی ١٩٧٤ و ١٩٧٦، دوو جاران دێتە کوردستان و هەر لێرە فێری زمانی کوردی؛ زیاتر کرمانجی سەروو دەبێت. ئێستا لە زانکۆی ئۆترێخت، لەو وڵاتە یاریدەدەرەی پرۆفیسۆرە لە بواری کوردناسی و تورکناسیدا. ئاغا و شێخ و دەوڵەت کە نامەی دکتۆراکەیەتی، یەکێکە لە سەرچاوە باشەکان و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی. بڕوانە: مارتین فان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و: کوردۆ، ب١، چ٢، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی: ١٩٩٩)، ل٦.

(٣٩) مارتین فان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و: د. کوردۆ عەلی، ب٢، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی: ٢٠٠٢)، ل١٢–١٦٤.

(٤٠) چنار سەعد عەبدوڵا، س. پ، ل٥١.

(٤١) ڤیتاڵ کیۆنی، س. پ، ل٣٠٤.

(٤٢) کوران فتحی، م. س، ص٢٣، ٢٦.

(٤٣) کوران فتحی، ن. س، ص٧٣–٧٩.

(٤٤) پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، شاری کەرکووک لەنێوان ساڵانی ١٩١٧–١٩٢٦، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، (سلێمانی: ٢٠٠٧)، ل١٠٥–١٠٧.

(٤٥) لەتیف فاتیح فەرەج، کتێبخانە لە کەرکووک و ئاوڕدانەوەیەکی خێرا، ڕامان (گۆڤار)، ژمارە (١٨٤)، هەولێر، ئەیلوولی ٢٠١٢، ل١١١.

(٤٦) شەمێران سلێمان، ڕووبەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا، چ١، چاپخانەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١١)، ل١١–١٢.

(٤٧) چاوپێکەوتن لەگەڵ لەتیف هەڵمەت (شاعیر و نەوەی بنەماڵەی شێخ کەریم)، کەلار، ٢٠١٤/١/٢.

(٤٨) مستەفا نەریمان، س. پ، ل٢١٢–٢١٣.

(٤٩) هەردەوێڵ کاکەیی، س. پ، ل٢١١، ٢٢٧.

(٥٠) شێخ ئەحمەدی شاکەل (١٩٠٣–١٩٨٠): کوڕی شێخ محەمەدە و یەکێکە لە شاعیرەکانی گەرمیان، بەمنداڵی لەلای مەلا باشەکانی ئەو دەمە خوێندوویەتی، یەکێک بووە لە ئەندامەکانی پارتی هیوا و یەکێک بووە لە پیاوە باوەڕپێکراوەکانی بەگزادەی جاف. سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوون و مردنی ئەم پیاوە ئاییننییە، بۆچوون هەیە کە لە ساڵی ١٩٠٢ لەدایک بووبێت و لە ساڵی ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردبێت، بەڵام ئەمەی دوایی ڕاستترە. بڕوانە: مستەفا نەریمان، س. پ، ل١٨٢، یان ساڵح هەلاج، س. پ، ل١٧٩.

(٥١) هاشم عاصی کاکەیی، دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی شاعیر و خواناسی دەشتی گەرمیان، چ٤، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکووک، (کەرکووک: ٢٠٠٩)، ل٨–١٠.

(٥٢) هاشم عاصی کاکەیی، ه. س، ل٢٧٧، ٣٦١.

(٥٣) محەمەد شاکەلی، بزووتنەوەی ڕۆشنبیری لە گەرمیان، بانەڕۆژ (گۆڤار)، ژمارە (١١)، کەرکووک ، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤، ل٢٢.

(٥٤) محەمەدی حاجی سەیفوڵڵا (١٨٨٩–١٩٦١): لە ئێرانەوە هاتوونەتە ئەمدیو، لە سلێمانی لەدایک بووە و لەلای باوکی خوێندوویەتی. پاش خوێندنی ئەو دەمانە، لە ساڵانی ١٩١٤ ئیجازەی مەلایەتیی وەردەگرێت. لە ساڵی ١٩١٩، لە سەردەمی حوکمداریی شێخ مەحمووددا دەکرێتە قازیی سەنگاو، لە ساڵی ١٩٢٠ بە فەرمانی میری کراوەتە قازیی قەرەداغ. پاش ئەوەی بیری کردەوە ئەم میللەتە دەبێت لە تاریکیی نەزانین ڕزگار بکرێت، دەستی لە کاروباری میری هەڵگرتووە و دەستی کردووە بە کردنەوەی قوتابخانەی ئایینیی تایبەت. لەم ڕووەوە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٦–١٩٣١)، لەناو جافی کۆچەریدا خزمەتی کردووە، لەنێوان ساڵانی (١٩٣١–١٩٤٥) لە شارەزوور و سەنگاو و گوندی فەقێ مستەفای زەند خزمەتی کردووە، لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥–١٩٥٠) لەنێو هۆزی داوودە قوتابخانەی دامەزراندووە و تا ساڵی ١٩٦١ لە چەندین جێگەی تر خزمەتی کردووە، لەوانە: لە هۆرێن و شێخان لە سنووری خانەقین. مامۆستا نزیکەی ٣٠ بەرهەمی نووسیوە. ئەم زاتە زۆربەری تەمەنی بۆ خوێندن و پەروەردەی منداڵانی کوردستان بەتایبەت گەرمیان تەرخان کردووە، بڕوانە: نەریمان، مامۆستای نەمر، چ١، چاپخانەی الامە، (بەغداد: ١٩٧١)، ل٧٤–٧٨.

(٥٥) نەریمان، ه. س، ل٤٩–٥٣.

# ڕەوشی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا







**د. ئاراس محەمەد ساڵح**

نووسەر و مامۆستای زانکۆ بە پلەی پرۆفیسۆر، چەند کتێبێکی چاپکراوی هەیە، ژمارەیەک توێژینەوەی زانستیی بڵاو کردووەتەوە، بەشداریی هەندێ کۆنگرەی زانستیی کردووە، نووسەر و ڕۆژنامەنووسە و ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی جیهانییە.

لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە هەموو کوردستاندا، وەک پێویستییەکانی ئایینی نوێ؛ گرنگیی زۆر بە خوێندن و مەعریفە دراوە، لەبەر ئەوەی سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر)؛ بە زمانی عەرەبییە، بەو هۆیەوە لە یەک کاتدا پێویست بووە مەلا و فەقێی کورد زۆر باش فێری زمانی عەرەبی ببێت، بە هەموو لقەکانی (النحو والصرف والبلاغة)وە، چونکە زمانی زانستی ئایینی ئیسلام عەرەبییە، هەروەها ئەم زمانە کلیلی تێگەیشتن و فێربوونی بنەماکانی ئیسلامە، هەر بۆیە پێویست بووە قوتابی ساڵانێکی درێژ و توانایەکی زۆر بۆ فێربوونی زانستەکانی زمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلام تەرخان بکات.

ئەگەر بە شێوەیەکی زانستی لێکۆڵینەوە لە مێژووی خوێندنی ئایینی بکرێ، دەبینرێت ئەو پرۆسەیە توانیویەتی لە دروستکردن و پێگەیاندنی چەندین زانای گەورەی ئایینی و شاعیر و نووسەر و زمانزاندا سەرکەوتوو بێت. لەگەڵ ئەوەشدا زمانی عەرەبی زمانێکی قورسە و فێربوونی زەحمەتە بۆ گەلانی ناعەرەب، بەڵام مەلای کورد زۆر باش فێری ئەو زمانە بووە، تەنانەت لە زانستەکانی ئەو زمانەدا دانراوی بەنرخیان نووسیوە و خزمەتی زۆریان لە پێشخستنی ئەو زمانەدا کردووە. بێگومان نهێنیی سەرکەوتنی پرۆسەی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا، کۆمەڵێک پاڵنەر و هۆکاری زۆری هەبووە، لێرەدا هەوڵ دەدەین لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بەو خاڵانە بکەین کە بووەنەتە هۆی سەرکەوتنی ئەو پرۆسەیە، لە گرنگترین ئەو خاڵانە:

## یەکەم: لێبڕان و خۆنەویستی

فەقێی کورد کاتێک دەستی بە خوێندن کردووە، بەتەواوەتی خۆی یەکلایی کردووەتەوە بۆ خوێندن و فێربوون و دابڕاوە لە هەموو ئیشوکار و سەرقاڵییەکی تر. قوتابی لە پێناوی فێربووندا، دەیان شار و شارۆچکە و گوندی بڕیوە بۆ گەیشتن بە باشترین مامۆستا و وەرگرتنی زۆرترین زانیاری. کەسێکی وەک «د. مستەفا زەڵمی» دەڵێت: «لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا کە قاتوقڕی و گرانی بوو، ئێمە لە شوێنێکی وەک تەوێڵەدا بە هۆی یارمەتیی شێخانی نەقشبەندییەوە لە ژیانێکی باشدا بووین، بەڵام بۆ گەڕان بەدوای زانای گەورەدا چووین بۆ ڕۆژهەڵات بەدوای باشترین مامۆستادا دەگەڕاین، بۆ ئەوەی حاشیەکانی قزڵجەیی و پێنجوێنیی لا بخوێنین، ئەمەیش بەڵگەیە کە فەقێ هەموو کات لە خەمی باشترین مامۆستادا بووە، نەک خۆشترین ژیان.»

هەندێ جار فەقێ بۆ دۆزینەوەی زانای بەتوانا؛ زۆر شوێن و وڵات گەڕاوە، لە کوردستانەوە گەیشتووەتە حیجاز و میسر و ئێران و هەتا هیندستان، تەنانەت فەقێی کورد گەیشتووەتە یەمەن و شاری سەنعا. ئیمامی شەوکانی لە کتێبە بەنرخەکەیدا (البدر الطالع) باس لە فەقێیەکی کورد دەکات بە ناوی «محمد الكردي»، ئەم فەقێیە لە باشووری کوردستانەوە گەیشتووەتە سەنعا و کۆڵەپشتەکەی تەنها چەند کتێبێکی دەستنووسی بەنرخی تێدا بووە و هیچی تر. ئەوەی جێگەی تێبینییە، ئیمامێکی گەورەی وەک شەوکانی سەرسامیی خۆی پیشان داوە لە بارەی یەکێک لەو دەستنووسانە (شرح یوسف) لە باسی «المناظرة»دا، ئەوەیش بەڵگەی لێبڕان و خۆنەویستیی فەقێی کوردە، لە پێناوی خوێندندا هەزاران کیلۆمەتر ڕێگای بڕیوە.

## دووەم: فێربوون لە پێناوی گەیاندندا

کاتێک فەقێی کورد دەستی بە خوێندن کردووە، بیری لەوە نەکردووەتەوە لە تاقیکردنەوەکاندا دەربچێت، بەپێچەوانەوە تاقیکردنەوە لە خوێندنی ئایینیدا نییە، بەڵکوو فەقێی کورد خوێندوویەتی بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانەی وەریدەگرێت؛ بیگەیەنێت

به کەسانی تر، بۆ ئەوە فیقهی خوێندووە کە دوای چەند ساڵێک ببێتە مەلایەکی باش و ئەو فیقهە بە خەڵکی بگەیەنێت، ئەو ڕاستییەی زانیوە کە دوای ساڵانێکی تر دەبێتە مەلا و ئەو پرسیارە شەرعییانەی لێ دەکرێت، بۆیە پێویستە بیانزانێت و بەڕاستی پەیامی ئایینەکەی بگەیەنێت.

## سێیەم: دەرسی تاکەکەسی

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی خوێندنی مزگەوت، زۆربەی کات مامۆستای وانەکە لەگەڵ فەقێکەیدا دووبەدوو وانەکە دەخوێنن، هەریەکە و کتێبی خۆی بەدەستەوەیە، وشە بە وشە دەیخوێننەوە و شرۆڤەی دەکەن، هەتا قوتابییەکە تێنەگات؛ ناچنە دێڕی دوای ئەو، ئەو جۆرە خوێندنە جیاوازیی زۆرە لەگەڵ ئەوەدا ژمارەیەک قوتابی لە هۆڵێکدا کۆ بکرێنەوە و وانەکەیان بۆ باس بکرێت، چونکە نازانرێت چەندیان تێگەیشتوون و چەندیان وەریاننەگرتووە.

## چوارەم: چڕبوونەوە لە مادەکاندا

خوێندنی مزگەوت یان ئایینی، هەموو کتێبەکانی دیاری کراوە، دەبێت خوێندکار تەواوی بکات، کات دیاری ناکرێت بۆ خوێندن، بەڵکوو مادە دیاری دەکرێت، هەر چەندە ماوەی خوێندنەکە درێژە بکێشێت، گوێی پێ نادرێت، بەڵکوو دەبێت ئەو کتێبە تەواو بکرێت کە دەخوێنرێت و خوێندکاریش تێیبگات. هەروەها کاتێک فەقێ دەست بە خوێندنی «نحو» دەکات، لە کتێبە سەرەتاییەکانەوە دەست پێ دەکات و چەند کتێبێک لەو بوارەدا دەخوێنێت. فەقێ نزیکەی دوازدە کتێبی «نەحو» و حەوت کتێبی «صەرف» دەخوێنێ لە قۆناغی فەقێیەتیدا، کە هەموویان کتێبی گرنگ و بنچینەیین لەو زانستانەدا. دوای تەواوکردنی ئەو کتێبانە، قوتابییەکە بە شێوەیەکی پێویست فێری مادەکان دەبێت.

## پێنجەم: دابڕان لە دنیا و لێبڕان بۆ فێربوون

قوتابیی زانستە ئایینییەکان کاتێک دەستی بە خوێندن کردووە، بووەتە دەروێشێکی دڵسۆزی خۆنەویستی خوێندن و فێربوون، بیری لە هیچی تر نەکردووەتەوە، لە ماڵ و کەسوکار دابڕاوە، نە حسابی بۆ سیاسەت کردووە، نە ئیشوکار، بە ژیانێکی زۆر سادە و کوللەمەرگی ڕازی بووە، لەلایەن خێرخوازان یان وەقفی مزگەوت و خوێندنگاکانەوە گوزەرانی کردووە، چاوەڕێی ژیانی باش و پارە و ماڵ نەبووە، نەیخوێندووە بۆ ئەوەی دابمەزرێت و بژێویی ژیانی لە ڕێگەی ئەو خوێندنەوە دابین بکات، بەڵکوو خوێندوویەتی بۆ ئەوەی فێر بێت.

## شەشەم: هەڵبژاردنی مامۆستای مادەکان

یەکێک لە خاڵە هەر بەهێزەکانی خوێندنی ئایینی ئەوە بووە فەقێ ئازاد بووە چ مامۆستایەک هەڵدەبژێرێت، لای کێ دەخوێنێ، لە هەمان کاتدا مامۆستاکەش ڕێگر نەبووە فەقێکەی بچێت لای مامۆستایەکی تر مادەکانی خوێندن تەواو بکات و ئیجازەی زانستی وەربگرێت، هەر ئەوەش وای کردووە مامۆستاکانیش هەوڵی زیاتر بدەن، بۆ ئەوەی ناوبانگی زانستی دەربکەن و زۆرترین و باشترین فەقێ ڕوویان تێ بکات، هەروەها هەر مامۆستایەکیش لە مادەیەکدا زیاتر ناوبانگی دەرکردووە، هەبووە لە «نەحو»دا و هەشبووە لە ڕەوانبێژی، یان لۆژیک، یان تەفسیر و فیقهدا باڵادەست بووە.

## حەوتەم: وتنەوەی دەرس بەوانەی خوار خۆی

فەقێ کاتێک قۆناغی سوختەیی تەواو کردووە و بووەتە موستەعید، ئەو مادانەی لە قۆناغی سوختەییدا خوێندوویەتی، بە سوختەکانی خوار خۆی وتووەتەوە، ئەمەش وای کردووە مادەکەی لەبیر نەچێتەوە و لە هەمان کاتدا زیاتر تێکەڵاوی مادەکان بووە و موتاڵای کردووە و ئەگەر شتێکی نەزانیبێت؛ هەوڵی فێربوونی داوە، بەڵام لە

ڕۆژگاری ئیمڕۆدا قوتابی ئەو مادانەی دەیخوێنێت، دوای زیاتر لە پازدە ساڵ دەبێتە مامۆستا، لەو ماوە درێژەدا بێگومان زۆرێک لەو زانستانەی فێری بووە؛ لەیادی کردووە.

## هەشتەم: نییەت و مەبەست

بە درێژایی مێژوو خوێندنی ئایینی بە پاڵنەری قیامەتی خوێنراوە، قۆناغی فەقێیەتی نەک خۆنواندن و دنیاداریی تێدا نەبووە، بەڵکوو هەڵبژاردنی ژیانێکی سەخت و دژوار بووە، نەبوونی و هەژاری و برسێتی و دابڕان لە کەسوکار و ماڵ، هەڵبژاردنی حوجرەیەکی ساردی مزگەوت و گەڕانی شارە و شار و دێهاتی کوردستان، هەموو ئەمانە ئەگەر بڕوایەکی بەهێز و پاداشتی لای خوای گەورەی تێدا نەبووایە، زۆر زەحمەت بووە کەس ئەو ڕێگایە هەڵبژێرێت، پاڵنەر و نهێنیی پشت هەڵبژاردنی ئەو ژیانە سەختە؛ بێگومان «ئیخلاص» و پاداشتی خوایی بووە.

## نۆیەم: خوێندن بۆ ئەوەی ببێ بە باشترین مامۆستا

قوتابیی مزگەوت زۆر باش زانیویەتی ئەگەر زۆرترین زانیاری فێر نەبێت، ناتوانێت ببێتە مامۆستا و پێشەوای ئایینیی خەڵکی. لەبەر ئەوەی ئایینداری بووەتە بەشێکی زیندووی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی، بە جۆرێک ئایین لەگەڵ کۆی گشتیی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵدا تێکەڵاو بووە، لە هەموو کاتەکاندا پرسیاری فرە جۆر لە مامۆستای ئایینی دەکرێت، ئەمەش وای کردووە مامۆستای ئایینی هەر لە قۆناغی فەقێیەتییەوە خۆی ئامادە بکات بۆ ئەو کاتەی دەبێتە مامۆستا و لەگەڵ پرسیاری خەڵکیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

## دەیەم: ڕێز لە زۆریی زانستدایە

هەموو فەقێیەک لە یەکەم ڕۆژی خوێندنیەوە ئەوەی لەبەرچاوە کە گەورەترین مامۆستا ئەوەیە لە زانستەکاندا باڵادەستە، تەنانەت ئەو مامۆستایانەی پێگەی زانستییان بەرزە، ئەگەر هەندێ جار لە مەزهەبی باوی ئاییندارى لایان دابێت، یان ئیجتیهادێکیان کردبێت، بۆیان چووەتە سەر و تووشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبوونەتەوە، ڕەنگە لێرەدا مەلای گەورەی کۆیە و شێخ محەمەدی خاڵ باشترین نموونە بن، بەڵام ئەگەر مامۆستایەک پێگەی زانستیی بەهێز نەبووبێت، هەموو کات بەگومانەوە سەیری گوتار و کرداری کراوە.

## یازدە: عیرفان و تەسەوف

تێکەڵاویی مەلا و فەقێی کورد لەگەڵ تەسەوف و بابەتە عیرفانی و ڕۆحییەکاندا، هاوکاریی باشی کردووە لە تێرکردنی لایەنی ڕۆحی و عیرفانی. تەزکیە و تەسەوف، ئاکار و ڕەوشتی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە و پاکی دەکاتەوە لە هەموو خەسڵەت و ڕەفتارێکی دزێو و ناپەسەند. لە هەمان کاتدا بابەتە عیرفانییەکان کەشێکی ڕۆحی و سلووکی بۆ کەسی ئاییندار دروست دەکات، بە جۆرێک هەست بە ئارامیی دڵ و دەروونی دەکات. جگە لە لایەنی ئاکاری و دەروونی، ئەم بابەتە عیرفانییانە زیاتر فەقێ و مەلای کوردی بەرەو جیهانی ئەدەب و شیعر ڕاکێشاوە و توانیویانە ئەدەبی کوردی زیاتر دەوڵەمەند بکەن و قووڵبوونەوەی زیاتری عیرفانی و فەلسەفی بکەن. هەموو ئەمانە وای کردووە ئەدەبی کلاسیکیی کوردی تەنها ئەدەبێکی ڕووکەش و کاڵوکرچ نەبێت، بەڵکوو ئەدەبێکی قووڵی پڕ لە هێما و ڕەمزی عیرفانیی دەوڵەمەند بێت.

## چواردە: تێکەڵاوی لەگەڵ ئەدەبی فارسیدا

خوێندنی زمانی فارسی و کتێبەکانی «گولستان» و «بوستان»ی سەعدی شیرازی و هەندێ کتێبی تری فارسی لە خوێندنگە ئایینییەکاندا، کاریگەریی زۆریان هەبووە لە فراوانکردنی ئاستی مەعریفی و ئەدەبیی مەلای کورد. ئەم کتێبە فارسییانە هەر چەندە بۆ فێربوونی زمانی فارسی بووە، لە هەمان



فەقێی کورد خوێندوویەتی بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانەی وەریدەگرێت؛ بیگەیەنێت بە کەسانی تر، بۆ ئەوە فیقهی خوێندووە کە دوای چەند ساڵێك ببێتە مەلایەکی باش و ئەو فیقهە بە خەڵکی بگەیەنێت.

کاتدا وەک بابەتێکی ئەدەبی سوودی زۆری هەبووە بۆ شارەزابوون لە بواری ئەدەب و فەرهەنگی فارسیدا و کرانەوە بەسەر بیر و ئەندێشەی گەلە جیاوازەکاندا، هەر ئەمەش وای کردووە لەناو مەلای کورددا شاعیری گەورە هەڵبکەوێت و داهێنان بکەن لە نووسینی شیعر و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا. جگە لە زمانی عەرەبی و فارسی، لە هەندێ ناوچەدا تورکییش خوێنراوە، بەتایبەتی لەدوای هاتنە سەر حوکمی عوسمانییەکان، کە زمانی تورکی زمانی ڕەسمیی دەوڵەت بووە لە زۆرێک لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا.

### پازدە: چڕبوونەوە لە زانستەکانی کەلام و لۆژیکدا

خوێندنی زانستەکانی وەک لۆژیک و زانستی کەلام و زۆر بابەتی تر، کە بە زانستە عەقڵییەکان ناسراون، یارمەتیی فراوانبوون و گەشەکردنی توانا عەقڵی و فکرییەکانی فەقێ و مەلای کوردی داوە بۆ تێگەشتن لە فکر و فەلسەفەی جیاواز، تەنانەت خوێندنی ئەندازە و ماتماتیک و ئەستێرەناسی و زۆر بابەتی تر، هەموو ئەمانە وای کردووە مەلا و خوێندەواری مەوسوعی پێبگات لە خوێندنگەکانی کوردستاندا، نەک تەنها خوێندەواری ڕووکەش و بێمەعریفە. ئەو خوێندنانەش لە پێناوی خوێندندا نەبووە، بەڵکوو لە پێناوی فێربووندا بووە، هەر بۆیە ئەستێرەناس و مێژوونووس و زۆر کەسی تر لە خوێندنگا ئایینییەکانی کوردستان پێگەیشتوون.

### شازدە: خوێندنی زانستی جیاواز

مەنهەجی خوێندنی ئایینی؛ تەنها مادەی ئایینی یان زمانەوانی نییە، بەڵکوو کۆمەڵێک مادەی جیاوازە، هەر چەندە بە دوازدە زانستەکە ناسراوە، بەڵام لە زۆر حاڵەتدا لە دوازدەیش زیاترە، بابەتەکانی (النحو، الصرف، البلاغة) لە زمانی عەرەبیدا خوێنراوە، هەروەها بابەتە ئایینییەکانی وەک (فیقهـ و تەفسیر و ئوصول و عەقیدە) و زۆر بابەتی تر، هەموو ئەمانە وای کردووە کە مەلا تەنها بابەتە ئایینییەکاندا شارەزا نەبێت، بەڵکوو لە زۆر بابەتی تری وەک زمانەوانی و زمانی فارسی و لۆژیک و ئەستێرەناسیدا شارەزایی هەبووە.

### حەڤدە: نەبوونی بەربەستی سنوور و کێشە سیاسییەکان

لەگەڵ هەموو نائارامی و جەنگ و بەریەککەوتنەکاندا، فەقێی کورد بەردەوام بووە لە گەشتی زانستی و خوێندن، لەگەڵ هەبوونی ململانێی توند و خوێناویی نێوان سەفەوی و عوسمانی لە ناوچەکەدا، لەگەڵ ئەوەشدا سەفەوییەکان شەڕی مەزهەبییان کردووە، بەڵام فەقێی کورد بەردەوام بووە لەسەر خوێندن و بە گەشتەکانیان سنووری کوردستانیان دیاری کردووە، بەزۆری سنووری خوێندنی زانستخوازانی کورد لەنێوان بەغداد موسڵ و دیاربەکر و سنە و سابڵاخدا بووە، زۆر کەم ئەو سنوورەی تێپەڕاندووە، تەنانەت زۆر کات سەفەوییەکان و عوسمانییەکانیش نەبوونەتە بەربەست لەبەردەم ئەو گەشتە زانستییانەدا.



له خوێندنی ئایینیدا خوێندن هەر ئەوەندە نییه بزانی فلان زانا چیی گوتووه، بەڵکوو دەبێت بزانی بۆچی وای گوتووه، بەڵگەی چییه، کەسانی تر لەو بارەیەوە چییان وتووه، ئەم بۆچوون و تەفسیرە چەند ڕووی تری هەیە.

**هەژدە: خوێندن له پێناو زۆرترین زانستدا، نەك بەرزترین بڕوانامه**

هەندێ فەقێی کورد کاتێکیش بووەتە مامۆستا، هەر بەردەوام بووه لەسەر خوێندن و قووڵبوونەوە له زانستەکاندا، بەتایبەتی له بابەتەکانی لۆژیک و ئوصولی فیقه و هەندێ بابەتی تردا. له هەندێ شوێن مونازەرە و گفتوگۆی زانستی هەبووە لەنێوان مەلاکاندا، هەموو ئەوانەش پاڵنەری باش بوون بۆ زیاتر قووڵبوونەوە و تێگەشتن له زانسته باوەکانی ڕۆژگاری خۆیاندا. فەقێی کورد نەیخوێندووه بۆ ئەوەی بەرزترین بڕوانامەی هەبێت، بەڵکوو بۆ ئەوە خوێندوویەتی زۆرترین زانستی هەبێت، بەڵام له ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێچەوانه بووەتەوە، گرنگ نییه چی دەزانیت، بەڵکوو گرنگ ئەوەیه چ بڕوانامەیەکت هەیە.

**نۆزدە: پرۆسەی خوێندن، یاسای نووسراوی نەبووە**

پرۆسەی خوێندنی ئایینی؛ یاسا و ڕێسایەکی نووسراوی نەبووە هەتا مامۆستا و قوتابی پێیەوە پابەند بن، یان مەنهەج و کاتێکی دیاریکراوی هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک نەریت و ڕێسای زارەکی و تایبەت بە خۆی هەبووە، مامۆستا زانیویەتی چ مادەیەک دیاری دەکات و چۆنی دەڵێتەوە و چ کات و شوێنێک هەڵدەبژێرێت بۆ دەرسەکەی، هەروەها فەقێیش پابەند بووە بە نەریتەکانی خوێندن و ڕێزی نێوان مامۆستا و قوتابی. هەر چەندە هیچ یاسا و لێپرسینەوەیەک نەبووە، بەڵام مامۆستای مودەڕیس هەر کەسێک خوێندنی تەواو نەکردبێت و ئاستێکی زانستیی باشی نەبووبێت، ئیجازەی مەلایەتیی پێ نەداوە، هیچ جۆرە خاتر و ناوەندگیرییەک نەبووە بۆ پێدانی ئیجازە. وەرگرتن و پێدانی ئیجازەش تاقیکردنەوەی نووسینی نەبووە، مامۆستاکە ئەگەر فەقێکە هیی خۆی بووبێت، زانیویەتی ئاستی چۆنە و چەندی خوێندووە، کاتێک خوێندنی تەواو کردووە، ئیجازەی پێ داوە. ئیجازە پێدان زۆربەی کات نووسراو بووە و لە ئاهەنگێکی شکۆداردا فەقێ ئیجازەی پێ دراوە، هەندێ جار بەسەرزارەکی بووە، مامۆستا بە فەقێکەی وتووە ئەوە لەلایەن منەوە ئیجازەت پێ دراوە و برۆ ببە بە مامۆستا.

**بیست: تێپەڕاندنی قۆناغەکانی خوێندن**

هەندێ جار قوتابیی زیرەک و بەتوانا پێویستی نەکردووە هەموو کتێبەکانی خوێندن تەواو بکات، بەڵکوو کاتێک مامۆستاکەی زانیویەتی فەقێکەی زیرەکە و کتێبەکە باش دەزانێت، ئەو کتێبەی تێپەڕاندووە و چووەتە سەر کتێبێکی تر، ئەوەش وای کردووە فەقێی بەتوانا زووتر خوێندن تەواو بکات و ئیجازەی زانستی وەربگرێت.

**بیست و یەك: خۆشەویستیی نێوان فەقێ و مامۆستا**

لە قۆناغەکانی خوێندنی ئایینیدا، خۆشەویستییەکی زۆر لەنێوان مامۆستا و قوتابیدا هەیە. زۆربەی کات کە فەقێ دەچێت بۆ دەرس خوێندن، دەستی مامۆستاکەی ماچ دەکات. ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، بە درێژایی تەمەنی قوتابی؛ بەڕێزەوە ناوی مامۆستاکەی دەبات و دوعای خێری بۆ دەکات. هەروەها کتێب و مادەکانی

خوێندن زۆر پیرۆزن لای قوتابیی خوێندنی ئایینی، هەموو کات بەپیرۆزییەوە باسی زانست دەکات و دەست دەداتە کتێبەکانی، ڕێز و خۆشەویستیی زۆری هەیە بۆ دانەر و نووسەرەوەی ئەو کتێبانەی خوێندوویەتی، ئەم خۆشەویستی و پیرۆزییە گەورەترین نهێنیی فێربوون و سەرکەوتنی قوتابیی زانستە شەرعییەکانە.

## بیست و دوو: وردەکاری و قووڵبوونەوەی زۆر

لە خوێندنی ئایینیدا خوێندن هەر ئەوەندە نییە بزانی فلان زانا چیی گوتووە، بەڵکوو دەبێت بزانی بۆچی وای گوتووە، بەڵگەی چییە، کەسانی تر لەو بارەیەوە چییان وتووە، ئەم بۆچوون و تەفسیرە چەند ڕووی تری هەیە! زۆربەی کات بابەتەکانی شەریعە و نەحو و بەلاغە بوونەتە لۆژیک، بەتایبەتی لۆژیکی ئەرستۆ کە هەژموونی بەسەر هەموو زانستەکانی خوێندنی مزگەوتدا هەبووە، ئەم هەموو لێکدانەوە و قووڵبوونەوانە ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە گەشەکردنی توانا زانستی و عەقڵی و فەلسەفییەکان لای قوتابی و مەلای خوێندنی ئایینی، هەر ئەوەشە نهێنیی شارەزایی و قسەزانی و خۆشمەشرەبیی مەلای کورد لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا.

## بیست و سێ: پرۆسەی خوێندنی ئایینی لەناو مزگەوت و حوجرەیەکی سادەدا بووە

ژیان و مانەوەی فەقێ هەر لەناو چوار دیواری مزگەوتدا نەچووەتە دەرەوە، بە خواردن و پێویستییەکی زۆر سادە گوزەرانی کردووە، لەبەر ئەوە پێویستی بە بودجە و پارەی زۆری دەوڵەت نەبووە، هەتا ئەگەر ڕۆژێک دەوڵەت هاوکاریی نەکرد؛ پرۆسەکە بوەستێت، زیاتر پشتی بە خۆی و هاوکاریی خێرخوازان بەستووە، لە هەندێ ناوچەدا لەلایەن ئاغا و دەرەبەگ و سەرۆکعەشیرەتەکانەوە هاوکاری کراوە، بەڵام بەزۆری ئەرک و بژێویی لەسەر خەڵکە ئاساییە خێرخوازەکان بووە، بەتایبەت لەو شار و گوندانەدا کە ئاستی بژێویی خەڵکەکەی باش بووە، هاوکاری و یارمەتیی پرۆسەی خوێندن و مزگەوت لە ئاستێکی باشتردا بووە.

## کۆتایی:

فەقێ کاتێک دەستی بە خوێندن کردووە، زۆر لێبڕاوانە و خۆنەویستانە خۆی بۆ فێربوون یەکلایی کردووەتەوە، لە پێناوی خوێندن و زانستدا زۆر شار و دێهات گەڕاوە و پابەند نەبووە بە سنوورێکی دیاریکراوەوە، بەدوای مامۆستای باشدا زۆر جار سنووری چەند وڵاتی تێپەڕاندووە، ڕازی بووە بە ژیانێکی زۆر سادە و پڕ لە کوڵلەمەرگی، هەمووی لە پێناوی زانست و فێربووندا. ڕێز و خۆشەویستیی زۆر هەبووە لەنێوان مامۆستا و قوتابیی مزگەوتدا، هەروەها ڕێز و پیرۆزیی خوێندن و زانست لای مەلا و فەقێ زۆر گەورەیە، بێ ئەوەی هیچ یاسا و ڕێسایەکی نووسراو هەبووبێت، بەڵام هەردوو لایەنی مامۆستا و قوتابی زۆر بەرپرسیارانە مامەڵەیان کردووە.

مەلای کورد لە یەک کاتدا توانیویەتی مامۆستای ئایینی و ڕابەری ڕۆحی و چاکسازیی کۆمەڵایەتی و شاعیر و ئەدیب بێت، لە هەندێ حاڵەتدا ڕۆڵی پزیشک و حەکیمی بینیوە، بە پەنابردن بۆ دوعا و پاڕانەوە و چاسەری میللی و دروستکردنی گیادەرمانی، چاکسازی دەروونی بوون و هەوڵی چارەسەرکردنی دەرد و نەخۆشییەکانیان داون، هاوکاریی کۆمەڵیان کردووە بۆ ئەوەی بەدوور بن لە نەخۆشی و ناخۆشی و کێشە و بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتی. مامۆستایانی ئایینی هەموو کات دەرگایان کراوە بووە لەبەردەم خەڵکیدا، لە ڕۆژ و شەو و نیوەی شەودا، لە سەرما و گەرما و خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵ خەڵکدا و لەناو خەڵکدا بوون، هەر ئەوانەش وای کردووە مامۆستای ئایینی پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەهێزی هەبێت و هەموان بە چاوێکی پیرۆز و ڕێز و خۆشەویستییەوە سەیری بکەن.

## سەرچاوەکان:


١. الشوكاني، البدر الطالع بماحسن من بعد القرن السابع، التحقيق: محمد حسن الحلاق، الطبعة الأولى ٢٠٠٦، دار ابن كثير، دمشق.

٢. مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، چاپی یەکەم، ١٩٧٣، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد.

٣. د. مستەفا زەڵمی، کاروانی ژیانم، چاپی دووەم، ٢٠١٦، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر.

٤. محەمەدی قزڵجەیی، ناساندنێکی مزگەوتەکانی سلێمانی و خوێندنگە ئایینییەکانی، وەرگێڕانی: د. ئاراس محمد صالح، چاپی یەکەم، ٢٠١٤، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.

٥. مەحمود ئەحمەد محەمەد، بایەخپێدانی میرەکانی بابان بە زانست و ڕۆشنبیری لە قەڵەمڕەوەکەیاندا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٢)، ساڵی ١٩٨٤.

٦. عبدالكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، الطبعة الأولى، ١٩٨٤م، بغداد.

٧. مەلا محەمەدی عەلیاوەیی، ژیانی فەقێیاتی لە کوردستاندا، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣، سلێمانی.

٨. عەزیزی مەلای ڕەش، فەقێیاتی لە دەشتی هەولێر، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٠)، ساڵی ١٩٨٦.

# پەروەردە و فێرکردن

## لە کوردستاندا لەسەر هێڵێکی چەوتە






**بەڕێز عەباس**

ماستەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ لە زانکۆی مەنسوورە لە وڵاتی میسر، چەندین نووسین و وتاری پەروەردەیی و مێژوویی و ڕۆشنبیری و سیاسیی بڵاو کردۆتەوە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتە جیاوازەکانی کوردستاندا.

**مەزنترین دیاری دەکرێت پێشکەشی کۆمەڵگەی بکەین، بریتییە لەوەی منداڵەکانی فێر بکەین.**
**(فەیلەسوف و گوتاربێژی ڕۆمانی «شیشرۆن).**

**پەروەردە بەهێزترین چەکە کە دەتوانیت جیهانی پێ بگۆڕیت.**
**(نیلسۆن ماندێلا)**

**ئەگەر ویستتان پرۆژەی ساڵانە دابنێن، گەنم بچێنن، ئەگەر ویستان پرۆژەی دە ساڵانە دابنێن، دار بروێنن، خۆ ئەگەر ویستتان پرۆژە بۆ سەراپای ژیان دابنێن، مرۆڤ پەروەردە بکەن..!**
**(فەیلەسوفی چینی «کیواتزۆ)**

**مامۆستایەکی هاوڕێم بۆی گێڕامەوە، کاتێک لەگەڵ قوتابییەکان چاکی و چۆنی دەکات بەڕێوەبەری قوتابخانە دەهری دەبێ و سەرکۆنەی دەکا: ئەرێ فلانی ئەوە کارنییە تۆ دەیکەی، بۆ ئەوەندە ڕوو دەدەی بەو قوتابییانە، سبەینێ ڕوویان دەکرێتەوە، بە ڕبەت ناپێون و ئیتر کەس دەڕۆستیان نایەت!**
**(«سەمەد بێهرەنگی» چیرۆکنوسی ناسراوی ئێرانی لە کتێبی» لێکۆڵینەوەیەک لەمەڕ چۆنیەتیی پەروەردە لە ئێراندا)**

پەروەردەو فێرکردن بە هۆکاری جیاواز لە کوردستان بە قەد ئەو گرینگی و کاریگەریەی کە هەیەتی لەسەر کۆمەڵگە بایەخ و گرنگی پێنەدراوە، فەلسەفەو سیستمی پەروەردە لە کوردستاندا چاوەڕێی ئەوەی لێناکرێت تاکێکی دروست و پەروەردەیی پێبگەیەنێت بەهۆی ئەو کێشەو گرفتانەی هەمیشە دوبارە دەبنەوەو بە دەستیەوە دەناڵێت، هەربۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ قەیرانە جیاوازەکان لە کۆمەڵگەی کوردی پەرەدەسێنن و چارەسەرییەکان زەحمەت دەبن لە ڕاستیدا هۆکارە سەرەکییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شکستی ڕیشەی پەروەردە و فێرکردن! ئەزموونی گەلان پێمان دەڵێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەک پێشبکەوێت و قۆناغی دواکەوتوویی جێبهێڵێت دەبێت سەرەتاو یەکەم هەنگاو لە پەروەردەوفێرکردنەوە دەستپێبکات، قەیران و گرفت و کێشەکانی پەروەردەوفێرکردن لە کوردستاندا جۆراو جۆرو هەمەچەشن و هێندە زۆرن ئێمە لەم نووسینەدا دەتوانین سەرنجی خۆمان لەسەر هەندێکی دەردەبڕین و ئاماژەی پێبکەین، نەوەک هەمووی.

«ڕەنگە ئەگەر بگوترێ ئاییندەی هەر میللەت و وڵاتێک لە قوتابخانەکانییەوە دەخوێنرێتەوە، یان بەلای کەمەوە هێڵە گشتییەکانی ئاییندەی هەر وڵات و میللەتێک تا ڕادەیەکی زۆر لە قوتابخانەکانەوە دەبینرێت و دیاری دەکرێت، ئەمە نەکاتە زێدەڕۆیی. چونکە ئاستی فێرکردن و پەروەردە، ئاستی پێشکەوتن، یان پاشکەوتن دیاری دەکات»(١)،»بۆ ئەوەی کوردستانێکی دیموکرات و پێشکەوتوو بنیات بنێین، دەبێت نەوەیەکی سەربەست و بڕوابەخۆبوو پەروەردە بکەین. بۆ زانینی ئاستی بەرزی و نزمیی کۆمەڵگایەک سەیری منداڵان و گەنجانی ئەو کۆمەڵگەیە بکە. لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤ شێوەو ئاستی پەروەردە و فێرکردنی ئەو کۆمەڵگایە تێدەگات، بۆی دەردەکەوێت کە دەسەڵاتدارانی ئەو کۆمەڵگایە چەندو بە چ شێوەیەک گرنگی بە فێرکاری دەدەن»(٢).

دەبێت ئەوە بزانین کە سەرەتای دەرکەوتنی قوتابخانەی مەدەنی و شارستانی و مۆدێرن لای کورد مێژوویەکی زۆر دووری نییە، بۆ چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، چەند قوتابخانەیەکی کەم لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراو نەوەک لە هەموو کوردستان دەکرێنەوە، «هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم مزگەوت و حوجرە تەنها جێگەی خوێندن و خوێندەواری بوون لە کوردستاندا»(٣)، «حوجرەو خانەکانی فێرکردن، تا سەردەمانێکی درێژ تاکە دامودەزگای فێرکاری بوون، کە پرۆسەی فێرکردنیان تێیدا ئەنجام دەدرا، زانای ئاینی یان مەلاو فەقێ تەنها مامۆستای ئەم بوارە بوون»(٤).

«ئەفلاتۆن پەروەردە بە (هەوڵدان بۆ گەیشتن بە کامڵبوون یاخۆ نزیکبوونەوە لەو پلەیە) دادەنێت،

زاناو فەیلەسوف (جۆن دیوی) پەروەردە بە خودی ژیان دەزانێت، (ئەمیل دۆرکایم) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پەروەردە (بوونێکی کۆمەڵایەتییانە دەداتە مرۆڤ)، (کانت)یش وای بۆ دەچێت گەر بمانەوێت مرۆڤ بگۆڕین ئەوا دەبێت لە هزر و بیرییەوە دەست پێ بکەین کە ئەمیش کارو ئەرکی پەروەردەیە» (٥)، هەروەها «کۆنفۆشیۆس لە کتێبی سروتەکانیدا وتوویەتی: فێرکردن تاکە ڕێگەیە کە شارستانییەت بۆ مرۆڤ دابین بکات، هۆیەکی نموونەییشە بۆ چەسپاندنی ڕەوشت و نەریتەکان و سیستەمە لە بارەکانی ناو کۆمەڵ. ئەوەی بیەوێ پایەداربێ و خۆی ڕۆشنبیر بکات دەبێ پەنا بەرێتە بەر فێرکردن. پارچە تەختەیەک نابێتە تابلۆیەکی جوان بە ڕەندە سفتی نەکەیت، هەروەهاش خەڵک ناتوانن هەست بە گرنگی قانونی ڕەوشت باشی بکەن ئەگەر فێرنەکرێن»(٦).

«ئەنترۆپۆلۆژیستی ئەمریکایی (مارگریت مید) لە زۆربەی توێژینەوەکانیدا جەختی لەسەر پەروەردەیەکی ڕاست و دروست (تەندروست)ی نەوەکان دەکردەوە، ئەو پێی وابوو کە قوتابخانە بناغەیەکی باشە بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی بەرهەمهێن و زیندوو، کە سایەتییەکی وا کە باوەڕی بە هەبوونی ئەو هەموو کولتورو ئایین و ئیتنیکە جیاوازە هەبێت، کەسایەتییەک کە مێژووی وڵاتەکەی بزانێت و، لەوێوە سوود لە دەرفەتە مێژووییەکانی وەربگرێت، کەسایەتییەک کە بە بێ ئەوەی گوێ بداتە هەژاری و دەوڵەمەندی و ڕەگەزو ڕەنگ و دەنگی خەڵک، ڕێزیان لێ بگرێت و، بەرپرسیاریەتیی نیشتمانی هەڵبگرێت»(٧).

١. «شتێکی تازەمان نەگوتووە گەر بڵێین پەروەردەوفێرکردن پڕ بایەخترین پێکهاتەی ئاسایشی نەتەوەییە بۆ هەموو گەلانی جیهان، چونکە ئەو ڕۆڵەی فێرکراو (المتعلم) دەبینێت هیچی لە ڕۆڵی سوپا کەمتر نییە، بگرە تەنانەت پێشینەترەو تەواوکەری یەکتر دەبن.

٢. ئەزموونی ژاپۆن سەلمێنەرێکی زۆر مەزنی ڕۆڵ و بایەخ و هەستیاری بواری پەروەردەیە لە سەرانسەری جیهاندا کە بووەتە مەتەڵێک موعجیزەی زانستییانەی بەرپاکردووە، دەڵێن لە ژاپۆنییەکانیان پرسیوە چ پەنهانییەک هەیە لە پشت ئەو ڕابوونە مەزنەی وڵاتەکەتان؟ ئەوانیش وەڵامیان بەم جۆرە داوەتەوە: (ئێمە بە مامۆستا و فێرکارانمان هەیبەتی دادوەرو دەسەڵاتی ئەفسەرو مووچەی وەزیر دەدەین!).

٣. فەیلەسووفی ئەڵمانیی (فیتشە) دەڵێت لەو ساتانەی سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن ڕەشبینی و پشت ساردبوونەوەی لای ئەڵمانەکان دروست کرد لە سەدەی نۆزدەمدا، وای بۆ دەچووین کە شکستەکان پێش ئەوەی سەربازیی بن شکستی پەروەردەیی بوون، بۆیە ڕزگاربوونمان تەنیا لەوەدایە سیستمی فێرکاریمان بگۆڕین بە پەروەردەیەکی نوێ و سەردەمییانە!»(٨).

پەروەردەو فێرکردن هێندە کایەیەکی گرنگ و هەستیارە دەتوانین بڵێین وڵاتانی پێشکەوتوو گەر کێشەو گرفتێکیان هەبێت دەگەڕێنەوە بۆ لایەنی پەروەردە و فێرکردنیان بۆ ئەوەی بزانن سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانەکانیان ناگەڕێتەوە بۆ بوونی گرفت لە پەروەردەو فێرکردنیان! «سەروەختێک ئەڵمانیا لە جەنگی نێوان ئەڵمانیاو فەڕەنسا لە ساڵانی ١٨٧٠ بۆ ١٨٧١ سەردەکەوێت، سەرکردەیەکی ئەو وڵاتە دەڵێت: مامۆستای قوتابخانەی ئەڵمانیا سەرکەوت. فەڕەنسا کە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا شکستی هێنا، سەرکردەیەکی فەرەنسا دەڵێت: پەروەردەی فەرەنسا دواکەوتووە. کە ڕووسەکان دەستیان گەیشت بە بۆشایی ئاسمان و غەزووی فەزایان کرد، سەرکردەیەکی ئەمریکی دەڵێت: سیستمی پەروەردەی ئێمە چیی لێ قەوماوە و بۆ وای لێهاتووە؟»(٩).

«قەیرانی پەروەردە یەکێکە لە هەرە قەیرانە کوشندەکانی کۆمەڵگای ئێمە، ئاشکرایە ئەم قەیرانە پەیوەندییەکی ئۆرگانی بە تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتی

و فەرهەنگی ئێمەوە هەیە، ئەمە کێشەیەک نییە تایبەت بەو کەسانەی لە بواری پەروەردەدا کاردەکەن، بەڵکو کێشەیەکی گشتییە کە تەواوی کۆمەڵگا دەبێت قسەی لەسەر بکات. کێشەی پەروەردە تەنیا کێشەی مامۆستایان نییە بە تەنیا، بەڵکو کێشەی هەموو ئەوانەیە کە خەون بە گۆڕانەوە دەبینن. کێشەی فەرمانبەرانی پەروەردە نییە، بەڵکو کێشەی هەموو ئەو هێزانەیە کە بیردەکەنەوە»(١٠)، دەتوانین بڵێین: «ماوەیەکی یەکجار زۆرە قوتابخانەکانی ئێمە ڕوویان لە قیبلە نییە، چونکە سەرجەمی ئەو پێوەرانەی کاری لەسەر دەکەن لە پێوەرە پەروەردەییە هاوچەرخەکانەوە زۆر دوورن. ڕاپەڕین لەبری ئەوەی بکرێتە خاڵێکی وەرچەرخان بۆ بنیادنانی سیستمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی، تەنیا وەکو ڕووداوێکی جەماوەریی گەورەی ڕووت مایەوەو ئەوەی لێ سەوز نەبوو کە بەتەما بووین. پرۆسەی پەروەردەوفێرکردنیش بە میتۆدگەلێک بەڕێوەدەبرا، زۆر لە میتۆدەکانی کاتی بەعس خراپتر بوون. بە درێژاییی ئەو هەموو ساڵانە تەنیا یەک وەزیری پسپۆڕیش دانەمەزرا بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەک بخاتە نێو سیستمی پەروەردەییەوە»(١١).

«ئەگەر بمانەوێت سیستمی پەروەردەیی وڵاتێک بگۆڕین، بیرکردنەوەی مامۆستایان و خوێندکاران بگۆڕین، ڕۆحێکی داهێنەرانەو هاوچەرخ لە منداڵەکانماندا دروست بکەین، ئەوە دەبێت بە هەر نرخێک بووبێت دیداکتیکی خوێندنگاکان بگۆڕین. دیداکتیک، باڵکێشترین بەشی سیستمی پەروەردەیە، کە ئاڕاستەی گەشەسەندنی مەعریفیی منداڵان و خوێندکاران بەرەو ئاراستەیەکی بونیادگەرایانە دەگۆڕێت. بەشێوەیەکی دیکە، سێ بەشی سیستمی فێرکاری لەسەر دیداکتیک ڕاوەستاوە. بە بۆچوونی ژان پیاژێ، دیداکتیکی باش گۆڕانکاریی زۆر گەورە لە ژیانی منداڵەکاندا دەهێنێتە ئاراوە (١٢)، نموونەی ڕاپرسی مامۆستایەکی عەرەب بە نموونە دێنینەوە کە لەسەر خوێندکارەکانی خۆی دەکات، نموونەکە لە دونیای پەروەردە و فێرکردنی کوردستانیشەوە نزیکە و دەتوانین بڵێین هاوشێوەی یەکن و جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە! بۆ جارێک» مامۆستایەکی عەرەب پرسیارێک لە خوێندکارەکانی دەکات لە بارەی ئەوەی ئایا هۆکاری خۆشنەویستنی مەکتەبیان بۆچی دەگێڕنەوە؟ ئەو مامۆستایە دەڵێت: کەس نییە لە خوێندکارەکان باشتر وەڵامی ئەم پرسیارەی من بداتەوە، کاتێ وەڵامەکانیانم وەرگرتەوە، قەناعەتم کرد و بە دە پەنجە بۆم مۆرکردن. من لێم پرسین: بە باوەڕ و بیروڕای ئێوە، بۆچی ئێمە جاران قوتابخانەمان خۆش دەویست؟ ئەمە وەڵامەکەیان بوو: زۆر بە سادەیی چونکە ئێوە لە ژینگەیەکی تا بڵێی هەژار لە ڕووی مەعریفییەوە دەڕۆشتنە ژینگەیەکی دیکە کە لە ڕووی مەعریفییەوە دەوڵەمەندتر و باشتربوو. دواتر پێم وتن: باشە ئێوە لەمڕۆدا بۆچی قوتابخانەتان خۆش ناوێت؟ وتیان: چونکە هاوکێشەکە تەواو پێچەوانە بووەتەوە. ئێمە لە ژینگەیەکی مەعریفیی پێشکەوتووەوە، دەگوازینەوە بۆ ژینگەیەکی مەعریفیی زۆر هەژار»(١٣)،»مامۆستا وەک بەشێک لە پرۆسەی فێرکردن، پێویستە بەردەوام یەک ئامانجی سەرەکی لەبەرچاو دابنێت، ئەویش چۆن دەتوانێ بە شێوەیەکی تەندروست قوتابیانی بەرەو پێشەوە ببات. مامۆستا تەنها کاری وانەوتنەوە نییە لەناو پۆلدا، بەڵکو وەک فاکتەرێکی سەرەکی هەژمار دەکرێت بۆ وروژاندنی فێرخوازان و ئاڕاستەکردنی هزرو سۆزیان بۆ بابەتە جیاجیاکان! بۆیە درککردن بە گرنگی مامۆستا یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی پرۆسەی فێرکردن. چونکە مامۆستا وەک کەسێکی پسپۆڕ لە بوارەکەی و شارەزا لە بواری پەروەردەدا دەتوانێت بەشێوازێکی تەندروست مامەڵەی قوتابیانی بکات»(١٤)، بەداخەوەین فێرکردن، لە زۆربەی وڵاتانی پاشکەوتوودا، کە کوردستان یەکێکە لەو وڵاتانە، چ وەکو میتۆدو شێواز، چ وەکو ناوەڕۆک و بابەت زۆر سەرقەو کاڵ و کرچ و ناواقیعییە. شێوازی فێرکردن تاکو ئەمڕۆش تەلقینییە، ئاسۆییەو بەیەک ڕاستە ئاڕاستەتەدا دەڕوات، لە مامۆستای هەموو شت زان و عەماری زانست و زانیارییەوە بۆ قوتابی نەزان و هیچ نەزان، هەموو شتێکی بەسەرا دەسەپێنرێ، بێ

ئەوەی ڕێگە بدرێ گەنگەشەو موناقەشە بکات، دیالۆگی لەگەڵدا بکرێت، یان مێشکی بخرێتە کار.. هەندێ مامۆستا بە خۆیشی هەر کەچە سیواتێکی هەیەو بۆ ئەوەی دەستەکەی نەکەوێتە ڕوو، هەڕەشەی ئەوە لە قوتابی دەکات، کە ئەگەر لە تاقیکردنەوەدا کتومت وەکو کتێبەکە نەنووسێت دەری ناچێنێ..»(١٥)

«پەروەردەو فێرکردن هەر تەنیا دیسپلینێکی زانستی، یان مەهارەتێکی پیشەیی، یان بڕێک لە خزمەتکردن نییە بە کۆمەڵگاو دەستەیەکی تایبەت لە ئێستادا، بەڵکو هەڵوێستێکی ئەخلاقیانەشە لە ئاست داهاتوودا. هەڵوێستێکی پێشوەختی ئەخلاقیانەیە کە بەرجەستەکەری ئیلتیزامی ئێمەیە لە ئاست ئەوانیتری هاوچەشندا(١٦)، بێرتراند ڕەسڵی فەیلەسوف لە کتێبە گرنگەکەیدا بەناوی (دەربارەی پەروەردەکردن) دەنووسێ: «من بۆ خۆم لەو فاکتەرانە تێئەگەم، کە بوونەتە زەمینە بۆ هەڵگیرسانی جەنگ و خوێنڕژانی مرۆڤەکان و شەڕەنگێزی و ستەم و ئازارو ئەشکەنجەدان. بەلای منەوە فاکتەرەکان ئەو جۆرە مامۆستایانە بوون، کەوا تێگەیشتوون و وا بیریان کردووەتەوە، پەروەردەکردن ئەبێت بە ڕێگەی ئەشکەنجەدان و زەبرو ئازاردان و لێدان بێت. وا تێگەیشتوون، کە بەڕێگەی سزادان ئەتوانن منداڵ فێربکەن، کە ڕەوشتی سزا نەمێنێت تیایاندا. یەکێکیش لەوانە دکتۆر ئارنۆڵد بووە، دیارە بەلایەوە وا بووە کە مامۆستا ئەبێت منداڵ وەک شەیتان تەماشا بکات. جێگەی داخە تا ئێستاش ئەم چەشنە تیۆریە کاری پێ ئەکرێت، کە گەورە بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ منداڵدا بکات، لەسەر هەڵە سزای بدات»(١٧).

«یەکەی چاودێری حکومەتی خۆجێی لە گەرمیان کە ژمارەیەک ڕاپۆرتی کردوە لەسەر کایە جیاوازەکانی پەروەردە بەناوی (ڕاپۆرتی چاودێری ڕەوشی پەروەردە) بە شێوەی مەیدانی، ئەم یەکەیە سەربە ڕادیۆی دەنگە لە شاری کەلار و بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی ئەمریکی (NED) دامەزراوە، لە بیستەمین ڕاپۆرتیاندا کە ئەنجامیانداوە دەربارەی (توندوتیژی بەرامبەری خوێندکار)ە، بەروارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مانگی ئایاری ٢٠١٩، لەوێدا خوێندکار و کەس و کاری خوێندکارو مامۆستایان و توێژەرانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و بەرپرسانی پەروەردەیی لەو بارەیەوە بۆچوونی خۆیان دەردەبڕەن، یەکێک لە خوێندکارەکان بەناوی ئاڤێستا حەیدەر باوەخان قوتابی قۆناغی هەشتەمی بنەڕەتی لە قوتابخانەی (مەتینی) بنەڕەتی لە قەزای کەلار دەڵێت: هەندێکجار توندوتیژیمان بەرامبەر کراوە بە قسەی نەشیاو پێمان ئەڵێن (بێخاوەن) یان پەروەردەتان نییە یان (لەکارکەوتوو) یان دایک و باوکتان نییە تەربێتان بدات، هەردوو ڕەگەزی مامۆستایان ئەم وشانە بەکارئەهێنن. هەروەها محەمەد لوقمان محەمەد قوتابی قۆناغی شەشەم لە قوتابخانەی ژین لە قەزای کەلار دەڵێت: هەندێکجار توندوتیژیمان بەرامبەر دەکرێت، ئەوەشی هەیە قسەی نەشیاوە، وەک وشەی (کەر) یان (حەیوان)»(١٨)، « ئاکۆ عومەر باوکی فێرخوازێکە باس لەو توندوتیژیە دەکات بەرامبەر منداڵەکەی کراوە و دەڵێت: لەسەر ئەوەی نەچۆتە ناو ساحە لە کچەکەمیان دابوو، بە لێدان دابویان لە پشتی تا دوو ڕۆژ ناوسکی ئازاری هەبوو، پێشیان وتبوو قسە مەکە لەماڵەوە و قەڵەم و دەفتەری وێنەیان بۆ کڕیبوو کە قسە نەکات، هەتا خوشکەکەی پێی وتین مامۆستا لێیداوە (١٩). لە ڕاستیدا ئەو جۆرە لە هەڵسوکەوتە دەتوانین بڵێین لە شوێنە جیاوازەکانی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی هەیە و کەلار و گەرمیان تەنها نموونەیەکی بچووککراوەیە،»دەبێت قوتابخانە قوتابیەکان فێری ئەوە بکات کە توانای تێگەیشتنیان لە شێوەی ژیان و بیرکردنەوەی کەسانی تر هەبێت. ئەو کات قوتابی بیر لە سەرکوتکردن و بەکارهێنانی زەبر و زەنگ ناکاتەوە. لەم ڕوانگەیەوە شارەزابوون لە کولتوور و داب و نەریتی گەلانی تر و ڕێزلێگرتنیان دەبێتە ئەرکێکی تری قوتابخانە، بەمەش مرۆڤی ئاشتیخواز بەرهەمدێت کە بۆ چارەسەرکردنی جیاوازی، ڕێگەی گفتوگۆو دیالۆگی شارستانی لە جیاتی بەکارهێنانی زەبر و زەنگ دەگرێتەبەر. گەیاندنی زانست، پەروەردەکردن و ئامادەکردنی قوتابیان بۆ ژیانی گەورەساڵی، ئەرکی سەرەکیی هەموو قوتابخانەیەکە

که بەها بنەماییەکانی قوتابخانە ڕێگەنیشاندەر و سەروەربن»(٢٠)، نووسەر و ئەکادیمیستێکی ژاپۆنی هەیە بەناوی (نوبوئاکی نوتوهارا) لە کتێبێکی خۆیدا ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوە لەو وڵاتە عەرەبییانەی تێیدا بۆ ماوەیەک ژیاوە کتێبەکە ناوی (عەرەب لە ڕوانگەیەکی ژاپۆنییەوەیە، لە شوێنێکدا باسی جۆری پەروەردە و فێرکردن دەکات و سەرگوزەشتەی خۆی دەگێڕێتەوە کە دیسانەوە دەڵێی باسی هەندێک شوێنی کوردستان دەکات! جا ئەگەر بەو شێوەیە جەستەییەش زۆر نەبێت لە کوردستان بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا بەڵام توندوتیژییە زارەکی و ڕەمزییەکان هەر زۆر زۆرە! (نوبوئاکی نوتوهارا) دەڵێت: «جارێک سەردانی قوتابخانەیەکی قۆناغی بنەڕەتیی عەرەبیم کرد، منداڵەکان بە هێوری ڕیز بووبوون و هەموو قوتابیەکان بێ دەنگ بوون، پاشان چوونە هۆڵی خوێندن. پێنج خولەک تێپەڕی قوتابخانەکە وەک ئەوەی شوێنی تێڕامان و خواپەرستی بێت و لەناکاو دەنگەکان تەقینەوەو لە پشت دەرگای هەموو پۆلەکانەوە دەنگ دەهات، دەنگی منداڵان کە دەگریان و هاواریان ئەکرد و لە مامۆستاکان دەپاڕانەوە. لەوەش تێگەیشتم کە لێدان دەستی پێکرد. هەتا ئێستاش لێدان ڕێبازێکی بەکارهێنراوە لە زۆربەی قوتابخانە عەرەبییەکاندا. سەردانەکانم بۆ قوتابخانە عەرەبییەکان دووبارە دەکردەوەو زۆربەی جار هەمان ئەنجامم دەست دەکەوتەوە. سەرکوتکردن بەم شێوەیە دەست پێ دەکات، لە دەسەڵاتی باوکەوە لە ماڵەوە بۆ دەسەڵاتی مامۆستا لە قوتابخانەو بەم شێوەیە منداڵ سەرکوتکردن دەکات بە بەشێک لە بوونی خۆی»(٢١).

«بۆ پێشکەوتن لە پەروەردەکردن و فێربوون و کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانی تردا، هیچ ڕێگەیەک نییە، جگە لە ڕێگەی زانست و بەکارهێنانی خۆشەویستی. خۆشەویستی بە بێ زانست، ناتەواوە. زانستیش بە بێ خۆشەویستی، وێرانکەرە». فێربوون پێویستە ئاماژەو نیشانە بێت بۆ خۆشەویستی، بە ئامانجی وروژاندنی هەستی خۆشەویستی لە منداڵدا. دەنا ئەبێت بە ئامرازێکی زیانبەخش. خۆشەویستی منداڵ لەو کۆمەڵانەدا هێزێکی کارایە و ئاماژەیە بۆ کەمبوونی مردنی منداڵان و باشیی پەروەردەیان»(٢٢)، «تێڕوانین بۆ پەروەردەوخوێندن لە وڵاتە دیموکراتییەکانی جیهاندا لە تێڕوانین بۆ مرۆڤەوە دەستپێدەکات. مرۆڤی سەرەکیش لە سیستمی فێرکاریدا خوێندکار و قوتابییە. تێڕوانینی بەرز بۆ مرۆڤ لە دیدی بەها بنەماییە مرۆڤایەتییەکانەوە، پرۆسەی خوێندنی لای قوتابی خۆشەویست کردووە. هەموو مرۆڤێک منداڵ یا گەورە، کە ڕێزی تاکە کەسیی لێگیرا، دەتوانێت بە ئاسانی ڕێز لە بەرامبەرەکەی بگرێت و ئەو کارەی دەیکات خۆشی بوێت. بۆ ئەوەی پرۆسەی فێرکاری لە کوردستاندا پرۆسەیەکی سەرکەوتوو بێت دەبێت خوێندکار یا قوتابی بکرێت بە ناوەند. دەبێت هەموو پرۆسەکە لە خزمەتی قوتابیدا بێت. هیچ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ڕوونادات ئەگەر قوتابی ناوەند نەبێت، ئەگەر مامۆستا و بەرپرسیارانی پەروەردەیی لە قسەو گوتاریاندا، لە کردار و ڕەفتاریاندا، لە هەڵسوکەوت و بۆچونیاندا خوێندکاریان نەکردبێت بە ناوەند و ڕۆڵی سەرەکی سیستمی فێرکاریان نەدابێتێ»(٢٣).

«نابێت کۆمەڵگا دواکەوتنی خۆی بەسەر سیستمی پەروەردەدا بسەپێنێت، بە پێچەوانەوە دەبێت پەروەردە گەشەی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنێت. ئەوانەی کە ڕایان وایە پەروەردە دەبێت ئاوێنەی کۆمەڵگابێت، گەورەترین دوژمنەکانی پەروەردەن، بە پێچەوانەوە قەدەری پەروەردە و کەسی پەروەردەساز ئەوەیە کە لە کۆمەڵگا نەچێت و پێوەرەکانی دووبارە نەکاتەوە. هەرکات پەروەردە کەوتە دووبارەکردنەوەی خۆی، کەوتە پاراستن و بەرهەمهێنانی ئەو دۆخەی کە باڵادەستە، ئیدی چیتر پێویستی بە بانگەوازی نوێکردنەوە نابێت»(٢٤)، لە کوردستاندا ئەوەی تێبینی دەکرێت پێوەر و هەڵە باوەکانی دەرەوەی قوتابخانە زۆرجار بەسەر قوتابخانەدا دەسەپێنرێت، کە لە ڕاستیدا ئەمە پێچەوانەی ئامانجی دروست و زانستی پەروەردە و فێرکردنە، دەبێت قوتابخانە دەستکاری کۆمەڵگە بکات و ناشرینیەکانی بگۆڕێت بە جوانی، بۆ نموونە جار بەجار هەندێک دەنگۆ دەبیستین بۆ جیاکردنەوەی کوڕ و کچ لە قوتابخانەکان، لە کاتێکدا هیچ ئەرگۆمێنتێکی

زانستی نەیسەلماندوە هۆکاری دواکەوتنی خوێندن لە کوردستان هۆکارەکەی تێکەڵاوییە! لە کاتێکدا» د. جەمال نەبەز لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا لە باسی خوێندکاری خۆیدا لە حوجرەدا کە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەڵێت:» لەم حوجرانە (قوتابخانانە) دا منالآن (کوڕ و کچ) پێکەوە دەیانخوێند. ئەوەش هەر لە کۆنەوە وابووە. مامۆستا مەل او خەلفەکەی بۆیان هەبووە منداڵی کوڕ فەلاقە بکەن، بەلآم کچیان فەلاقە نەکردووە (٢٥)، مەلا کاکە حەمە حاجی سەیفولآ هاوشێوەی نەجمەدینی مەلا یەکێک لەو کەسانە بووە کە ڕۆڵی هەبووە لە خوێندەوارکردنی لاوانی کورد وەک ئەوەی باسی ئەمڕۆی کوردستان بکات دەڵێت: «خەڵق خوێندنی بۆ یەکێک لەم شتانەیە و بۆ زانیاری نییە، بێتە مەلا تا خۆی بە خەڵق بژێنێ و بەرزتر بێت لە خەڵق، بێتە مەئمور قیروسیا لە ئازادی مەجبوریش بێت بە قەسوەت بێ لەگەڵ خەڵقدا، بۆ ئەوەی نەخوێندەوار و نەزان بخەڵەتێنێ، جا ئەم سێ شتانە لای من دەستناکەوێ»(٢٦).

«سیستەمێکی پەروەردەیی باش کە تیایدا مرۆڤ ئامانج بێت، بەبێ تێگەیشتنێکی فەلسەفیی لە مرۆڤ و ڕوانگەیەکی پەروەردەناسیانە بۆ زانین و فێربوون، سوودی خۆی نابێت. جیاکردنەوەی سیستەمیی پەروەردەیی لە دانایی فەلسەفیی لە بارەی مرۆڤ و تواناو پێویستییەکانیەوە، دەبێتە سیستەمێکی لەدەرەوەڕا جوانکراو و ڕازاوەو لە ناوەوەڕا بۆش و بەتاڵ کە بۆی هەیە هەموو بیروڕایەکی دژە پەروەردەییانە و بگرە دژە مرۆییانە تیایدا سەرهەڵبدات. سیستەمی پەروەردەیی ئێمە لە پازدە بیست ساڵی چوودا، هەمیشە لە هەوڵی خۆجوانکرندا بووە و بە بارتەقای ئەوەش لەناوەڕۆکە پەروەردەناسیی و فەلسەفییەکەی خۆی بەتاڵکراوەتەوە و بۆتە سەکۆی ساخکردنەوەی ململانێ سیاسی و حزبییەکان. جگە لە ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیە لە ئاستی زمان و زاراوەسازییدا بۆ ناسینەوەی بەشەکانی ئەو سیستەمە بە پێی ئەو لایەنە سیاسییەی سیستەمەکەی بەسەردا دابەشبووە، (وەک بەکارهێنانی زاراوەکانی خوێندکار و قوتابیی و فێرخواز بۆ هەمان مەبەست)، ئەوە خودی سیستەمەکە لە بەردەم هەرەشەی بنەما مێژووییەکانی خۆیدا بووەو هەوڵێکی شێلگیرانە دراوە بۆ ئەوەی هەر لایەنێکی سیاسیی لە هەر کونێکەوە بۆی هەڵکەوتبێ، گۆڕانێک لە ئەدەبیاتی سیستەمەکەدا بکات و بە شێوازێک وانەو ماترییاڵە دەرسییەکان دابڕێژێتەوە کە خزمەت بە بنەما ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی بکەن»(٢٧).

« لە وڵاتانی پێشکەوتودا، بە بەردەوامی لەگەڵ گۆڕان و بەرەوپێشەوە چوونی کۆمەڵگادا، سیستمی فێرکاری دەگۆڕدرێ»(٢٨)، هەندێکجار بەناوی دڵسۆزی و داهاتووی کوردستان و خەمی نەوەی داهاتوەوە لە کوردستاندا بڕیاری گۆڕانکاری دەدرێت، بەلآم ئەو گۆڕانکارییانە زۆر نابات یان شکست دەهێنێت یان لێی پەشیمان دەبنەوە! بۆیە وەک ڕەسڵ بێرتراند دەیڵێت: «دڵسۆزی مەرج نییە بە تەنها، بەڵکو پێش دڵسۆزی لێزانین گرنگە، کاتێک شتێکی بیناکراو دەڕوخێنین، دەبێت پێش ڕوخاندن زانیبێتمان کە دروستکراوی نوێمان لە جێگەی ڕوخاوەکە باشترو چاکترو سوودمەندترە»(٢٩).

لە کۆتاییدا دەڵێین: «ئینستتیوی پەی بۆ پەروەردەو گەشەپێدان(PAY) کە ڕێکخراوێکی ناحکومییە، لە ڕاپۆرتێکیدا دەربارەی هەڵسەنگاندنی ڕەوشی پەروەردە لە کابینەی هەشتەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان(٢٠١٤-٢٠١٨) کە لە کانونی دووەمی ٢٠١٩ بڵاوکراوەتەوە بە قەبارەی ١٥٨ لاپەڕە بەناونیشانی (پەروەردە لەبەردەم ئاڵنگاری و گرفتی چارەنەکراودا) لە هەژدە تەوەرەی جیاواز و لە ١٢٧ خاڵدا کۆی کێشەو گرفتەکانی پەروەردەو فێرکردنی خستۆتەڕوو، بە داتاو زانیاری وورد و هەندێک جاریش گەڕاوەتەوە بۆ دۆخی پەروەردەوفێرکردن بۆ ساڵانی پێش ٢٠١٤» لەو ڕاپۆرتەدا تێبینی دەکەیت و زیاتر بۆت ڕوون دەبێتەوە و ئەوەت بۆ دەسەلمێنێت کە پەروەردە و فێرکردن لە کوردستاندا لەسەر هێڵێکی چەوتە!(٣٠)

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. حەمەکەریم عارف: مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٣.
٢. هۆمەر قەرەداخی: سیستمی فێرکاری، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١١، ل٦٩.
٣. د.ئاراس محەمەد ساڵح: هۆیەکانی گەشەکردنی بزاڤی رۆشنبیری لە شاری سلێمانیدا ١٧٨٤-١٩٥٨، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٥، ل٢٤.
٤. خالد مەحمود کەریم: باشوری کوردستان لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٩، ل١١.
٥. تەها محەمەد ئەمین: گرفتە پەروەردەییەکان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٥.
٦. حەمە کەریم هەورامی: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.
٧. کۆمەڵێک نووسەر: پەروەردە لە تێهزرینی کۆمەڵناسی و دەروونناسیدا، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کوردستان، ٢٠١٥، ل٧٥.
٨. تەها محەمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل١٨-١٩.
٩. هەورامان وریا قانع: پەیوەندیی نێوان مامۆستاو قوتابی» چی لە ناوەوەی قوتابخانەو پۆلەکانی خوێندندا دەگوزەرێت؟، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٢٠، ل١٠٤.
١٠. بەختیار عەلی: هەندێک سەرەنج دەربارەی سیستەمی پەروەردەو ستراتیژی گۆڕانکاری لەم سیستەمەدا، گۆڤاری (سەردەمی رەخنە)، ژمارە(٥)، پاییزی ٢٠٠٦، ل٢٠١.
١١. فایەق سەعید: قوتابخانەکان روویان لە قیبلە نییە، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥.
١٢. فایەق سەعید: دیداکتیک» مۆدێل و میتۆدەکانی وانەگوتنەوە»، چاپی یەکەم، ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکرنەوە،سلێمانی، ٢٠١٩، ل٩.
١٣. هەورامان وریا قانع: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.
١٤. دکتۆر عزالدین احمد عزیز: دەروازەیەک بۆ دەروونزانی پەروەردەیی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٨، ل٢٢٤.
١٥. حەمەکەریم عارف: سفرەی فەقیران، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١٢.
١٦. رێبوار سیوەیلی: (فەلسەفە، رەگەزپەرستی، پەروەردە)، چاپی یەکەم، رێکخراوی زەریاب بۆ خزمەتگوزاریی کولتووری و رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٦، ل١٨١.
١٧. بێرتراند رەسڵ: دەربارەی پەروەردەکردن، و/ جیهاد محەمەد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٨، ل٧٢.
١٨. یەکەی چاودێری حکومەتی خۆجێی گەرمیان» پرۆژەی چاودێری دۆخی پەروەردە»: راپۆرتی بیستەم: توندوتیژی بەرامبەر فێرخواز، ئایاری ٢٠١٩، ل١١.
١٩. یەکەی چاودێری حکومەتی خۆجێی گەرمیان» پرۆژەی چاودێری دۆخی پەروەردە»: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.
٢٠. هۆمەر قەرەداخی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤-١٥.
٢١. نوبوئاکی نوتوهارا: عەرەب لە روانگەیەکی ژاپۆنییەوە، و/کامەران چروستانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، ٢٠١٩، ل٧١.
٢٢. بێرتراند رەسڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٣-٢٧٤.
٢٣. هۆمەر قەرەداخی: سەرچاوەی پێشوو،ل١٢١.
٢٤. بەختیار عەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٤.
٢٥. جەمال نەبەز: بیرەوەرییینامەی ئەو رۆژانەی جارەکی دیی ناگەرێنەوە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ، ٢٠١٧، ل٧١.
٢٦. -زانا قەرەداغی: مەلا کاکە حەمەی حاجی سەیفوڵڵا زانایەکی گومناو» خاوەنی یەکەم پرۆژەی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری لە کوردستان»، چاپخانەی حەمدی، چاپی یەکەم، ٢٠١٩، ل٥٨.
٢٧. رێبوار سیوەیلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٥-٣٦٦.
٢٨. هۆمەر قەرەداخی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨.
٢٩. بێرتراند رەسڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١.
٣٠. ئینستتیوتی پەی بۆ پەروەردەو گەشەپێدان: پەروەردە لە بەردەم ئاڵنگاری و گرفتی چارەنەکراودا، کانونی دووەمی ٢٠١٩، ل٣-٦.

# شوێنپێی زانکۆ
## لە گەشەی شارستانێتیدا





**بوخاری عەبدوڵای قەسری**

لەدایکبووی ١٩٩٠ شاری هەولێر. خاوەنی دوو پەرتوکی وەرگێڕدراوە. مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆی ئیشق

بە موتاڵاکردنی لاپەڕەکانی مێژوو، سەرنج دەدەی هەر ژیار و شارستانیەتێک مرۆڤایەتی لە باوەشی خۆی گرتبێت، بەرهەمی پاشخانێکی هزری و مەعریفی بووە. ژیار و شارستانیەتەکان بەتەنێ لە ئایکۆنە بینراوە پێشکەوتووەکانیان، وەک باڵەخانەی بەرز و بینای شووشەیی و کۆشکی رازێنراوە و تەکنەلۆژیای پەرەسەندوو و باخی دڵرفێن و ڕێ و بانی ئەندازەیی ئاڵۆزکاو؛ پێک نەهاتوون، ڕاستە ئەمانە وێنە سەرپێییەکەی وشەی «شارستانیەت»ن، بەڵام ئەمانە تەنها ئەو ڕەهەندە بە چاو بینراوەی شارستانیەتن کە لەپشت خۆیاندا ڕەهەندی گەورەتر و ریشە قووڵتریان شاردۆتەوە و نابینرێن، چونکێ شارستانیەت پێش ئەوەی گەشەی ئابووری بێت، گەشەیەکی ئەزموونکاریی ئەقڵانییە، پێش ئەوەی سیستمێکی بازاڕی و سیاسی بێت، سیستمێکی فیکرییە و بزاوتێکی مەعرفییانەیە، کە خۆی لەنێو ئاوەز و هۆشی تاکەکاندا ڕۆچوواندووە و پلاری هاویشتووە.

لەپاڵ ئەوەشدا، سەرنج دەدەی کە هەر چی شارستانیەتە بەرهەمی بزووتنەوەیەکی هزریی سەردەمی خۆی بووە، هەر لە ئایین و ئایینزاکانەوە تا ڕێبازە فەلسەفییەکان و ئایدۆلۆژیا و ڕێبیرە سیاسییەکان (بۆ ئەو مەبەستە دەشێت بڕوانیتە پەرتووکی «concept of civilization»ی پرۆفیسۆر بەکر کارلای). بۆیە دانشگا و دامەزراوە پەروەردەییەکان و پەیمانگا زانستییەکان و زانکۆ و فێرگەکان، ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە و دەگێڕن لە فۆرمەلەکردنی ئەم بزووتنەوە هزرییانەی کە شارستانیەت بەرهەم دەهێنن. دانشگا و فێرگەکان هەڵدەستن بە بەرهەمهێنان و برەودان و گواستنەوەی ئەو ئەزموونە کەڵەکەکردووەی مرۆڤ کە لە زانست و فەرهەنگ و کولتوور و هزر و هونەر و ئەدەبدا هەن و خودی شارستانیەت پێک دەهێنن، بۆیە لەم ڕێیەشەوە لەگەڵ ئاوابوونی هەر شارستانیەتێک؛ یەکێکی دی لەدایک دەبێت، چونکە ئەزموونی گواستنەوەی ئەم کەلەپوور و کولتوور و هزر و زانستە نابڕێتەوە و لە ڕێگەی دامەزراوە زانستییەکانەوە برەوی پێ دەدرێت. ئەم نووسینەم دەیەوێت ئەو بۆچوونە ئیسپات بکات کە زانکۆ وەک دامەزراوەیەکی زانستی؛ ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕێت لە دامەزراندنی بەردی بناغەی شارستانیەتدا، وە لەم سۆنگەیەشەوە دەبێت کوردستان کە ئێستا لە قۆناغی نیشتمانسازییە، بە چاوێکی پڕ لە هەند تەماشای زانکۆ بکات.

شارستانیەت خۆی چییە؟ ئەم پرسیارە جێگەی دیبەیت و مشتومڕ و دەنگەشەی جۆراوجۆر بووە، ناتوانین لێرە دەق بە یەک پێناسە بگرین بۆ شارستانیەت. هەندێک لە هزرڤانان و توێژەران وەک «د. ئارون کەی» و «د. نۆربێرت ئیلیاس»، وەها چەمکی شارستانیەت دەناسێنن کە ئەگەر لە هەر مەملەکەتێکدا دۆخێکی پێشکەوتووی ماددی و کولتووری و هزری لەئارادا هەبێت، وە ئەو پەرەسەندنەش لە ئەنجامی هونەر و زانست و تۆمارکردنی نووسین و تەکنەلۆژیاوە هاتبێتە دی، ئەوا ئەو دۆخە پێی دەوترێت «شارستانیەت». توێژەر «گۆردۆن چیڵد» شارستانیەت بە گەشەی «وێژە و هونەر» دەبەستێتەوە، دکتۆر «ئۆسوڵد سپێنگلەر»ی ئەڵمان و دکتۆر «ئیدوارد نێڵ بێرن» جەوهەری شارستانیەت لە «کولتوور» دەبینن، بەو واتایەی هەر ناوچەیەک کولتورێکی دیتراوی پەرەسەندووی هەبێت کە جێگەی بایەخ بێت، ئەوا شارستانیەتی هەیە. بیرمەندی ئەمەریکییش «ساموێل هنتگتۆن» پێیان وایە کە «شوناس» و شەڕی ئەو شوناسە لە پێناو ململانێ و مانەوە بە ڕەهەندی هەرە سەرەکیی شارستانیەت دادەنرێن. ئەمە لە کاتێکدا کە پرۆفیسۆر «ماوریس کرۆزێت»، چەمکی شارستانیەت بە پەرەسەندنی «زانست» و «تەکنەلۆژیا» دەلکێنێت (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

پوختەی قسە لە بارەی چەمکی شارستانیەت ئەوەیە کە هەموو شارستانیەتێک دیاردەیەکی

گەشەکردووی کولتورییە، بە واتای هەستکردن بە شوناس و خاک و خوێن و زمان و بەرگ و نەریت و داب و ڕەسمیات و ئایین و هونەر، بەڵام نابێت لەیادی بکەین کە لە بنەچەدا ئەو گەشەکردنە کولتوورییەش ڕەهەندێکی زانستیی هەیە. ئەگەر بە جۆرێکی میتافۆرییانە بمانەوێت گوزارشتی لێ بکەین، دەتوانین بڵێین: ماکینەی کولتوور و شارستانیەت، بە سووتەمەنیی بزاوتنی زانست وەجووڵە دەکەوێت. لێرەدا دوو نموونە خزمەت بە تێزەکەمان دەکەن:

یەکەم: شارستانیەتی دێرینی دنیای ئیسلام لە قورتوبە و بەغداد و قاهیرە و دیمەشق و ئیسفەهان. ئەم شارستانێتییە (لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا) کە شوناسێکی ئایینیی هەبوو لە هەموو گەشە زانستی و کەلەپووری و ویژەییەکەیدا، دوای ئەوە هات کە بزووتنەوەی مەعریفیی سەردەمی خۆی لەوپەڕی گەشەکردندا بووە لە: وەرگێڕان، نووسینی پەرتووکی زانستی، گفتوگۆی زانایان، ئەزموونی زانستیی ئەبستراکت (ئەزموونی تاقیگەیی)، دەنگەشەی فەلسەفی، دامەزراندنی دانشگا و مەدرەسە و دامەزراوە بەلاغی و فەلسەفی و زانستییەکان... هتد. نابێت ئەوەش بە نادیدە بگرین کە ئەم شارستانێتییە دینییە (سەرەڕای هەبوونی هەندێ گرووپی توندئاژۆی دینی کە دەرگای توێژینەوە و ئیجتیهادی لەسەر خۆی داخستبوو)؛ دەرگای دانەخستبوو بە ڕووی بەرهەمی شارستانێتیی نەتەوە و گەلانی دیکەی دنیا، بەڵکوو سوودی وەرگرتبوو لە توراسی کەڵەکەبووی ژیارەکانی بەر لە خۆی، هەر لە یۆنان و ڕۆمان تا چین و هیند و فیرعەونی... هتد. واتە پاشخانی ئەو گەشە شارستانێتییەی بریتی بووە لە ئەزموونی کەڵەکەکردووی فەلسەفە و زانست. بۆیە سەراپا مێژووی ڕامیاری و ئابووری لە جیهانی ئیسلامدا، دیوە دەرکەوتووەکەی ئەو پاشخانە زانستی و گەشە هزرییە بوونە کە لە بنەچەدا لە واقیعی ئەو دەمەدا لەئارادا هەبووە، جا چ بە زانستە ئەبستراکتییە ئەزموونییەکان بێت (واتە زانستە سروشتییەکان)، یاخود زانستە کۆمەڵایەتییەکان (ئەوەی کە ناسراوە بە زانستە مرۆڤایەتییەکان).

دانشگا و مەدرەسە فەلسەفی و زانستییەکانی وەک «بەیتولحیکمە» (٦٥٦-٧٥٤ی زایینی) و «سەقلییە» و «گرانادا» (٧٩٤ زایینی) و مەدرەسەی پزیشکیی «بایەزید» و مەدرەسەی «قوتبولمەنار» و مەدرەسەی «نیزامییەی بەغداد» و مەدرەسەی «زومرود خاتوون» لە شام و زانکۆیەکانی «قورەوین» و «ئەزهەر»، بناغەی ئەم شارستانێتییە بوون (بۆ ئەم مەبەستە بگەڕێرەوە بۆ توێژینەوەیەکی ماستەر بە ناوی «بیت الحكمة البغدادى و أثره فى الحركة العلمية فى الدولة العباسية»، لە نووسینی ڕوفەیدە ئیسماعیل عەتالمەنان، هەروەها بگەڕێرەوە بۆ ڕاپۆرتی کەناڵی ئەلجەزیرە بە ناوی «قصة المدارس الاسلامية». گەرچی بەداخەوە مێژووی تۆمارکراوی ئەو شارستانیەتە کەمتر خۆی لە قەرەی ئەو مەدرەسە فیکری و زانستیانە دەدات و تەنها لە باس و خواسی زانایە ئایینییە فیقهییەکان و سەرکردە و ڕژێمە ڕامیارییەکاندا خۆی کورت هەڵهێناوە.

نموونەی دووەم: ئەورووپا لەدوای ڕێنیسانس

دوای ئەوەی کە ئەورووپا قۆناغی تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست تێدەپەڕێنێت، پێویستییەکی مێژوویی بۆ ڕزگاربوون لەو تونێلە تەنگ و تاریک و سەختە دێتە دی. دوای ئەوەی کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاست هەژموونی لاهوتییانەی خۆی بۆ ماوەی هەزار ساڵ بەسەر ژیانی مرۆڤی ئەورووپیدا سەپاندبوو، بیرمەندان و فەیلەسووف و زاناکان میتۆدی «زانست» هەڵدەبژێرن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم خودسەپاندنە کولتووری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییە. بۆیە لێرەوە لە قۆناغی «ڕێنیسانس» کە قۆناغی بووژانەوەی فەلسەفە و ئەدەبی کۆنی یۆنانی و ڕۆمانییە، مرۆڤی ئەورووپی هەڵدەستێت بە پەڕینەوە لە قۆناغی دواکەوتن و

بەربەریەت (barbarism) بۆ قۆناغی بیناکردن و بووژاندنەوەی شارستانی (civilization). بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: «Guarnieria & Pietro del Negro Massimo».

لەم قۆناغەدا، زانکۆ و پەیمانگە و دانشگاکانی ئەورووپا نموونەیەکی هەرە زیندووی بەرهەمهێنانی کەرەستە شارستانێتییەکان بوون، وە مەڵبەندی زاوزێکردنی فیکر و چەکەرەکردنی زانست بوون. بۆ وێنە؛ ئینستیتیونی (کۆمەڵگای ڕۆیاڵ -royal society) لە بەریتانیا لە سەردەمی پاشا «چارلسی دووەم» لە ساڵی ١٦٦٠ دامەزرا، وە زانا نیوتن ڕۆڵێکی زۆر کارای تێدا گێڕاوە و بووە بە سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنەش و بەڕێوەی بردووە. ئەم پەیمانگەیە بەتایبەت بۆ گەشەکردنی توێژینەوەی سروشتی و زانستە سروشتییەکان بوو، ڕۆڵێکی لەبیرنەکراو و پڕ لە بایەخی گێڕا بۆ برەودان بە میتۆدی تاقیکاری و توێژینەوە و سەرنجدانی زانستی، لەبریی دۆگما و هزر و بیروڕا پێشوەختە لاهوتییەکانی کڵێسا، وە تەنانەت کاریگەرییەکی زۆر ڕاستەوخۆشی کردە سەر بزووتنەوەی داهێنان و گەشەی تەکنەلۆژیا و پرۆسێسی بەرهەمهێنانی پیشەسازی. جێگەی بایەخە کە ئەوسا مرۆڤی ئەورووپی لەبەردەم دووڕیانێکدا بوو کە ئایا تاقیکردنەوە زانستییەکانی پەیمانگە و زانکۆیەکانی ئەورووپا قبووڵ بکات، یاخود ئەفسانە و حیکایەتەکانی کڵێسا و پیاوانی ئایینیی ئەورووپا!

هەروەها زانکۆی ماچێراتا (Macerata) کە لە ساڵی (١٢٩٠ز) دامەزراوە، زووتریش زانکۆی بۆلۆنا (Bologna) لە (١٠٨٨ز) بە سەنتەری بزووتنەوەی وەرگێڕان و هزری فەلسەفی و گەشەی شارستانێتیی ئیتاڵیا و تەنانەت ئەورووپای سەردەمی ڕێنیسانس دادەنرێن. لەپاڵ ئەو، زانکۆی مورسیا (Murcia) لە ئیسپانیا، کە لە سەردەمی پاشا «ئەلفۆنسۆی دەیەم» لە ساڵی (١٢٧٢ز) دامەزراوە، یەکێک بووە لە مەڵبەندە بەناوبانگەکانی گەشەی زانست و فەلسەفە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە جارێکی تر لەلایەن فەیلەسووفانی مسوڵمانی وەک ئیبن سینا و فارابی و ئیبن ڕوشد خوێندنەوەی تازە بۆ فەلسەفەی یۆنان کراوە، لەوێوە لە ڕێگەی بزووتنەوەی وەرگێڕانەوە ئەو کەلەپوورە یۆنانی و ڕۆمانییە بە ئیزافەی نوێی ڕۆژهەڵاتیشەوە دەبووژێنرێتەوە. ئەم بزووتنەوە هزرییە ئەورووپییە لە بۆشایی و سفرەوە سەری هەڵنەداوە، بەڵکوو لە ڕێگەی زانکۆ و دانشگاکانەوە توانیی پەل بهاوێت بەرەو پانتایی کۆمەڵگەی ئەورووپی و ئەقڵی مرۆڤی ئەورووپی ڕەوشەن بکاتەوە، بەتایبەت لە سەردەمێکدا کە باوەڕکردن بە خوڕافە و ئەفسانەسازی و حەکایەتی بەرئاگردان زۆر پتەوتر بووە لە هزری تاکی ئەورووپی تا ئەزموونی تازەی فەلسەفی و زانستی. بۆ وێنە؛ زانایەکی پایەبڵندی وەک گالیلیۆ گالیلی کە بناخەیەکی بەهێزی زانستی هاوچەرخ و بیرکردنەوەی مرۆڤی هاوچەرخی داڕشت، وە توانیی بوێرانە بەرانبەر بە چەوتییە لۆجیکی و زانستییەکانی پیاوانی ئایینیی ئەورووپا بوەستێتەوە. گالیلیۆ بە هۆی نووسین و دیبەیتەکانی لە زانکۆی «پیزا» و پاشان زانکۆی پادوا (Padua) لە ئیتاڵیا، ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لە تاقیکردنەوە زانستییەکانی و داهێنەرێکی زۆر کاریگەری مرۆڤایەتییش بووە. دیبەیت و مشتومڕە فەلسەفییەکانی گالیلیۆ لە دژی قۆرخکاریی کڵێسا کە پێچەوانەی پشکنینی زانستی تازە بوو، بوونە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی نوێی زانستی لە دنیای هاوچەرخدا. بۆیە لێرە دەشێت بڵێین، زانکۆ وەک کانگایەکی فیکریی دەرچەیەکی زۆر بەهێز و ناوەندێکی زۆر کارای خڕکردنەوەی ئەو بیرمەندانە بووە بۆ خستنەگەڕی توانستەکانیان و پێگەیاندنی نەوەیەکی بیرکەرەوەی خوێنەر و پشکنەر و دۆزەرەوە، چونکە تەنها ناوی چەند کەسێکی کەمی وەک کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ و فرانسیس بیکۆن کیپلەر و لاپلاس لەنێو فەرهەنگە زانستییەکاندا

تۆمار کراوە، بەڵام هەزارەهای تریش هەبوونە کە لەو جەنگەدا بەشدارێکی کارا بوونە و مێژوو وەک پێویست تۆماری نەکردوون (بڕوانە پەرتووکی «Galileo Decisive inventor»ی میشێل شارات. هەروەها بۆ زانینی ژیانی ئەم بیرمەندانە، بڕوانە «Great Thinkers A–Z»، نووسینی ژۆلیان و جێرێمی).

کاکڵەی باس لێرەدا ئەو پرسیارەیە کە چلۆن دانشگا و زانکۆ، ڕۆڵیان لە برەوی شارستانێتیدا دەگێڕن؟

بۆ ئەم مەبەستە دەبێت ئەوەمان لەلا ڕوون بێت کە ئەوە سەرچاوە سروشتییەکان (وەک کانزا و نەوت و ئاو و خۆر و خاک... هتد) نین کە دەبنە هۆی پێشخستنی ئابووری و ڕەوتی ژیانی مرۆڤ، وە هۆکارە جیۆگرافییەکان بەتەنیا نابنە هۆی دروستکردنی هیچ شارستانیەتێک، بەڵکوو ئەمانە کەرەستەی بەکاربراون لەلایەن سەرچاوە مرۆییەکانەوە (human resources)، دەبێ بزانرێت کە ئەوە ئەقڵ و هۆشی مرۆڤە کە لە توانستیدا هەیە ڕژێمی ڕامیاری و ستراکچەری ئەو ڕژێمە دابمەزرێنێت و بازاڕ بجووڵێنێت. وە ئەو ئەقڵەی مرۆڤە کە دەتوانێ کەرەستە و ئامێر دابهێنێت، ئەو کەرەستە و ئامێرەش بەرەو تەکنەلۆژیای ئاڵۆزتر برەوی پێ دەدرێت و شارستانیەت گەشە پێ دەدات، وە مرۆڤ ئەو بلیمەتییەی هەیە کە بیرۆکەی نوێ بخاتە کار لە پێناوی بنیاتنانی شار و دروستکردنی پیشەسازییانە و ئەندازەسازیی باڵەخانەییدا، ئەمەش بەرهەمی «ئەقڵ»ە، بۆیە لێرەدا پێگەیاندن و پەروەردە ڕۆڵێکی هەرە کاریگەر و کارا دەگێڕن.

بەم چەشنە، بەرکۆڵ و بناغەی شارستانیەت بریتییە لە ئامادەکردنی ئەقڵ و ڕاشناڵی شارستانییانە. ئەم ڕاشناڵە لە چیدا دروست دەبێت؟ گواستنەوەی مەعریفەی کەڵەکەکردوو لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە، وە ڕەخنەگرتن لە زانیارییە ئەزموونکراوەکان، فێرکردنی کارامەییە نوێیەکان لە دانشگا پەروەردەییەکان، ئەمانە دەبنە هەوێنی زۆر باش بۆ ئامادەکردنی ئەقڵی شارستانی. تەنانەت ڕەفتاری مۆراڵییانەش کە لە کۆمەڵێک بەها و پرەنسیپی ژیاری پێک دێن، هەر لەو دانشگا و زانکۆیانەوە برەویان پێ دەدرێت بەوەی کە تاک لەسەریان گۆش دەکرێت، دواتریش دەچنە ژێرخانی شارستانێتییەوە.

زانکۆیەکان دەتوانن ببن بە پردێک لەنێوان شارستانیەتێکی پیر کە مێژووی پڕە و خۆری بەرەو ئاوابوونە بۆ شارستانیەتێکی گەنج کە تازە چرۆی دەکات، ئەمەش لە گواستنەوەی ئەزموونە فیکرییەکان و زانستە دۆزراوەکان و بەجیهانیکردنی توانستە مرۆییەکان دێتە دی. ناوەندەکانی فێرکردن دەبنە ئەو چەقەی کە توانستە مرۆییەکان تێیدا دەدۆزرێنەوە و برەویان پێ دەدرێت و کادیری تازەی پڕ لە بەرهەم بۆ کۆمەڵگە ئامادەساز دەکرێت کە بە ڕۆڵی پێشخستنی ژیاری هەڵدەستێت. ئەمە فەلسەفەیەکی پەروەردەییە کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتریشە و لێرە دەرفەتم نییە، ڕەنگە لە وتارێکی دیکەدا زیاتر بیتوێژینەوە (بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: توێژینەوەکانی پۆڵ چاتێرتۆن لە زانکۆی لیدس و کۆربۆر ستیفتۆنگ لە زانکۆی هامبۆرگ).

پۆڵ چاتێرتۆن لە توێژینەوەیەکدا بە ناوی «شوێنپێی کولتووریی زانکۆ لە کۆمەڵدا)، تیشک دەخاتە سەر ئەو بۆچوونە کە ناوەندی زانکۆ کاراترین؛ ناوەندی کۆمەڵە لە پرۆسەی دەوڵەتسازیدا (nation building)، کە بێگومان پرۆسەی دەوڵەتسازی ئەوپەڕی قۆناغی گەشەی شارستانێتییە لەنێو نەتەوەکاندا، وە پەڕینەوەیە لە ڕاشناڵی خێڵایەتی بۆ ڕاشناڵی بەدامەزراوەییکردن و مەدەنیەت. بۆیە دەوڵەتسازی قۆناغێکی لەسەرەخۆ و هێواشە، وە بە پلەبەندی و پلانەوە دەڕوات بەڕێوە. زانکۆ یەکێکە لە سەرەکیترین ئەو جەمسەرانەی کە لە ڕێگەی ڕێبەرە فیکرییەکانیەوە ئاڕاستەی ئەو قۆناغی بەدەوڵەتبوونە

دەکات. لەم سۆنگەیەوە ئێمەی کوردیش ئەگەر بمانەوێت بە بەرنامەداڕشتنەوە بەرەو قۆناغی بەدەوڵەتبوون بڕۆین، دەبێت هۆشیارانەتر لە پێگەی زانکۆ وەک ناوەندێکی هزری بڕوانین و ئەرکی زانکۆ لە زیادکردنی ڕاشناڵی زانستییانە پتر گرنگیی پێ بدرێت.

زانکۆ ئەرکێکی هەرە گرنگ لە گەشەدان بە کولتووری ژیاری و شارستانی دەگێڕێت. یەکێک لە ڕەهەندەکانی کەڵچەری شارستانی لە دنیای ئێستادا، بریتییە لە قبووڵکردنی «فرەیی کولتووری» کە لە ناوەندە پەروەردەییەکاندا پێی دەوترێت «cultural diversity». پوختەی ئەم فرەییە کولتوورییە ئەوەیە کە دەبێت تاک لە دنیای هاوچەرخدا لەوە حاڵی ببێت کە چیتر کۆمەڵگە لە یەک نەتەوە و یەک ئایین و یەک خوێن پێک نایەت، وە سەردەمی تاکڕەنگی و تاکجەمسەری لە کۆمەڵگەدا بەسەر چووە، ئێستا بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگەی مرۆیی؛ فرەیی و هەمەجۆریی تێدا هەیە، ئەم فرەییەش بەسەر ئەم حەوت جۆرە دابەش دەبێت:

١. فرەیی ئایین
٢. فرەیی شێوەژیان و نەرێت (نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان)
٣. فرەیی ڕەگەز و خوێن
٤. فرەیی زمان
٥. فرەیی ڕەنگ
٦. فرەیی بیروڕای ڕامیاری
٧. فرەیی ئیتنیک و گرووپی کۆمەڵایەتی (وەک مەزهەب)

زانکۆ فێرخوازانی فێر دەکات کە ڕێز لە فرەیی نەتەوە و ئایینەکان بگرن، ئەمەش بەو پێیەی کە ناوەندی زانکۆ وەک مەڵبەندێکی مەعریفی؛ سەرجەمیان بەو فرەیی و جیاوازییە کۆ دەکاتەوە لە کەشێکدا کە کەشی «فێربوون»ە، فێربوونیش مافی سەرەتایی هەموو مرۆڤێکە بەبێ جیاوازی، بۆیە کەڵچەری ئەو کەش و فێربوونەش دەبێت هەمئاهەنگ بێت لەگەڵ یەکدی قبووڵکردن و ڕێزگرتن لە هەبووەکانی ئەوانی تر، بەبێ خۆسەپاندن و توندوتیژی (بۆ زانینی ئەم جۆرە جیاوازانەی فرەیی کولتووری و لە پەیوەندیدا بە پەروەردەوە، بڕوانە توێژینەوەی تۆجۆ و کیس).

کەسایەتیی مرۆڤی شارستانی لە زانکۆدا دادەڕێژرێت. ئەمەش بەو پێودانگە کە ناوەندی زانکۆ بە شێوەیەکی ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی، کاریگەریی هەیە لەسەر ئەزموونە دەروونییەکانی تاک، لەوەدا کە بەرکەوتە و ئەزموونکردن و ئاشنابوونی جیاوازی لە قۆناغ و تەمەنی جیاوازدا لەگەڵ مرۆڤی جیاواز دروست دەکات. بۆیە ئەو تاکەی کە پێ دەنێتە قۆناغی زانکۆ، بە هەمان بیرکردنەوە و ئەزموونکردن و دنیابینی پێی لە زانکۆ ناهێنێتە دەرەوە، بەڵکوو کۆمەڵێک پاشخانی کولتووری و فیکریی جیاوازی لە هەگبەی خۆیدا دەباتە دەرەوە. توێژەران «پۆل چاتێرتۆن» و «ئاروون کەی»، پێیان وایە کە چالاکییە مەعریفی و ڕۆشنبیری و کولتوورییەکانی نێو ناوەندی زانکۆ، کەسێتییەکی کولتووریی تایبەت بە مرۆڤ دادەڕێژن، بۆ وێنە: شانۆگە و کتێبخانە و هۆڵەکانی وانەکان و هۆڵی کۆنسێرت و فێستڤاڵەکان و سینەما و پێشانگە هونەرییەکان و چالاکییە دیبەیتییەکان و پانێڵەکان، هەریەک لە شوێنی خۆی ئەزموونێکی جیاوازی کولتووری بە «مرۆڤ»ی فێرخواز دەبەخشن، وە لە کۆتاییشدا کاریگەری لەسەر هەست و خولیا و بیرکردنەوەکانیدا دادەنێن. بۆیە زۆر گرنگە زانکۆکانی کوردستان بە بەرنامە و داڕشتنەوە، وە بەبێ ڕەمەکییەت و ڕەفاهیەتسەنتەری، ئەم جۆرە کەش و ژینگە پڕ لە چالاکییەی زانکۆ بقۆزنەوە بۆ برەودان بە کولتووری شارستانی لە کۆمەڵگەدا، چونکێ بێگومان دواجار هەر ئەم فێرخوازانەن دەچنەوە نێو کۆمەڵگە و لە کایە و سێکتەرە جیاوازەکاندا ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن. پێگەیاندنی مرۆڤی شارستانی بۆ کۆمەڵگە، لەم ناوەندانەوە دێنە دی. توێژەران «جیۆفری بۆڵتۆن» و «کۆڵین لۆکاس»، لە توێژینەوەیەکدا دەڵێن: «زانکۆ تەنها

شوێنێک نییە بۆ توێژینەوە، بەڵکوو شوێنێکە بۆ خڕبوونەوەی ئەقڵەکان و سودمەندبوون لە یەکدی».

لە درێژەی ئەم باسەدا، جێی بایەخە ئاماژە بە ڕۆڵی زانکۆ لە تێپەڕاندنی قەیران و کێشەکانی دەوڵەت بکەین، کە ئەمەش هەمدیسان پەیوەندیدارە بە ئەقڵیەتی شارستانی، لەوەدا کە چۆن تاکەکان پەروەردە بکرێن بەهۆشیارییەوە مامەڵەی دروست لە دروستبوونی قەیرانە ڕامیاری و ئابووری و تەندروستییەکان بکەن. ئێستا لە دەمی نووسینی ئەم وتارەدا، کوردستان و جیهان لە دەمی گوزەرکردنی قۆناغی ڤایرۆسی کوشندەی «کۆڤید ١٩»یە، بۆیە هەبوونی هۆشیاریی تەندروستی و هۆشیاریی کولتووری لە تێپەڕاندنی ئەم قەیرانە تەندروستییە؛ باسوخواسی ڕۆشنبیرانی کوردستانە، کە ئاخۆ چۆن پاشخانی ئەم هۆشیارییە پەیوەندیدارە بە ناوەندەکانی فێرکردنەوە؟ وە ئایا ڕۆڵی زانکۆ وەک ناوەندێکی فێرکردن لە ئاستی هۆشیاریی تاکی کوردستانی، چۆنە؟

بیرمەند «ڤیلهێلم هەمبۆڵدت»ی ئەڵمان کە یەکێکە لەو کەسانەی لە دامەزراندنی زانکۆی «فرای بێرلین» ڕۆڵی هەبووە، نامەیەک دەنووسێت و کۆمەڵێک پێشنیار بۆ سەرانی ئەم زانکۆیە دەکات، دەڵێت: «دەبێت زانکۆ پێویستییەکانی کاتی هەنووکەمان بۆ دابین بکات و کێشەکانمان بە چارە بگەیەنێت.» دکتۆر عەبدوڕەحمان وەهاب کە مامۆستای زانکۆیە و نیشتەجێی «کەنەدا»یە، لە وتارێکدا لەهەمبەر دۆخی ئێستای درم و پەتای «کۆڤید ١٩» دەنووسێت: «دەستگاکانی پەروەردە لە کوردستان، گلەیی ئەوەیان لێ ناکرێت کە چارەسەری دەردێکی وەک کۆرۆنایان نەدۆزیوەتەوە، بەڵام گلەیی ئەوەیان لێ دەکرێت کە کۆمەڵگەیان بە ئاقارێکدا نەبردووە کە بەرانبەر مەترسییەکانی ڤایرۆسی کۆرۆنا لەوەی هەیە؛ هۆشیارتر بن. ئەرکی زانکۆکان هێندە لە بەدیهێنانی ئاشتیی کۆمەڵایەتی و پتەوبوونی بنەما ئەخلاقی و فەرهەنگییەکان گرانە، هێندە لە دۆزینەوەی زانستیدا ئەرکیان گران نییە. کێشەی کۆمەڵگەی کوردستان؛ کێشەی کەمیی زانست نییە، بەڵکە کێشەی نزمیی ئاکارە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسییەکانە.» ئایا زانکۆیەکانی کوردستان بۆ ئەم هۆشیارییە خودییەی فێرخوازان لە چ ئاستێکدان و چی دەکەن و دەبێت چییش بکەن؟ ئەوە پرسیاری ئەم نووسینەی ئێرەمان نییە.

هەم هەمبۆڵدت و هەم جیۆفری و کۆلین و هەمیش وەهاب، لە تێز و بۆچوونەکانیاندا ئەوەمان بۆ ئیسپات دەکەن کە زانکۆ وەک ناوەندێکی مەعریفی، ئەرکی تەنها لە بەخشینی بڕوانامە و وتنەوەی وانە تەقلیدییەکاندا بۆ «گواستنەوەی زانست» کورت هەڵنایەت، بەڵکوو زانکۆ ڕۆڵی هەرە بەبایەخی هەیە لە فێرکردنی پرەنسیپە ژیارییەکان، مۆراڵەکان، بەها کولتوورییەکان و ڕێنماییە مرۆڤپەروەرییەکان.

پێگەیەکی دیکەی پڕ لە ئەرزشی زانکۆ ئەوەیە کە ڕۆڵی هەیە لە دروستکردن و بەرهەمهێنانی سەرکردەی هزری و زانستی و تەنانەت زۆر جار ڕامیارییش، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە زانکۆ وەک ناوەندێکی بەرهەمهێنانی فیکر و زانست؛ ڕۆڵی هەیە لەوەی کە مرۆڤ تێیدا کۆمەڵێک توانست و کارامەیی هاوسەردەمیی فێر دەبێت (ئێستا قسە لەسەر کارامەییەکانی سەدەی ٢١ دەکرێت، کە دەبێت زانکۆ ئەو جۆرە کارامەییە تەکنیکی و هونەری و زمانی و ڕەفتارییانە بە فێرخواز ببەخشێت). بێگومان ناوەندی زانکۆ ڕێخۆشکەری دەکات بۆ بیناکردنی کەسایەتییەکی سەرکردەیی، بەو واتایەی کە ئەو تاکە سیفەت سەرکردەییە پەیامی پێشڕەویکردنی کۆمەڵگە لەباوەش بگرێت و ببێتە هۆی دروستکردنی کاریگەری و گۆڕانکاری. هەروەک فەیلەسووفی فەڕەنسیی گەورە «گۆستاڤ لۆبۆن» لە قسەیەکدا دەڵێت: «سروشتی دەروونی مرۆڤ وایە کە کەمینە دەبنە ڕێبەری هزری لە کۆمەڵگە و گۆڕانکاریی ئەرێنی دروست دەکەن، زۆرینەش شوێنی ئەو گۆڕانە دەکەون.»

## لە کۆتاییدا و ئەنجام:

ڕێڕەوی مێژووی مرۆڤایەتی؛ وێستگەی شارستانیی هەمەچەشنی لەخۆ گرتووە، لە نەتەوە و دەوڵەت و ئیمپراتۆرە جیاوازەکانەوە. گەشەی ئابووری و کولتووری و ڕامیاریی ئەم شارستانیەتانەش، دەرئەنجامی گەشەی ڕاشناڵێکی شارستانی بووە کە لە توانستە مرۆییەکاندا خۆی دەنوێنێت. زانکۆ و دانشگاکان، بەم پێودانگە، ڕۆڵی هەرە بەرچاویان گێڕاوە و دەگێڕن لە داڕشتنی ژێرخانی هزری و زانستی و تەکنەلۆژیی ئەم پێشکەوتنە شارستانییانە. بۆیە دەبێت لە مەملەکەتی ئێمەدا، جارێکی دیکە بە هەند لە زانکۆ بڕوانرێتەوە و ئەو پێگە نیشتمانسازییەی پێ بسپێردرێت لە داڕشتنی کەسایەتیی شارستانیی تاکی کورددا، کە زانستپەروەری بناغەکەی بێت.

## سەرچاوەکان:


1. Karliga, Bekir. Concept of Civilization. Istanbul: Dar Al-Medar, 2015.
2. Sharratt, Michael. Galileo: Decisive Innovator. Cambridge University Press, 1996. PDF.
3. Bagginni, Julian and Jeremy Stangoom. Great Thinkers A-Z. Uk: Norfolk 2004. PDF.
4. The Royal Society. Philosophical Transactions: 35 Years of Publishing. UK: Wales license, 2015. PDF.
5. Guarnieria, Massimo and Pietro del Negro. “The Italian Renaissance: Transition from Medieval to Early Modern Europe of the University System and Higher Learning”. Jubilee of Wu Chien-Shiung, 2012. Vol. 100, 20120, June 2, pp. xx-xx.
6. Chatterton, Paul. “The cultural role of universities in the community: revisiting the university community debate”. Environment and Planning. Vol. 32, 2000, p.p. 165-181.
7. Arun, K. Culture and Civilization: Study material. Course book. India: University of Culicut-School of Distance Education, 2011. PDF.
8. Tojo, Naoko and Bernadett Kiss. Diversity in Education: Crossing cultural, disciplinary and professional divides. Sweden: Lund University Press, 2017.
9. Boulton, Geoffrey and Colin Lucas. “What are universities for?”. Chinese Science Bulletin, August 2016. LERU Publicartions.PDF

١٠.لوبون، جوستاف. الاراو والمعتقدات. ص ٤٥، أشارت اليه فى (أبن رشد: الفلسفة الاسلامية) هاوزین ملا أمين، دار سوهروەردی.

١١. رفيده اسماعيل عطا المنان. بيت الحكمة البغدادى وأثره فى الحركة العلمية فى الدولة العباسية (١٣٢-٦٥٦ه/٧٥٤-١٣٥٨م). رسالة ماجستير. جامعة خرطوم، السودان، ٢٠٠٩.

١٢. عەبدوڕەحمان وەهاب، ماڵپەڕی کوردستان تایمز. https://kurdistantimes.org/

١٣. ماڵپەڕی «الجزيرة». قصة المدارس الاسلامية. https://midan.aljazeera.net/intellect/history/

# مێژووی زانکۆ

## ناسینەوەی چەمك و شوناس






بێستوون عەبدولکەریم سدیق

زانکۆی گەرمیان - کۆلێجی پەروەردە - بەشی مێژوو




## پێشەکی:

یەکێک لە چەمکە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ناو زانستە مرۆڤایەتییەکان لە دوو سەدەی ڕابردوودا؛ چەمکی زانکۆ بووە, کە بەبێ زانکۆ ئیمکانی ئەم جۆرە پێشکەوتنانە نەبوو، بەتایبەت لە وڵاتانی پێشکەوتوو. لەو دیدەوە دونیای ئەمڕۆ، دونیای چەمک و زاراوەکانە. لە ئێستادا کەم چەمک و زاراوەی زانستە مرۆڤایەتییەکان هەیە پێویستی بە خوێندنەوە, ناسینەوە و پێناسەکردنەوە نەبێت, بۆیە ئەمە بنەما و پێویستییەکی تیۆری و هەمیشەییە و هەنگاوێکی زانستیی بەسوودە بۆ دووبارە تێگەیشتنەوە لە مانا, ڕۆڵ و چییەتیی چەمکەکان. بەبێ شرۆڤە و دیاریکردنی سنووری چەمک و زاراوەکان، ئەستەمە دیاردە و پرسەکان مانایەکی هەبێت و سەرنجمان ڕابکێشێت. سەرباری ئەوە، سەردەمی ئەمڕۆ؛ سەردەمی قەیراناویبوونی نەریتە سوننەتییەکانی زانکۆیە. لەو ڕوانگەیەوە هەتەرترین و ئاڵۆزترین پرسی هەر جۆرە مەعریفەیەک، پرسیارە لە چییەتیی ئەو مەعریفەیە.

لەم ساڵانەی دواییدا، زانکۆ بابەتێکی گرنگی ڕوانگە کۆمەڵناسییەکان بووە. کرۆکی ئەم باسانە، جەخت لەسەر گۆڕانکاری لە بونیادە زاڵەکان بەسەر زانست و زانکۆدا دەکەنەوە. زانکۆ لەو مۆدێلە کەوتووە تەنها شوێنی بەرهەمهێنانی زانست بێت، بەڵکوو چالاکی و ئەرکی تری لە ئەستۆدایە. زانکۆ یەکێکە لە دامەزراوە دیار و گرنگەکانی دونیای مۆدێرن و پرۆژەی مۆدێرنیتە، گرنگترین چالاکییەکانی و بەرپرسیارێتییە بناغەییەکانی بریتییە لە بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوە و بەکارهێنانی زانست. زانکۆ بەپێی زەمەنێکی درێژخایەنی مێژوویی، لە تەواوی وڵاتان و بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئەورووپا گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە. لە ساڵی ١٩٦٠ بەدواوە، لە زۆرێک لە وڵاتانی جیهان زانکۆ بوو بە ڕەگەزێکی بەهادار و کاریگەر لە کۆمەڵگادا. زانکۆ لە دۆخی ئێستادا، پێش هەر دەزگایەکی تر گۆڕدراوە بۆ سەکۆی وەڵامدانەوەی خواستە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا. پەیوەندیی زانکۆ و کۆمەڵگا، یەکێکە لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی زانکۆ لە سەردەمی نوێدا. ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا ڕوویان دا، ئەم چەمکەی ڕووبەڕووی وەرچەرخانێکی ڕیشەیی کردەوە و دەستکاریی ئەرک و پەیامەکانی کرد. جارێکی تر پێناسەی دەزگا و دامەزراوەکانی نێو ژیانی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردا هات و ڕێساکانی، بەهاکانی و بونیادەکانی؛ ڕووخسارێکی ئەکادیمییان وەرگرت. لە دوو سەدەی ڕابردوودا لەپاڵ گەشەی شارنشینی, عەقڵانیەت و مەدەنیەت کە هەموو لێکەوتەی دونیای مۆدێرن بوون, سروشتی دامەزراوەکانیشی گۆڕیی و کردی بە دەزگای گشتی و خەڵکی و ئەرکی زانکۆ سنووری زانیاری، پەیوەندی و فێرکاریی تێپەڕاند. لەگەڵ ئەوەشدا چەمکی زانکۆ یەکێکە لەو چەمکانەی کە فەیلەسووف و بیریاری تایبەت بە خۆی نییە, فەیلەسووفانی وەک دریدا, هایدگەر, کانت, گادامێر و مارکس، هەریەکە لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە لێیان ڕوانیوە. لە خۆرئاوا بەتایبەت لە ئەڵمانیا، زانکۆ هەمیشە بابەتێکی فەلسەفی بووە و پەیوەندییەکی حەقیقی و قووڵی بە نەتەوەکەی و سەردەمەکەیەوە هەبووە. لەو ڕووەوە زانکۆ لە کۆنەوە یەکێک لە بابەتی فەیلەسووفەکان بووە، بۆ نموونە فەیلەسووفێکی ناوداری وەک هایدگەر بۆ ماوەی ساڵێک سەرۆکایەتیی زانکۆی فرایبۆرگی لە ئەڵمانیا لە سەردەمی نازییەکاندا کردووە. زانکۆ چەمکێکی دابڕاو نییە لە واقیع, تا ئەو مانای بۆ پەیدا بکات و پێی ببەخشێت, چەمکەکان وەکوو کەرەستەیەکی فکرین، واقعی پێ تیۆریزە و شیتەڵ دەکرێت, واتە ئەو شتەی دوێنێ قسەکەر بوو، ئەمڕۆ دەبێتە قسەلەسەرکراو. بۆ ئەوەی لە کاتی شیکاری و ڕاڤەکردندا لە دیدی تەقلیدی و باو و لە هەمان کاتدا ناڕوون دوور بکەوینەوە, پێویستە لە



زانکۆ زەمینەیەکی نوێی بۆ ناسین، داڕشتنەوە و دابەشکاریی نوێی زاستەکانی فەراهەم کرد و لێرەوە ژیانی پسپۆڕی و دونیای زانستی بە مانا نوێیەکەی دەستی پێ کرد.

گۆشەیەکی نوێ و تیۆریانەوە لەم بابەتە بڕوانین و ئەو نموونە باڵایەی زانکۆ کە دونیای مۆدێرن وێنای دەکات، بیناسین. لەم باسەدا خودی چەمکی زانکۆ دەبێتە بابەتی تێڕامان و بیرکردنەوە.

شایەنی باسە تاوەکوو ئێستا کە مرۆڤایەتی لە سەردەمی زانیاری، شۆڕشی ئەلیکترۆنی، کۆمەڵگەی شەبەکی، کۆمەڵگەی زانستی، پۆستنەتەوە و جیهانگیریدا دەژین؛ نموونەیەکی ئایدیاڵ، نموونەیی، گەردوونی و جیهانیمان لەسەر زانکۆ نییە، واتە وێنەیەکی گشتی و دیاریکراومان لەسەر زانکۆ نییە، کە هەموو وڵاتان و کۆمەڵگاکان چاوی لێ بکەن، پەیڕەوی بکەن، چونکە زانکۆ دیاردەیەکی زانستی، کولتووری و کۆمەڵایەتییە و مێژووی دەرکەوتنی لە کۆمەڵگاکاندا جیاوازە و بەرهەمی ئەو هەموو هەلومەرجە سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئابوورییەیە کە کۆمەڵگە تێیدا دەژی، ئەمە وای کردووە سروشتی زانکۆ لە کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی تر بگۆڕدرێت. سروشتی کۆمەڵگە، شوناسی کۆمەڵگە، مێژووی کۆمەڵگە، پرۆسە دونیاییەکان و هەلومەرجە دەروونی و دەرەکییەکانی کۆمەڵگە دەستنیشانی دەکات زانکۆ چی بێت، چیی پێ دەکرێت و چۆن سەر هەڵدەدات. لەگەڵ ئەوەشدا سەرهەڵدانی زانکۆ، بەرهەمی پێویستی داخوازی و هەلومەرجی مێژوویی ئەو کۆمەڵگەیەیە. خاڵێکی تر، بۆ شرۆڤەکردنی مێژووی دەرکەوتن و پەرەسەندنی زانکۆ، هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە گەر چاوێک بە مێژووی زانکۆ لە ئەورووپا نەخشێنینەوە، واتە ئەزموونی مێژوویی زانکۆ لە ئەورووپا؛ تاکە وێنەی بەرچاو، ئەزموونکراو و واقعییە بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین. ئەمە نیشانەی ئەوەیە زانکۆ لە هیچ وڵات و کیشوەرێکی تر بۆ ئێمە نابێتە سەرمەشق و نموونە تاوەکوو چاوی لێ بکەین، لەبەر ئەوە زانکۆ دیاردەیەکی خۆرئاوایی و ئەورووپییە و لەناو ژینگە و بەستێنی مێژوویی ئەورووپا پێک هاتووە، قۆناغەکانی خۆی بڕیوە و بەو واتایەی ئێستای گەیشتووە. بەم پێیە، دەتوانین مێژووی زانکۆ لەگەڵ پرۆسەی مێژوویی مەعریفە لە خۆرئاوا هاوتا ببینین.

### زاراوەناسیی زانکۆ

زانکۆ یان زانستگا، لە وشەی «University» ئینگلیزی و «Universite»ی فەڕەنسییەوە وەرگیراوە، کە خودی ئەمانە لە ڕیشە لاتینییەکەی وشەی «universitas»وە سەرچاوەی گرتووە، کە بە واتای یەکێتی، یەکتایی و پانتایی گشتی دێت، هەروەها ئەم دوو وشەیە «universalitas» بە واتای گشتی (گشتێتی) و «universalis» بە واتای جیهانی و جیهانگیرییش لە هەمان ڕیشەوە پێک هاتووە. کاتێک سەرنج لە پەیوەندیی نێوان ئەم سێ چەمکە دەدەین (university, universalit, universitas)، تێدەگەین کە ئامانجەکە بریتییە لە دروستکردنی دامەزراوەیەک لەژێر ناوی زانکۆ لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، واتە کۆمەڵگەیەک لە توێژەران کە لە گەڕاندان بەدوای زانستی گشتیی جیهانی. لەو شوێنەوەی کە «university



بەستنەوەی زانکۆ بە شێوازی بەرهەمهێنان, پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان, سیاسیەتی ئابووری و بازاڕی کارەوە؛ دەرکەوتەیەکی گرنگی دونیای نوێیە کە زانکۆ بەشداریی بەهێزی تێدا کردووە.

لە پەیوەندییەکی ڕاستەخۆدایە لەگەڵ وشەی «universitas»، کەواتە پرسی سەرەکی گەیشتنە بە یەکێتییەکی هەمەڕەنگ، بەم جۆرە مامۆستایان و خوێندکارانی یەکەمین زانکۆکانی ئەورووپا, لەوانە بۆلۆنیا کە چەند ساڵ پێش سۆربۆن لە ساڵی (١١٩٠ز) دامەزراوە، هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی فێربوونی زانستە جۆراوجۆرەکانەوە بە جیهانبینییەکی نوێ بگەن، واتە دۆزینەوە و گەڕان بەدوای ئەو بەها نوێ, گشتی و جیهانییانەی کە لە قۆناغی یەکەمی پێش پەیدابوونی زانکۆکان لە ئەورووپا بوونیان هەبوو. لەگەڵ چەکەرەکردنی فیکری مۆدێرن، ئەم بەها گشتییانە ناوەرۆکێکی سیکۆلار و زانستییان وەرگرت و ناوەرۆکە دینییەکەی کاڵ بوویەوە. زانکۆ گرنگترین دەزگای زانستییە کە لە ڕیشەی دامەزراندنیەوە تا ئێستا لە دیاریکردنی چارەنووسی خەڵک ڕۆڵی بینیوە, ئەگەرچی زانکۆ لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوو لەژێر کاریگەریی ئەو دۆخە باڵادەستەدا بووە کە لە کۆمەڵگادا ئامادەگیی هەبووە, بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، وەک دامەزراوەیەک بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا و چاکسازیی داهاتوو، جێگەی سەرنجی سیساتمەداران، بیرمەندان و ڕووناکبیران بووە.

ئەرکی سەرەکیی زانکۆ بریتییە لە پەرەپێدانی کۆمەڵێک هێزی مرۆیی کارامە، تا بتوانێت بە کەڵکوەرگرتن لە پسپۆرییە جیاوازەکان درێژە بە ژیانی مرۆڤەکان بدات. بە واتایەکی تر: زانکۆ هەمیشە لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا ڕەگەزی سەرەکیی جووڵەی دەرکەوتنی ئاگایی بووە لە فەزای گشتیدا و هەمیشە چەقی کۆمەڵگەی مەدەنی بووە و لەبەرانبەر دامەزراوەی مۆدێرنی دەوڵەت، وەک یەکێک لە دامەزراوە بنچینەییەکانی فەزای گشتی کاری کردووە. نەک تەنها فەزایەک بووە بۆ بەرخورد لەگەڵ بیروباوەڕ و ئەندێشەکان، بەڵکوو یارمەتییەکی زۆری پێشکەوتنی ئاوەزمەندی (عەقڵانیەت) و گەشەی بیری ڕەخنەیی داوە، بۆیە زانکۆ وەک دامەزراوەیەک شوێنێک بووە بۆ ژیانێکی مانادار و حەقیقی. ئەم دامەزراوەیە وەک ڕەگەزێکی سەرەکیی سیستمی کۆمەڵایەتیی دونیای مۆدێرن، تایبەتمەندیی ئاگایی و لێهاتووییەکان و پەرەوەردەکردنی بیر و هێزی مرۆیی دیاری دەکات, بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازادانە بتوانێت وانەی تێدا بڵێتەوە و توێژینەوە بنووسێت کە ئەمەش پێویستی بە بوونی کەشێکی کولتووریی داهێنەرانە و زیندوو هەیە. واتە لەگەڵ ڕەوتی حەقیقەتدۆزی, حەقیقەتخوازی و لە گەڕان بەدوای ئازادیدا بووە. کارکردی فەرمی و ئاشکرای زانکۆ لە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئەمڕۆیی ئەوەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگا لە بەدەستهێنانی زانست، بەهرەکان، بیرکردنەوەی زانستی و فەلسەفی؛ بەشدار بن و ڕۆڵ ببینین. زانکۆ کاتێک دەتوانێت وەک دەزگایەکی بزێو و کارا بەدیار بکەوێت و هەموو توانا و لێهاتووییەکانی بخاتە گەڕ، کە خاوەنی ئازادی و سەربەخۆیی خۆی بێت.

### پێشینەی مێژوویی زانکۆ

ڕەگوڕیشەی زانکۆ لە ئەورووپا، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست

و سەردەمی ڕێنیسانس، لەو قۆناغە بەدواوە ناوەند، بنکەکانی خوێندنی باڵا و فێرگە ئەکادیمییەکان سەر هەڵدەدەن، بەڵام چونکە ئەو قۆناغە، قۆناغی باڵادەستی ئایینییە و کڵێسا مەرجەعی سیاسی, ئایینی, زانستی و کولتوورییە، هەروەها ئایین ڕەمزی مەعنەوی، ئەخلاقی و مرۆییە و بیروباوەڕە مەزهەبی و پەیڕەو و پرۆگرامە فیقهییەکان سەرچاوەی ژیانی مرۆڤی ئەورووپین و زانست و زانکۆ زۆر ڕۆڵیان لە داڕشتنی بەها، یاسا و فۆرمەکانی ژیانی تاکی ئەورووپیدا نییە، چونکە ئایین سەرچاوەی بیر و هزری مرۆڤە، ئەوە دینە دیاریی دەکات چی ڕاستە و چی ڕاست نییە، چی حەق و چی باتڵە، مرۆڤ چییە و چیی پێ دەکرێت و بۆ کوێ هەنگاو دەنێت. سەردەمی ئایین، سەردەمی باڵادەستیی شەریعەتە بەسەر کۆی ژیاندا. بە شێوەیەکی سەرەکی ئەم زانکۆیانە لەژێر کاریگەریی مەزهەب و دۆگمایی ئایینیدا بوون، کاری سەرەکیی زانکۆ لە کایەی فێرکردندا لەسەر بنەمای وانەی پشتبەستوو بە سەرچاوە بووە.

زانکۆی پاریس؛ کۆنترین زانکۆی ئەورووپایە کە لە ساڵی (١٢٠٠ز) سەری هەڵداوە و بە مەودایەکی کەم زانکۆکانی ئۆکسفۆرد، ناپل، کامبریج دێت. لە واتا پسپۆڕییەکەیدا، لەم زانکۆیانەدا زانستەکانی وەکوو هونەر، یاسا، دەستووری ئایینی، پزیشکی و خوداناسی دەوترانەوە و هەمووی لەژێر کولتووری گشتی و باڵادەستیی مەسیحیەتدا بوو. لەو ساتەوە تا سەدەی پازدەیەم گۆڕانکارییەگ لەم دۆخەدا ڕووی نەدا, دوای ئەوە بە پەرەپێدانی ڕەخنەی بوێرانە کەم کەم زانکۆکان کۆمەڵێک بیرۆکەیان خستە ڕوو کە بەزۆری لەگەڵ ئەو بەها کلاسیکییانەی کڵێسا و سەرچاوە کولتوورییە زاڵە کۆمەڵایەتییانە، لە هەمووی گرنگتر لەگەڵ بنەما زانستییەکاندا دژبەیەک بوون. ئەم مۆدێلە لە زانکۆ، تا سەدەی شازدەیەم درێژەی کێشا. لێکۆڵینەوەی زانست و خوێندنی باڵا لە ناونیشانە گشتییەکەی وڵاتانی ئەورووپا، ئەگەرچی لە ڕووی کولتوورییەوە هەموویان میراتگری کولتووری سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی «نوێبوونەوەی ئەدەبی هونەری»ن. لە سەدەکانی ناوەڕاست خوێندنی باڵا لە ئەورووپای خۆرئاوا پەیڕەوبەند کرا و تەواوی ئەو زانستانەی کە لە دامەزراوە پسپۆڕییەکان لەئارادا بوون، بە ناوی زانکۆوە ناو نران. لە سەدەکانی ناوەڕاست پێوەری سەرەکی بۆ زانکۆ، گرنگیدان بوو بە هۆکاری کۆتایی، زنجیرە پایەکانی بوون و پرسی میتافیزیکی و خواناسی بوو، زانکۆکان لە تەواوی سەدەکانی ناوەڕاست دوو ڕەهەندی هەبوو، هەم بنکەی خوێندنی باڵا بوون و هەم گردبوونەیەکی پیشەیی بوو کە مامۆستایان، پەروەردەکاران و خوێندکارانی لەخۆ دەگرت.

لە قۆناغێکی تر کە بە سەردەمی ڕێنیسانس ناسراوە، زانکۆ بە تێپەڕبوونی زەمەن و لە هەناوی واقعێکی مێژووییەوە سەری دەرهێنا, لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشە زانستی و فکرییەکان, زانکۆکان قۆناغێکی نوێ تاقی دەکەنەوە. بە شکستی کڵێسا، گۆڕەپانەکە بۆ زانست چۆڵ کرا. زانست بوو بە تاجی سەری هەموو مەعریفەکان. سەردەمی ڕێنیسانس سەردەمی چاکسازی، هۆشیاری، بێداری، گەشەکردن، عەقڵ، زانست، بەها مرۆییەکان، شارنشینی، سیکۆلاریزم و دەوڵەت-نەتەوەیە. زانکۆکان فۆرم و ناوەڕۆکێکی جیاوازتر و پێشکەوتووتر وەردەگرێت و لەگەڵ ئاوەزمەندی و ئازادیدا پەیوەندی پەیدا دەکات و زانکۆکان ئەرک و بەرپرسیارێتیی نوێیان پێ دەسپێردرێت، زانکۆکان لەم قۆناغەدا لە ڕووی فۆرمی ئیشکردن، سنووری دەسەڵات، ژمارەی مامۆستا و خوێندکار، کردنەوەی بەش و کۆلێجی جیاواز؛ ڕووبەڕووی واقعێکی تازەتر دەبنەوە. زانکۆکان بەتەنیشت فێرکردنەوە، بایەخ بە نووسینی توێژینەوەی زانستی دەدەن و فێرکردن و توێژینەوە بەیەکەوە

دەبەستنەوە و دەبنە ڕەگەزی تەواوکاری زانکۆ. لێرەوە پێگە و کارکردی زانکۆ گۆڕانی بەسەردا هات، ئەم گۆڕانە هەردوو لایەنی ڕێکخراوەیی و بونیادی گرتەوە.

لەم قۆناغەدا گەشەکردنی زانکۆ بە شێوەیەکی ئاڵۆز گرێدراوی ئەو ڕۆڵەی خۆی بوو کە لە پێکهێنانی دەوڵەت-نەتەوەدا هەیبوو، کەشی ڕێنیسانس لە سەدەی یازدەیەم بووە هۆی فراوانبوونی ئەنجوومەن و ڕێکخستنە دەوڵەتی و ناوچەییەکان، لە دەوڵەتی نەتەوەییدا هەموو دامەزراوە و دەزگاکان سروشتی نەتەوەیی و خەڵکییان هەیە و هێمای خواست و ئیرادەی خەڵک-نەتەوەن و کارکردی سەرەکییان ئەوەیە ئامانج و خەونەکانی خەڵک بەدی بهێنن. ئاشکرایە دامەزراوە کولتوورییەکان لە نموونەی زانکۆ و ناوەندەکانی توێژینەوە و فێرکاری، گرنگترین ڕەگەزی دەوڵەت و کۆمەڵگان.

هەروەها لەگەڵ چاکسازیی پرۆتستانتی، کۆلێجەکان ڕەنگ و بۆیەکی تازەیان وەرگرت، زانکۆ بوو بە چەقی گۆڕانکارییەکان بۆ باڵادەستکردنی زانست، نەک تەنها لەجیاتیی میتافیزیک و ئەودیوسروشت، بەڵکوو لەجیاتیی خوا. لە قۆناغی سەردەمی نوێدا، گۆڕانی ڕیشەیی و جەوهەری بەسەر شوناسی زانکۆکاندا دێت، لەدایکبوونی مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزم کە ڕۆح و دڵی قۆناغی نوێیە، دیاردەیەک بە ناوی زانست و زانستیبوونەوە لەدایک دەبێت کە ئەمە بۆ خۆی دەبێتە هەوێنی لەدایکبوونی زانکۆکان بە واتایەکی نوێ، واتە پەیوەندییەکی گرنگ لەنێوان زانست و زانکۆدا هەیە. کاتێک زانست بەرهەمی پرۆژەی مۆدێرنیتەیە و لەناو مەنزومەی فیکری و مەعریفیی دونیای مۆدێرندا سەر هەڵدەدات، زانکۆیش لە هەناوی ئەم پرۆژەیەوە چەکەرە دەکات و دەبێتە یەکێک لە دامەزراوە هەرە گرنگ و بنچینەییەکانی دونیای مۆدێرن، بەم پێیە ناتوانین پێش مۆدێرنیتە

قسە لەسەر زانکۆ بە واتا نوێیەکەی بکەین. دیاردەی زانست و زانکۆ لە بنەڕەتدا دیاردەی مۆدێرنن، لەپێش نەریتی فیکری خۆرئاوا، نموونەی فێرگە، قوتابخانە، دەزگای زانستی، ناوەندی خوێندنی باڵا و زانستی هەمەجۆر بوونیان هەبوو، بۆ نموونە: ئەکادیمیای ئەفلاتۆن، لوکئوم و ئەرستۆ و فێرگە زانستی و ئایینییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست. هەروەها لە کولتووری شارستانی ئیسلامییشدا نموونەی نیزامییەکان، ربع الرشیدیە، دار الحکمة و دار الفنون لە شارەکانی سەمەرقەند، نیشاپوور و ئەسفەهاندا هەبوون، کە لە دەرکەوتە ڕوونەکانی خوێندنی باڵا و پشکنینی زانست بوون، کەمێک پێشتریش جامع الازهر نموونەی پێشکەوتووی سەردەمی خۆی بوو. هەم پەخشکەری زانست بوون و هەم بەدیهێنەری تەکامولی مەعریفە و کولتوور، وەک چۆن لەنێو دونیای ڕووناکبیری کۆمەڵی کوردەوارییشدا حوجرە و تەکیە هەبوون، ئەمانە خزمەتی بەرچاویان بە شارستانیەتی جیهانی و ڕەوتی زانست کردووە. بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشینە هێجگار دەوڵەمەند و پڕدەسکەوتە، وێنەیەکی نادروست و نادادپەروەرانە بۆ مێژووی زانست دروست دەبێت. بەڵام ئەم جووڵەیە لەگەڵ هاتنی مەغۆلەکان بۆ شانۆی سیاسیی ئاسیای خۆرئاوا وەستا و کۆمەڵگای ئیسلامی لە تێکۆشانی کولتووری بەجێ ما و دوا کەوت، پاش ئەوە گەشەکردنی زانست و هونەر لە سەرچاوەیەکی ترەوە چرۆی کرد. ئەگەرچی کولتوور لەو دیاردانەیە کە شیاوی جێگۆڕکێیە، کاتێک لە ڕۆژهەڵاتدا ڕووبەرووی یەخانگیری سیاسی و ئایینی دەبێتەوە، بەتایبەت ئەو کاتەی کە دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی کێبڕکێی هەتەریان بۆ ئەندێشە گشتگیرەکان هێنایە ئارا، کولتوور لە شوێنێکی تر بەدیار کەوت. بەڵام خەباتی زانستیی ئەو بنکە و دەزگایانە، هیچ کامیان نەیانتوانی شۆڕشی زانستی دروست بکەن و سەریان لە

زانکۆوە دەرنەچوو، چونکە زانست دیاردەیەکە چەمک و واتای خۆی هەیە، پسپۆڕ، بیروباوەڕ، میتۆد و ئامانجی خۆی هەیە. بۆیە پسپۆڕیبوون، گشتیبوون و سیکۆلاربوونی زانست بەگشتی لەناو دونیای مۆدێرندا ڕوو دەدات، واتە پۆلێنبەندی و جیاکاریی زانستەکان لێرەوە دەست پێ دەکات و پسپۆڕ، زانا و بیریاری تایبەت سەر هەڵدەدەن، ئیشی زانست دەبێتە گەڕان بەدوای حەقیقەت و ڕاستیدا.

زانست لەپێش مۆدێرنیتە، دیاردەی تایبەت و قۆرغکراو بووە، هەموو کەس مافی نەبووە بخوێنێت و هەموو کەس مافی بەدەستهێنانی بڕوانامەی نەبووە، بەڵام لە سەردەمی مۆدێرندا زۆرینەی ئەم بەهایانە دەگۆڕدرێت. زانکۆ ڕۆڵی بەرچاوی لە گەشەپێدانی زانستیدا بینی، بەوەی کە زانستپەروەری و زانستخوازی ببێتە مافی زۆرینەی خەڵک و ببێتە بەشێک لە ژیانی هێز و گرووپە کۆمەڵایەتییەکان. زانکۆ زەمینەیەکی نوێی بۆ ناسین، داڕشتنەوە و دابەشکاریی نوێی زاستەکانی فەراهەم کرد و لێرەوە ژیانی پسپۆڕی و دونیای زانستی بە مانا نوێیەکەی دەستی پێ کرد. کاتێک دەڵێین بە واتا نوێیەکەی، واتە قسە لەسەر زانستێک دەکەین کە پسپۆڕ، پەیڕەو و پرۆگرام، دونیابینی، بابەت، میتۆد و ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە.

گۆڕانی زانکۆکان لە سەردەمی مۆدێرندا، بۆ سێ قۆناغی جیاواز پۆلێن دەکرێت: مۆدێرنیتەی کلاسیک، مۆدێرنیتەی لیبراڵ و مۆدێرنیتەی ڕێکخراو. جیاوازیی ئەم قۆناغانە دەلالەتە لەسەر بوونی بونیادی ئەکادیمی و نموونەی زانستیی باڵادەست بەسەر زانکۆکاندا. مۆدێرنیتەی سەرەتا؛ مۆدێرنیتەی کلاسیکە کە تا شۆڕشی فەرەنسا درێژە دەکێشێت، لەدوای شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩) ئامادەگیی بیرمەندانی ڕەخنەگری وەک ڕۆسۆ، گۆڕانی هەتەر لە ئاراستەی ئەندێشەکان ڕووی دا و زانکۆکانی سیستمی کڵێسایی هەڵوەشانەوە و کۆلێج و زانکۆکان ڕووخساری سەرەتایی زانکۆیان وەرگرت. ئەوەی «دیویدیسون»ی سکۆتلەندی دوای سەد ساڵ باسی کرد، دەرخەری حەقیقیی ئەم گۆڕانەیە: «ئیتر کاتی ئەوەیە هەموو شتێک بخرێتە بۆتەی تاقیکردنەوەوە، هیچ هزرێک، کردارێک و نەریتێکی بەگەڕخراو و فەرمی؛ ڕێزلێگرتنی واجب نییە و دەتوانین تێپەڕێنین». لە مۆدێرنیتەی کلاسیکدا زانکۆ لە بەرهەمهێنانی زانستدا ڕۆڵی بنچینەیی نەبوو، نموونەی زانست، نموونەی شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازی بوو. لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسا، مۆدێرنیتەی لیبراڵ دەست پێ دەکات، لەم ماوەیەدا نموونەی شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازی ڕووبەڕووی تەنگەژە دەبێتەوە. لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا، زانکۆ وەک دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنەری زانست لەگەڵ دەستەبژێری خۆی لە خزمەتی دەوڵەت-نەتەوەدا بوو و داڕشتنی کولتووری نەتەوەیی لەئەستۆ دەگرت. لەگەڵ ئاوابوونی مۆدێرنیتەی لیبراڵ، مۆدێرنیتەی ڕێکخراو لە سەرەتاوە تا دەیەی ١٩٧٠ جێگەی گرتەوە، نموونەی نوێی زانست پارێزگاریی لە جیابوونەوەی زیاتری ڕاستییەکان و بەهاکان دەکردەوە.

لەدوای سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە کە سەردەمی باڵادەستی و هەژموونی عەقڵە، بەیەکجاری زانست دەستی لە دین بڕی و جۆرێک سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت و زانکۆکانیش بوونە سەرچاوە و مەرجی بەرهەمهێنانی زانست. ئەو ئەندێشەیەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە سێبەری داکوتابوو، ئەو هەستە بوو کە زانست و بیرکردنەوەی زانستی داهاتوو جڵەو دەکات. دەستپێکی پەیدابوونی زانکۆکانیش بەو شێوەیەی ئێستای، بەزۆری پەیوەستە بە خستنەڕووی زانست بە واتای «science»، لەو ساتەوە نازناوی زانستییان بەبەر بابەتەکاندا کرد و ناوی زانستییان لێ نرا، لەو

ڕوانگەیەوە زانکۆ وەک دامەزراوەیەکی زانستی؛ ڕۆڵ و بەرپرسیارێتیی تازەتری وەرگرت و وەک بەشێک لە ژیانی سیاسی, ئابووری و کولتووریی کۆمەڵگە چاوی لێ دەکرا. بازاڕی سەرەکیی زانست لێرەوە دەستی پێ کرد و ڕەونەقی پەیدا کرد, ئەم پێشینە مێژووییە پێمان دەڵێت زانکۆ لە ڕەوتی پەرەسەندنی خۆیدا بەشوێن شوناسێکی دیاریکراودا گەڕاوە و لەم فۆرمەی ئێستایدا گەڵاڵە بووە، وا دەردەکەوێت کە زانکۆ بەدوای ئازادی، سەربەستی و سەربەخۆیی خۆیدا گەڕاوە. کەواتە ئیشی زانکۆ بریتی بوو لە بەرهەمهێنان, بڵاوکردنەوە, بەهێزکردن و بەکارهێنانی زانست، کە پێشتر ئەم ڕۆڵەی نەبووە. لە سەدەی هەژدەیەمەوە زانکۆ مۆدێرنەکان بەتەواوی پێک هاتن، دەزگاکانی توێژینەوە زۆر برەویان سەند و بوارە جیاوازە زانستییەکان بووژانەوە. زانکۆی مۆدێرن لەسەر بنەمای پرۆژەی «ویلیام هامبلتۆن»ی ئەڵمانی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا دەرکەوت و کاری زانکۆ بریتی بوو لە فراوانکردنی سنوورەکانی زانست بەبێ سنوور، هەر بۆیە ئازادیی ئەکادیمی دەستی پێ کرد. لە توێژینەوەیەکدا لە زانکۆی بەرلین لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، نموونەیەک بەدەست هات کە سەرتاسەری جیهانی خستە هەوڵدان و کۆششکردن.

گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییانەی دونیا، وڵاتانی پیشەسازی و ئەو وڵاتانەشی لە دۆخی گەشەکردندان؛ ناچار کردووە جارێکی تر سەرلەنوێ بە سیستمی خوێندنی باڵادا بچنەوە و هەمواری بکەنەوە. ئەم گۆڕانکارییانە تا ئەو ڕادەیە قووڵە کە یەکێ لە سیاسەتمەدارانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەڵێت: «جیهان دەرهاویشتەی چوار شۆڕشە: شۆڕشی سیاسی، ئابووری، کولتووری و تەکنەلۆژی.» ئەو دەڵێت: «پێویستە ئەمەریکییەکان کۆمەڵگەی خۆیان بۆ ئەم شۆڕشانە ئامادە بکەن، تا لە ڕێگەی ناسینی ئەمانەوە چوارچێوەیەک بۆ ڕێنموونیی داهاتوو فەراهەم بکات.» هەروەها دەڵێت: «بارودۆخی سیاسیی جیهان گۆڕاوە، ئابوورییە نەتەوەییەکان بوونەتە ئابووریی جیهانی. لە ساتەوەختی گۆڕانکارییە بنچینەییە کولتوورییەکان، پێویستە خەڵک جۆرێک بونیادی ئەخلاقییان هەبێت تا بتوانن بە پاڵپشتیی ئەوان تەحەمولی گۆڕانکارییەکانی داهاتوو بکەن و لە کۆتاییشدا گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییەکان دەتوانن خەونەکانی مرۆڤ بگۆڕن بۆ ڕاستی.»

قۆناغی دوای دەیەی ١٩٦٠، قۆناغی گەشەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی پەیوەندیدار بە مافی مەدەنی, مافی ژنان و کەمینەکان بوو کە قەیرانی نوێیان بۆ زانکۆ ساز کرد. بزووتنەوەکان پێیان وا بوو زانکۆکان پەیوەندییان بە دەوڵەت و ڕژێمەکانەوە هەیە و خاوەنی بونیادی پارێزکارانەن. شۆڕشە خوێندکارییەکانی دەیەی ١٩٦٠ لە ئەورووپا، دەوڵەتەکانی ناچار کرد سەرلەنوێ زانکۆکان پێناسە بکەنەوە، ئامانج و ئەرکی نوێی بۆ دیاری بکەن، ئەمە پاڵنەرێک بوو بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی گرنگی بە گەشەپێدانی فێربوون (ICED) بدات. لە ساڵی ١٩٧٢ بەدواوە، توێژینەوە لە بارەی سیستمی فێرکردنی وڵاتە جیاوازەکان دەستی پێ کرد و توێژینەوە و کتێب لەم زەمینەیەدا چاپ کران و بڵاو بوویەوە. کۆتایی جەنگی سارد, بەجیهانیبوونی ئابووری و کاریگەریی تەکنەلۆژیای باڵا لەسەر ژیانی ڕۆژانە؛ زانکۆکانی بەرەو هەماهەنگیی زیاتر ڕاکێشاوە. پرۆسەی جیهانگیری، کاریگەرترین گۆڕاوە لە پەیوەندیدا لە گۆڕانی نموونەی زانست و شوناسی زانکۆکان. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، زانکۆ کولتووری نێونەتەوەیی، گەردوونی و جیهانگیر بڵاو دەکاتەوە، زانکۆ سنوورە نەتەوەییەکانی تێپەڕاندووە. ئەوەی ئاشکرایە ئەمڕۆ زانکۆکان ناتوانرێت لە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان و پیشەییەکان جیا بکرێتەوە، هەندێک لەو بڕوایەدان سیاسەتی داڕشتنی زانستی

چیتر لە بارەی زانستەوە قسە ناکات، بەڵکوو پەیوەستە بە گەشەی ئابووری، دروستکردنی هەلی کار و گەشەی پیشەسازییەوە. لەو ڕوانگەیەوە، سیستمی گەشەکردن بەبێ ڕەچاوکردنی پێگەی زانکۆ مەیسەر نابێت, بۆیە زانکۆکانی ئەمڕۆ لەسەر بنەمای کارزانی، داهێنەری و نوێگەرییە (entrepreneurial university).

لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، گۆڕانکارییەک لە بونیادی زانکۆیی ڕووی دا کە تەنها گۆڕانی وێنەیی و ڕووالەتی نەبوو، واتە پەیوەندیی بە زیادبوونی ژمارەی خوێندکار، زیادبوونی ئەندامانی ئەنجوومەنی زانستی و گەورەبوونی بازنەی توێژینەوە نییە، بەڵکوو بەدوای گۆڕانکارییە جیهانییەکاندا، واتە هەنگاوناو بەرەو گوندێکی جیهانی لە ڕووی سیاسی، ئابووری و کولتووری، زانکۆیش شێوەی کۆمپانییەکی نێونەتەوەیی و جیهانی لەخۆ دەگرێت، هەروەک کارل یاسپرس دەڵێت: «گەرچی زانکۆ قەرزاری دەوڵەتە، بەڵام ئەرکێکی سەروو-دەوڵەتی لە ئەستۆدایە». بۆیە زانکۆکان لەهەر قۆناغێکی مێژووییدا ڕووبەرووی ئەرک, پلان و ئامانجی نوێ دەبنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر وڵاتێک ڕەوتی ئەم نوێبوونەوەیە جیاوازە و یەکسان نییە. ئەم کارە پەیوەندیی بە بارودۆخی سیاسی, پیشەیی, کولتووری و تەکنەلۆژیی کۆمەڵگەکەوە هەیە.

بە لەبەرچاوگرتنی وتەکانی سەرەوە، بۆمان دەردەکەوێت پرۆسەی پێکهاتنی زانکۆ سێ قۆناغی جیاوازی بڕیوە: قۆناغی دەستەبژێر و تایبەت, قۆناغی خەڵکی و جەماوەری و قۆناغی گشتی و جیهانی. لەم ڕووەوە, لە دونیای هاوچەرخدا، زانکۆ ڕۆڵی لە بووژانەوەی شارستانیەتی سەردەمی جیهانگیری هەیە، گەشەکردنی تەکنەلۆژیای پەیوەندی و زانیاریی زانکۆی لە دۆخی دەستەبژێری و پاوانکاری دەرهێنا و وەک دەزگایەکی هەمووانی و گشتی ناساند. زانکۆکانی خۆرئاوا دوای بڕینی قۆناغێک لە ئەزموون و ئەو سەختییانەی کە لە ساڵی ١٩٦٨ گەیشتە لوتکە، قۆناغی خۆتاقیکردنەوەی تێپەڕاند. بیرۆکە کلاسییەکانی زانکۆ کە تا ئەو کاتە باڵادەست بوون، ڕووبەڕووی پرسیار و سەرنج بوونەوە و بەسیاسیکردن و بەئەخلاقیکردنی زانکۆ دەستی پێ کرد. زانکۆ لە دەیەی شەست و حەفتای زایینییەوە گۆڕدراوە بۆ مەڵبەندێک بۆ پەرەسەندنی دیموکراسی، مافی مرۆڤ و چەمکەکانی وەک دادپەروەری، خۆشبەختی، یەکسانی و ئازادی. ئەرکی زانکۆ دەبێتە دەستەبەرکردنی کەشێکی ئارام و ئازاد بۆ گەڵاڵەبوونی ئەندێشەکان و دەرکەوتنی داهێنانەکان و زانستەکان.

## ڕەهەندەکانی زانکۆ

زانکۆ تەنها دەزگایەکی زانستی و پەروەردەیی پەتی نییە، بەڵکوو دامەزراوەیەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتوورییشە، هەروەها مەرجەعێکی بنچینەیی و بەهاداری کۆمەڵگایە و کاریگەریی گرنگی لەسەر داڕشتنی ناسنامەی کۆمەڵگا هەیە. زانکۆ چەند ڕەهەندێکی جیاوازی هەیە, لەوانە: ڕەهەندی سیاسی, یەکێک لەو کایە گرنگانەی ژیان کە پەیوەندیی توندوتۆڵی بە زانکۆوە هەیە, کایەی سیاسەتە. زانکۆ و سیاسەت لێکدابڕاو نین, بەسیاسیکردنی زانکۆ و بوونی پێگەی سیاسەت لە زانکۆدا بەپێی پێوەرە بابەتی و پیشەییەکان هێمایە بۆ سەربەخۆیی, زیندوویەتی و کارایی ئەو زانکۆیە. پێویستە زانکۆ سەرچاوەی بڕیاری سیاسی، پلانی سیاسی، کۆڕوکۆبوونەوەی سیاسی، پرس و ڕاوێژی سیاسی و باس و خواسی سیاسی بێت. لێرەدا مەبەست ئەوە نییە دەزگاکە وەک بنکەیەکی سیاسی مامەڵە بکات, بەڵکوو بەپێچەوانەوە مانای ئەوەیە زانکۆ ئەرک و وەزیفەی سیاسیی هەیە و پێویستە ئەو ڕۆڵە بگێڕێت, وەکوو بەرهەمهێنانی هزر و ئەندێشەی سیاسیی نوێ, خولقاندنی هۆشیاریی سیاسیی

نوێ و دروستکردنی مرۆڤی سیاسی، بەو واتایە ئەو کەسە وەک تاکێک لە زمان, مانا و ئەرکی سیاسەت تێبگات و سیاسیەت وەک بەشێکی گرنگی ژیانی تەماشا بکات, ئەگەر ئەمە مەیسەر بوو، ئەو کەسە دەتوانێ بەشداری سیاسیی هەبێت و ڕۆڵی سیاسیی خۆی بگێڕێت. پاشان مەبەست ئەوە نییە کە پیاوانی سیاسی بێن و لەناو زانکۆدا بەرپرسیارێتی وەربگرن، بەڵکوو مەبەست لەوەیە کە نابێت زانکۆ لە ژیانی سیاسی دابڕێت. ئەوەی کە یۆرگن هابرماس دەستنیشانی دەکات، پێویستە خودئاگایی سیاسی پێک بهێنێت و مرۆڤ لەو دۆخە پەتییە کۆمەڵایەتییە دابڕێت و هاوڵاتییەکی ڕەخنەگر, ئاوەزمەند, بەپرەنسیپ و ئامانجدار بەرهەم بهێنێت. ئەم پرۆسەیەش پێویستی بە ئازادییە، چونکە مرۆڤ بۆ ئەوەی بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێت؛ پێویستی بە ئازادییە، بۆ ئەوەی فۆرمێکی باوەڕپێکراوی زانستی وەربگرێت، بۆیە ئازادیی ئەکادیمی لەم بوارەدا پێویستە. ئازادیی ئەکادیمی ئەو شتەیە کە زانکۆ بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت پێویستی پێیەتی، چونکە زانکۆ دامەزراوەیەکی پیشەیی و زانستییە. ئەگەر زانکۆ ئازادیی نەبوو، ناتوانێت دەم لە سیاسەت بژەنێت و دەستی تێ وەربدات.

ڕەهەندی کۆمەڵایەتی, زانکۆ ڕەهەندێکی گرنگی سیستمی کۆمەڵایەتییە، واتە لە ئاگایی و توانasازی، هێزی مرۆیی و لێهاتوویيە ئینسانییەکان چالاکانە کاری کردووە، بەشێکی چارەنووسی خەڵکی دیاری کردووە، بۆیە ئەم دامەزاوە لە نەخشاندنی ژینگەی کۆمەڵایەتی, شوناسی کۆمەڵایەتی, ئەخلاقی دەستەجەمعی، بەهاکان و پەیوەندییەکان ڕۆڵی چالاکانە دەگێڕێت. کولتوور بەدەر لەوەی دین، پێکهاتەی کۆمەڵگا و دامودەزگای مەدەنی دایدەڕێژێت، بەڵام نابێت بایەخی زانکۆش لەم بوارە بە کەم تەماشا بکرێت، ئەوەی کە ناوی داهێنان و نوێگەری و پرۆژەی چاکسازی، یان هەر جۆرە گۆڕانێکی تری کۆمەڵایەتییە، لە زانکۆوە سەرچاوە وەردەگرێت.

ڕەهەندی ئابووری, بەستنەوەی زانکۆ بە شێوازی بەرهەمهێنان, پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان, سیاسیەتی ئابووری و بازاڕی کارەوە؛ دەرکەوتەیەکی گرنگی دونیای نوێیە کە زانکۆ بەشداریی بەهێزی تێدا کردووە. لە بنەڕەتدا خۆی زانکۆ بۆتە کۆمپانیایەکی تایبەت، یان وەکوو کارخانەی لێ هاتووە, لە ئێستادا زانکۆ وەک دامەزراوەیەک دەبینرێ کە خاوەنی داهات، پرۆژەی ئابووری و پیشەی ئابووریی تایبەت بە خۆیەتی و جۆرێک پەیوەندیی بازرگانیی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەم دیاردەیە زیاتر لە کۆمەڵگەی پیشەسازی و پیشکەوتوودا ڕەونەقی وەرگرتووە و ئەوە دەسەلمێنێت زانکۆ پەیوەندیی کاریگەری بە بازاڕ، هەلی کار و سیاسەتی ئابووریی وڵاتەوە هەیە. بەرهەمهێنانی کادری لێوەشاوە و بەتوانا بۆ ئەم بوارانە، بە پلەی یەکەم ئەرکی زانکۆیە. لەگەڵ لەناوچوونی کولتووری نەتەوەیی و سەرهەڵدانی کولتووری پۆست دەوڵەت یان سەروو دەوڵەت، زانکۆکان بوونەتە کۆمپانیایەکی گەورە و بەرەو جۆرێکی سەربەخۆی ئابووری هەنگاویان ناوە.

بەدەر لەو ڕەهەندانەی کە ئاماژەیان بۆ کرا، کارە سەرەکییەکانی زانکۆ خۆی لە زەمینەی پەرەپێدانی سەرچاوە مرۆییەکان، بڵاوکردنەوەی زانست و هەروەها بەهێزکردنی ژێرخانی فکری و فەلسەفیی کۆمەڵگا دەبینێتەوە. ئەو هەنگاوانەش زیاتر لێکەوتەی توێژینەوەی زانستییە. بە بۆچوونی هایدگەر: «ڕۆحی زانکۆ بریتییە لە توێژینەوەی زانستی.» هەروەک ئەرکی زانکۆکان تەنها لە بەرهەمهێنانی زانستدا کورت ناکرێتەوە، بەڵکوو چاکسازی و ڕێنمایی زانکۆ بریتییە لە بەهێزکردنی ئاوەز (عەقڵ)، بیرکردنەوە، بەرپرسیارێتیی گەشەپێدانی سەرمایە مرۆییەکان، خودباوەڕی و پەرەپێدانی زۆرێکی تر لە ڕەگەزەکانی کۆمەڵگەی

لە سەرشانە. پێویستە زانکۆ توانا و لێهاتووییەکانی خۆی لە ڕووی هونەری، فیکری، زانستی و پسپۆڕییەوە لە پێناو گەشەپێدانی کۆمەڵگە بخاتە ڕوو، گەشەپێدانی پایەدار لە کۆمەڵگە، گەشەپێدانێکی پلانبۆداڕێژراوی زانستیی دوورمەودایە، کە زانکۆ ڕۆڵی بنچینەیی و قووڵی تێدا دەگرێت، ئەویش لە دوو لایەنەوە: یەکەم: بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی بۆ بەشداری و هاوکاریی کۆمەڵایەتی لە پێناو بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی یاسامەند و داڕێژراو لەسەر بەها مرۆییە باڵاکانی وەکوو: گفتوگۆ، لێکتێگەیشتن، قبووڵکردنی ئەوی تر، مرۆڤدۆستی، دادپەروەریخوازی، بەرپرسیارێتیی بەشداریی خوازیارانە، ڕەفتاری هاوڵاتی، یاساسەروەری... دووەم: دانایی و تەکنەلۆجیا، بەرهەمهێنانی زانستیی هونەری و پراکتیکی، نوێگەری و زیندوو ڕاگرتنی زانست، تەکتیک و بەکارهێنان کە هاوتا بێت لەگەڵ نیاز و پێداویستییەکانی کۆمەڵگا. لێرەدا زانکۆ دەزگایەکی کاریگەرە لە پێناو خزمەتکردن بە کۆمەڵگا، لەو ڕوانگەیەوە وتەیەک هەیە دەڵێت: «گۆڕانکاری لە هەر کۆمەڵگایەکدا، گرێدراوی گۆڕانکارییە لە ناوەندە پەروەردەییەکاندا»، گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە گۆڕانی پەروەردە و فێرکردنەوە دەست پێ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا زانکۆ تەنها شوێنی فێربوون، توێژینەوە و پەروەردەکردنی دەستەبژێر نییە، بەڵکوو گرنگترین ڕۆڵی زانکۆ کولتوورسازی و گەشەپێدانی بەهاکانە لە کۆمەڵگەدا و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتییە لەبەرانبەر کێشەکانی کۆمەڵگا. لە لایەک زانکۆکان دەبێت پارێزەری بەهاکان و دابونەریتە کولتوورییەکانی کۆمەڵگا بێت و لە لایەکی ترەوە بەرپرسیارە لەوەی بەها نوێییەکان، زانست و تەکنەلۆژیای نوێی پێویست بۆ کۆمەڵگا دابین بکات, ئەگەر هاوسەنگی لەنێوان ئەو دوو ڕەگەزە ڕانەگرێت، ئەوا کۆمەڵگا تووشی لێکدژی و تەنگەژەی ناوەکی و دەرەکی دەکاتەوە. جولیس ناریرە دەربارەی ڕۆڵی زانکۆ لەو کۆمەڵگایانەی کە لە حاڵەتی گەشەکردندان، دەڵێت: «زانکۆ لە وڵاتێکدا کە مژۆڵی گەشەکرندنە، دەبێت جەخت لەسەر ئەو بابەتانە بکاتەوە کە بوونی نەتەوەکەی پێوە بەندە. زانکۆ دەبێت لەگەڵ خەون و ئامانجە مێژووییەکانی تاکەکانی ئەو نەتەوەیە پەیوەندییەکی قووڵی هەبێت».

ئەمڕۆ بێجگە لە توێژینەوە و فێرکارییە فەرمی و پیشەییەکان, زانکۆ لەبەرامبەر خوێندکارەکاندا چوار ڕۆڵی چاوەڕوانکراو دەگێڕێت: «پەروەردەکردنی هاوڵاتی, لێهاتوویی پەیوەندی بە دەوروبەرەوە, پەرەپێدانی کارامەیی و بەهرەکان, توانای ڕەخنە». هەروەها زانکۆ بەشێکی جەوهەری و دانەبڕاوی خەڵک سالاری و بەڕێوەبردنی عەقڵانی و کارامەیی کۆمەڵگا لەقەڵەم دەدرێت. لەسەر ئەم بنەمایە، پێویستە پرس و پێگەی زانکۆ لەناو بەستێنی زەرورەتەکانی «گەشەی سیاسی» و لە چوارچێوەی داواکاریی «گەشەی ئابووری» ڕوون بکرێتەوە. زانکۆ وەکوو عەقڵی جیاکەرەوە و ڕەخنەگری کۆمەڵگا, پێویستە لە خزمەتی بنیاتنانی سیستمێکی ئازادی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیدا بێت. کاتێک زانکۆ وەکوو عەقڵی ڕەخنەگری کۆمەڵگا ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت کە پێویستە پێشوەخت پێگە و پایەی زانکۆ بەفەرمی بناسرێت و دانی پێدا بنرێت و ڕێز و حورمەت لە ئەندامانی زانکۆ، مامۆستایان و خوێندکاران بگیرێت. زانکۆ دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنانی مەعریفەیە، کە پەیوەندیی بە پرسەکانی کۆمەڵگەی سیاسی، کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگەی ئەخلاقییەوە هەیە. بۆیە ئەمڕۆ زانکۆ تەنها دامەزراوەیەکی ئەکادیمی نییە و لەو ڕووەوە ناپێورێت, بەڵکوو دەزگایەکی کولتووری و مەدەنییشە. پەرەسەندنی هەمەلایەنە لەگەڵ گەشەی زانستیدا دەست پێ دەکات, واتە ئەگەر زانست پێش بکەوێت, کولتوور و سیاسەتیش گەشە دەکات و نوێ دەبنەوە. هەروەها کولتووریش قەرزاری زانستە نوێیەکانە. گەشەی زانستیش لە

کەشی ئازاددا بەدی دێت, زانست بە سروشت ئازادیخوازە, ئەگەر زانست بەدی هات، لەگەڵ خۆیدا ئازادییش دەهێنێت و ئەگەر ئازادی هات, زانستی بەدوادا دێت. زانکۆ لە واتا گشتییەکەیدا بەرهەمی وتووێژی ئازاد، تێگەیشتنی ئازاد و ڕەخنەی ئازادە. بۆیە تەنگوچەڵەمە دروستکردن و ڕێگریی سیاسی و ئیدارییەکان لە زانکۆ و دەرکردنی ڕووناکبیرانی زانکۆ و بەرتەسکردننەوەی ئومێدی خوێندکاران، دەبێتە دیوارێک لەبەردەم گەشەی زانستیدا. لەم نێوەندەدا نەک تەنها کاروانی زانست پێش ناکەوێت, بەڵکوو ڕەوڕەوەی سیاسەت و کولتووریش لەکار دەکەوێت و زیانەکانیشی لە داهاتوو و ئاسۆدا دەردەکەوێت.

بە بۆچوونی هابرماس، ئەو خاڵەی کە جێگەی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە هەر کات زانکۆیەک لەسەر بنەمای کۆمەڵێک دەلیلی لۆژیکی یاخود سازگار لەگەڵ بنەمای عەقڵانیەتدا و چەشنی دامەزراوە و کارخانەیەک ڕێک بخرێت، ئەو کاتە بەبێ ئەوەی خۆی ئاگای هەبێت، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسی و ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری جێ دەهێڵێت. ئەو زانیارییانەی کە لە ڕێگەی توێژینەوەکانەوە دێنە بەرهەم، دەبنە ژێرخان و بونیادێکی گرنگ بۆ پەرەپێدانی کەناڵەکانی پیشەسازی، بووژانەوەی فکری و زانستی و خۆشگوزەرانیی کۆمەڵگا، بێجگە لەوەش بەڕێوەبەرایەتییەکان، دەزگاکان و دەسەڵاتەکانی تری بڕیاردان دەتوانن بۆ داڕشتنی ستراتیژ و پلانی کارکردنیان سوودی لێ ببینن. زانکۆ سێ بەرپرسیارێتی یاخود ئەرکی لە ئەستۆدایە: یەکەم: زانکۆ بەرپرسیارێتیی مسۆگەرکردنی ئەو کارەی لە ئەستۆدایە کە دەرچووەکانی بێجگە لە پسپۆڕی و بوارەکەی خۆی، لانی کەم تایبەتمەندی و توانای پێویستی لە دەرەوەی کارکردنی خۆی هەبێت. مەبەست لە «دەرەوەی کارکردنی خود» یاخود «سنووری ئەرک»، تەواوی ئەو بەرپرسیارێتی و ئەتوارانەیە کە پەیوەستە بە بەدواداچوونی پیشەیەکی پسپۆڕی کە بەتەنیا لە زانست و لێهاتوویيە پیشەیی پسپۆڕییەکانەوە بەدەست نایەت. دووەم: پەیامی زانکۆ بریتییە لە گواستنەوە، ڕوونکردنەوە و بڵاوکردنەوەی دابونەریتی کولتووری کۆمەڵگا. لەم بەستەرەدا دەتوانین پانتایی کاریگەرییە ڕۆشنگەرییەکانی زانستی کۆمەڵایەتی و مرۆیی لەسەر ڕەوتی «خودناسی» ببینین. سێیەم: زانکۆ هەمیشە ئەرکێکی بەجێ هێناوە کە پێناسە و دیارکردنی سنوورەکانی کارێکی ئاسان نییە. لەمڕۆدا دەتوانین بڵێین ئەوە زانکۆیە کە «خودئاگایی سیاسی» خوێندکارەکان پێک دێنێت. تا زەمەنێکی دوورودرێژ ئەو خودئاگاییەی کە لە زانکۆدا دروست دەبوو، خودئاگاییەکی ناسیاسی بوو. ئەو خودئاگاییە نموونەیەکی تاقانە بوو، پێک هاتبوو لە جۆرێک لە جەوهەرگەرایی یان زاتگەرایی (inwardness) کە لە کولتووری هیومانیزم و وەفاداری بۆ دەوڵەت؛ سەرچاوەی گرتبوو. واتە دەبێت زانکۆ گرێ بدرێتەوە بە مەسەلە سیاسییەکانی ڕۆژ و لە پۆلەکانی خوێندن و لەنێوان خوێندکارەکاندا شرۆڤە و تاووتوێ بکرێت و پشتیوانی لە ڕێکخراوە سیاسییە خوێندکارییەکان بکرێت. واتە بەسیاسیکردنی زانکۆ کە لەسەر ئەو بنەمایە بتوانرێت باس و مەسەلە سیاسییەکان لە زانکۆدا شەرعیەتیان پێ ببەخشرێت و فۆڕمێکی تەواو یاسایی و ئاسایی وەربگرن. سیاسەتەکانی ڕۆژ ببنە بەشێک لە کۆمەڵگەی دەروونیی زانکۆ. ئەمە هەمان بنەمایە کە «فۆڕمی دیموکراتیک» بۆ بڕیاردان پێناسە و دیاری دەکات. واتە بەعەقڵانیکردنی بڕیارەکان، بە جۆرێک بتوانرێت بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بەبێ هیچ هەڕەشە و ترساندنێک زانکۆ ئەم ئەرکە سیاسییەی خۆی بەجێ بهێنێت.

## قەیرانی زانکۆ لەم ناوچەیە

زانکۆ وەک دامەزراوەیەک دەبێت لە بەستێنی مێژوویی، کولتووری و ئابووریی خۆیدا بخوێنرێتەوە. سەرەتای سەدەی ڕابردوو، ساتەوەختی دەرکەوتنی پرۆژەی مۆدێرنیتە بوو لەم ناوچەیەدا, بۆیە زانکۆ دەبێتە یەکێک لە پێدراوەکانی دونیای مۆدێرن لەم ناوچەیە. مێژووی زانکۆ لەم ناوچەیە لە ١٠٠ ساڵ تێپەڕ ناکات, بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت بەر لە پرۆژەی مۆدێرنیتە، کایەی زانست و مەعریفە بوونی نەبووە, کێشەکە ئەوە بوو زانستەکان بە دامەزراوەیی و گشتی نەکراون و لە چوارچێوەی زانکۆدا نەچەسپان, هەروەک پێشتر باس کرا. دواجار زانکۆکانی ئەم ناوچەیە لەسەر مۆدێلی ئەورووپی دروست بوون، لەسەر بنەمای ئەورووپامیحوەری (Eurocentric)، واتە دەرهاویشتەی کەڵەپووری مێژوویی, پەرەسەندنی کولتووری و چڤاکی, بووژانەوەی سیاسی و نوێبوونەوەی پرۆسە ناوەکییەکانی کۆمەڵگاکە نییە, بەڵکوو پرسێکی وەرگیراو و هاوردەکراوە. زانکۆ دیاردەیەکی خۆرئاوایی و ئەورووپییە. وەک زۆرێک لە دیاردەکانی تر، لە ئەنجامی بەریککەوتنی ئەم دوو کولتوورە، خۆرئاوا و خۆرهەڵات, گوتاری هێنان و دامەزراندنی زانکۆ وەک لێکەوتەیەکی دونیای مۆدێرن لەم ناوچەیە سەری هەڵدا، نەگونجان و ناتەبایی زانکۆکان لەگەڵ نەریتە کولتووری و مێژووییەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە حاڵەتی گەشەکردندان, دۆخێکی نەشاز و ناتەندروستی لێ کەوتەوە, واتە لە لایەک لایەنگری بەها و پرسە ناوخۆییەکانی خۆیان بوون و لە لایەکی ترەوە نمایشی مەسەلە جیهانییەکانیان دەکرد، بەو هۆیەوە گرژییەک هاتە ئارا کە لە ڕێگەی پەیوەندیی نێوان سنوورەکانی کولتوورەوە چارەسەر دەکرا.

دەرکەوتنی زانکۆ لەم ناوچەیە بەبێ بوونی نوێگەری، ڕابوونی کۆمەڵایەتی و گۆڕانی ڕیشەیی لە بەشێکی گرنگی کایەکانی ژیاندا, بە دەربڕینێکی تر: بەبێ ئامادەسازی و زەمینەخۆشکردن؛ ڕووبەڕووی ئەم بابەتە بوونەوە. هەمیشە کەلێنێک لەنێوان تایبەتمەندییە مێژووییەکانی ناوچەکە و خواست و پێداویستییەکانی زانکۆ بە واتا ئەورووپییەکەی هەبووە و تا ئێستاش ئەو کەلێنە بەتەواوی پڕ نەکراوەتەوە، واتە بە چەمک و تێگەیشتنی ئەورووپی و بە ژینگە و کولتووری ڕۆژهەڵاتی. جگە لەوە زانکۆ و دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا بە شێوەیەکی نوێ لەم وڵاتانە خۆماڵی و خوجێیی نەبووە. لەم ڕووەوە زیاتر لەگەڵ کولتووری خۆرئاوا پەیوەندیی هەیە تا ژینگە و کولتووری کلاسیکی ناوچەکە. زانکۆ گەورەکانی وەک بۆلۆنیا, ئۆکسفۆرد, کامبریج, سۆربۆن, بەرلین؛ هەموویان بەشێنەیی لە هەناوی کایە زانستییەکانی قۆناغە جیاوازەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ڕێنیسانس و ڕۆشنگەرییەوە سەریان دەرهێنا و درێژەپێدەری هەمان ڕەوت و ڕەگوریشەی مێژوویین. لەبەر ئەوە زانکۆ بەبێ کەلەپوور و سەرمایەیەکی گەورەی فکری و مەعریفی؛ ئیمکانی دەرکەوتنێکی بەبڕشتی نییە, ئەگەر دەربکەوێتیش؛ وێنەیی و ڕووالەتییە، زانکۆ پەیوەندیی بە دەوروبەری خۆیەوە هەیە، تەندروستی و نەخۆشییەکانی پەیوەندیی بەو هەلومەرج و دۆخەوەیە کە تێیدا دەژی.

یەکێک لە بیرمەندە هیندییەکان دەڵێت: «سیستمی فێرکردن کە هاوشانی بەریتانیا هاتە ناو هیندەوە، وەڵامدەرەوەی خواستە جیاوازەکانی بەریتانیا بوو نەک هیند, لە ئاکامدا لە سیستمی فێرکردنی هیندییەکاندا، پەیداکرنی پیشە پێویستی بە بڕوانامە بوو، نەک بەدەستهێنانی تێگەیشتن و بیرکردنەوە دەربارەی پێشکەوتنە نوێیەکان». ئەمە دەلالەتە لەوەی شێوەی خستنەڕووی زانست لە سیستمی فێرکردنی هیندی لەگەڵ ئەو مەبەستەی کە زانست لە ئەورووپا پێی گەیشتبوو، زۆر ناکۆک بوو. لە ئەورووپا زانکۆ بەشێکی گرنگی بزووتنەوەی گۆڕانکاری بوو, ئامانجیشی گۆڕانی تەواوی کۆمەڵگا بوو, بوار و پنتێکی دیاریکراوی نەدەکردە ئامانج.

## سەرچاوەکان:


١- داریوش رحمانیان, پارادایم تاریخ نگری و تاریخ نگاری مدرن, به کوشش: حسن حضرتی و عباس برومند اعلم, چاپ اول, تهران, پژوهشکده تاریخ اسلام, ١٣٩١, ص٨٤ .

٢- احمد فضایلی, بررسی مبانی فرهنگی آموزش عالی در جهان غرب و ایران , مجله علوم انسانی, آذر و دی ١٣٨٥- شماره ٦٦, ص ١١-١٦ .

٣- اصغر افتخاری و دیگران , رابطه دانشگاه با قدرت سیاسی در جهان سوم, مجله مطالعات معرفتی در دانشگاه اسلامی, پاییز ١٣٨٨, شماره ٤٣, ص ١٠٣.

٤- تورستن هازن, ایده دانشگاه, ترجمه علی طایفی, مجله رهیافت, بهار و تابستان ١٣٧٧, شماره ١٨, ص١٥- ١٧ .

٥- حامد شیری, شاخصهای دانشگاه در جامعه دانش: الگویی برای ارزیابی دانشگاه ها در جامعه جدید, مجله مهندسی فرهنگی, پاییز ١٣٩٢, شماره ٧٧, ص ٢٢١-٢٢٧.

٦- حسین خنیفر, زینب سادات موسوی, بایسته های دانشگاه فرهنگ ساز در هزاره سوم,( مطالعه موردی: جامعه اسلامی در عرصه جهانی ), مجله معرفت در دانشگاه اسلامی, بهار ١٣٩٠, شماره ١, ص ٩٦.

٧- حسین مصباحیان, درباره شرایط امکان آموزس فلسفه در دانشگاه, فصلنامه فلسفه, زمستان ١٣٨٨, شماره ٤, ص٢٤-٢٨.

٨- رضا منصوری, نقش نهاد دانشگاه در جامعه نوین, مجله رهیافت, تابستان ١٣٧٤, شماره ٩, ص ٥٠ .

٩- زهرا داور پناه, ذات دانشگاه و فلسفه آلمانی, مجله زمانه, مرداد و شهریور ١٣٩٠,شماره ١٠٢ و ١٠٣, ص ٩٨.

١٠- سید حسین رئیس السادات, دانشگاه, فرهنگ وجامعه, مجله دانشکده ادبیات و علوم انسانی بیرجند, شماره دوم, ص ١٤٦-١٤٧.

١١- محمود رئوفی, دانشگاه و توسعه, پژوهش و برنامه ریزی در آموزش عالی, تابستان ١٣٤٧, شماره ١٠, ص ٨٠-٨١ .

١٢- نعمت الله فاضلی, چالشهای دانش و رسالت دانشگاه در دوره ما, مجله کتاب ماه علوم اجتماعی, شهریور ١٣٨٣, شماره ٨٣, ص٣٤.

١٣- هادی خانیکی, کندوکاوی در مسائل بنیادین دانشگاه, مجله آیین, دی ١٣٨٦, شماره ١٠, ص٣-٥ .

١٤- یورگن هابرماس, رسالت دانشگاه در جامعه مدرن, ترجمه حسینعلی نوذری, مجله رهیافت, زمستان ١٣٧٢, شماره ٦, ص٩١-٩٤.

# کاریگەریی تەکنۆلۆژیا لەسەر پرۆسەی خوێندن و چۆنێتیی بەکارهێنانی





د. مەحموود زمناکۆیی
پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی سەلاحەدین

## پێشەکی:

یەکێک لە سیما و دەرهاویشتەکانی سەردەمی نوێ و رۆژگاری ئەمرۆ، بریتییە لە پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤ لە رووی تەکنولۆژیا بەگشتی و ئامرازەکانی پەیوەندی و گەیاندن بەتایبەتی، بە جۆرێ گۆی زەوی و دانیشتووانەکەی وەک دەڵێن: وەک «شارێک» یان «گوندێکی» لێ هاتووە، بەڵکوو زیاد لەوەش لە شارێک یان گوندێک زۆر رووداو دروست دەبێ، رەنگە خەڵکی ئەو شارە یان ئەو گوندە نەیزانن و لێی بێئاگابن. بەڵام لەم رۆژگارەی ئەمرۆدا رووداوێک لە رۆژهەڵات یان رۆژئاوا روو دەدات، دەمودەست و بە شێوەی راستەوخۆ لە رێی کەناڵەکان، یان تۆری ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئامرازەکانی تری پەیوەندیی وەک: (فەیسبوک، ڤایبەر، واتسئاپ، تویتەر... هتد) دەگوازرێتەوە. هەر بۆیە لە مێژە بیرمەند و سیاسەتمەدار و سەرۆکی پێشووتری کۆماری ئێران «محەمەد خاتەمی» بە ناونیشانی پەرتووکە بەناوبانگەکەی، گوزارشتی لەو راستییە کردووە و نووسیویەتی: «از دنیای شهر تا شهر دنیا»، واتە: لەو کاتەی کە هەموو شارێک دونیایەکی سەربەخۆ بووە، تا ئەمرۆ کە هەموو دونیا بووە بە یەک شار.

ئەڵبەتە ئەم وتەیەی ئەو لەو کاتەی کە ئەم پەرتووکەی نووسیوە لە جێی خۆی بووە، بەڵام ئێستا و پاش تێپەڕبوونی ئەو چەند ساڵە و گەشتنی تەکنۆلۆژیا بە چڵەپۆپەی پێشکەوتن و بەردەوامبوونی لە داهێنان بە خێراییەکی بەرچاو، ئەو قسەی ئەویش کۆن بووە بۆ واقیعی ئێستامان.

هەر چۆنێک بێ، مرۆڤ دەبێ کوڕی رۆژگاری خۆی بێ و نابێ لە دەرهاویشتەکانی پێشکەوتن خۆی بێبەش بکات. لەم روانگەیەوە دەچینە ناو ناوەرۆکی بابەتەکەمان کە بریتییە لە کاریگەریی ئەرێنی و نەرێنی یان چاک و خراپی ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیا، لەسەر پرۆسەی خوێندن لە قۆناغە جیاجیاکانیدا و لە چەند تەوەرێک -پشت بە خوا- دەیخەینە روو:

## تەوەری یەکەم: کاریگەرە ئەرێنییەکانی لەسەر پرۆسەی خوێندن

مەبەست لە پرۆسەی خوێندن ئەو پێکهاتە سەرەکییەکانەیە کە لەخۆی گرتووە، کە بریتین لە:

١. خوێندکار، کە میحوەری سەرەکییە و ئامانجی پرۆسەی خوێندنە.

٢. پرۆگرامی خوێندن.

٣. مامۆستا، کە بەپرسی راستەوخۆی پرۆسەی خوێندنە و گوێزەرەوەی گاریگەریی تەکنۆلۆژیایە بۆ ناو هۆڵەکانی خوێندن.

### کاریگەریی لەسەر خوێندکار

دەتوانین لە چەند خالێکدا کورتی بکەینەوە:

١. دەبێتە هۆی فەراهەمکردنی پانتاییەکی باشی ئازادی و سەربەخۆیی و هەستکردن بە خود، ئەمەش وا لە قوتابی دەکات کە ئازادانە بڕیار بدات و ئەو بوارەی گونجاوە لەگەڵ تواناکانی؛ هەڵبژێرێت.

٢. گەشە بە توانای بیرکردنەوە و تەفاعول و بەشداریی ئیجابی لە قوتابیدا دەدات، ئەمەش وا دەکات رێژەی کەوتنی قوتابیان لە وانەکانیان کەم ببێتەوە.

٣. رەخساندی کەشی دەستکەوتنی زانیاریی نوێ لە هەموو بوارەکاندا و زۆر بەخیرایی و بە تێچوویەکی کەم، سەرەڕای تێگەشتنی چەمک و وانەکان بەئاسانی.

٤. ئاسانکاری دەکات بۆ ئاڵوگۆڕکرنی زانیاری لەنێوان قوتابیان، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی زانستییان و زیادکردنی شارەزاییان.

### کاریگەریی لەسەر مامۆستا

١. سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ مامۆستا بۆ دەستخستنی زانیاریی نوێ بە هەموو جۆرەکانی و لە هەموو بوار و رەهەندەکاندا، بەتایبەت سوودبینین لێی بۆ ئەو بابەت و وانەی کە دەیڵێتەوە.

٢. ئاسانکاری دەکات بۆ بەدواداچوونی ئەو ئەرکانەی کە بە قوتابییەکانی سپاردووە، هەروەها بڵاوکردنەوەی

وانەی زانستی و ئاڕاستەکردنی قوتابیان.

٣. دەبێتە هۆی گەڕاندنەوەی جوهد و ماندووبوون و کاتێکی زۆر بۆ مامۆستا، ئەوەش دەبێتە دەرفەت بۆی تا هەگبەی خۆی زیاتر بکات لە زانست و ڕۆشنبیری.

٤. بەهێزکردنی پرەنسیپی کاری بەکۆمەڵ (Working Group) لەنێوان قوتابیان لەنێو پۆلدا.

٥. ڕەخساندنی هەل و دەرفەتی بەشداریکردنی قوتابیان لەو چالاکییانەی کە ناکرێ لە پۆلدا ئەنجام بدرێت.

## کاریگەریی لەسەر پرۆگرامی خوێندن

١. بە هۆی ئاسانکاری و زۆری و هەمەجۆریی زانیاریی بەردەست، زۆرینەی قوتابیان حەزیان بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیایە، هاوکات ڕەنگە ڕێژەیەکی کەم لە قوتابیان حەزیان بە شێوازی تەقلیدی بێت لە خوێندن، بەڵام ئەمە وا دەکات پێویستیان بە ماندووبوون و کات و تێچووی زیاتر هەبێت بۆ دەستکەوتنی زانیاری و تێپەڕاندنی قوناغەکانی خوێندن.

٢. سوودبینین لە ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیا وا دەکات قوتابی کەمتر پشت بە مامۆستا ببەستێت، بە پێچەوانەی خوێندکاری پرۆسەی خوێندنی تەقلیدی.

٣. خەرجییەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەوت، چونکە پرۆگرامی خوێندن لە کاغەزەوە دەبێتە ئەلکترۆنی، بەمەش زۆرێک لەو سەرمایە و داهاتەی کە لە بۆ دروستکردنی کاغەز و چاپکردنی پەرتووک... هتد خەرج دەکرێت؛ دەگەڕێتەوە، بێجگە لەوەی کە هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ ژینگەپارێزی و پاراستنی سامانی دار و درەخت کە سەرچاوەی سەرەکیی کاغەزە.

٤. پرۆسەی خوێندن شیرین و بەچێژ دەکات لەلای قوتابی.

## تەوەری دووەم: کاریگەرییە نەرێنییەکان لەسەر پرۆسەی خوێندن

لایەن و دەرهاویشتەکانی تەکنۆلۆژیا و ئامرازەکانی هەر هەمووی ئەرێنی نییە، بەڵکوو خاڵی نەرێنی و نێگەتیڤی تێدایە، کە لێرەدا دەتوانین لە چەند خاڵێکدا چڕی بکەینەوە:

١. ئەگەری سەرقاڵبوونی خوێندکار، بە جۆرێ ئاگای لە وانەکەی نەمێنێت، بە چاوتێبڕین لەوەی کە هەیە لەسەر شاشەی ئامێرەکەی (کۆمپیوتەر، لاپتۆپ)، دواجار دەبێتە هۆی لەدەستچوونی ئەوەی کە گرنگە.

٢. تەرکیزکردنی قوتابی لە ئامێرە ئەلکترۆنییەکان کۆمەڵێ گیروگرفت دەخولقێنێت، لەوانە: لەدەستدانی توانای پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تر، چونکە مامەڵەیان تەنها لەگەڵ شاشەکەی خۆیان دەبێت.

٣. ڕاهاتن لەسەر چارەسەرکردنی پرسە زانستییەکان لە ڕێی ئامێرە ئەلکترۆنییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی بێتوانابوون لە بەکارهێنانی کاغەز و پێنووس لە کاتی نەبوونی ئەم ئامێرانە.

٤. کاریگەریی نەرێنیی دەبێ لەسەر پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ مامۆستا، چونکە دەگۆڕێ بۆ پەیوەندیی ناڕاستەوخۆ لە ڕێی ئینتەرنێت.

## تەوەری سێیەم: کاتێ تەکنۆلۆژیا دەبێتە لەمپەر لە گرنگیدان بە خوێندن

تەکنۆلۆژیا و ئامێرەکانی چەکێکی دوو جەمسەرە، مرۆڤ دەتوانێ بە شێوەی تەندروست و بەپێچەوانەش بەکاری بێنێت. بۆیە پێویستە هەموو بەکاربەرێک -بەتایبەت قوتابی- بە بەرنامە و دیاریکردنی کاتی گونجاوی دەست بۆ ئەم چەکە بەرێ و بەکاری بێنێت، ئەگەرنا ڕەنگە لەبریی سوودوەرگرتن، زیانی زۆرتری پێ بگات، چونکە کاتێک کە پێوە ئالوودە دەبێ و کاتێکی زۆر لە پێویستی بۆ تەرخان دەکات، بێگومان دەبێت لەسەر

حیسابی ئەرک و واجباتی تر بێ، دەرنجام دەبێتە هۆی پەککستنی پرۆسە و کارە گرنگەکانی تر یان لانی کەم لاوازکردنی، هەر بۆیە وتراوە «کل شيء زاد عن حده انقلب الى ضده»، واتە: هەر شتێ لە سنووری خۆی تێپەڕی، وەردەگەڕێت بۆ دژەکەی.

بۆیە ئەگەر قوتابی لە هەموو ئاستە جیاوازەکاندا بەدروستی مامەڵە لەگەڵ ئامێرەکانی تەکنۆلۆژیا نەکات، بێگومان ئەم کارە کاریگەری و ڕەنگدانەوەی زۆر خراپی دەبێ لەسەر پرۆسەی خوێندن و بڕینی قۆناغەکان بەسەرکەوتوویی و بەدەستهێنانی کۆنمرەی بەرز.

### تەوەری چوارەم: بنەماکانی دروست بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا

بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا بە هەموو جۆرەکانی، پرسێکی هەستیارە و دەبێ بە وریایی و شارەزایی قسەی لێ بکرێت و لەژێر بنەما و مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلام وێنا بکرێت و لەگەڵ ڕەچاوکردنی گۆڕانی هەلومەرج و واقیعدا بڕیاری لەسەر بدرێت. بۆیە سەرەتا دەبێ ئاماژە بەو بنەما گشتییانە بدەین کە دەبنە پێوەر لەم بابەتە و پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکەین:

یەکەم: زۆر دەگمەنە لە دونیادا شتێک هەبێ تەنها بەرژەوەندی و سوودی هەبێ و زیانی تێدا نەبێ، یان بەپێچەوانەوە شتێک هەبێ تەنها زیانی تێدا بێ و هیچ سوود و قازانجی تێدا نەبێ.

هەر بۆیە پێشەوا عیزی کوڕی عەبدولسەلام دەفەرمووێ: «واعلم أن المصالح الخالصة عزيزة الوجود»، واتە: بزانە کە بەرژەوەندیی ڕووت و بێزیان دەگمەنە.

کەواتە: ناکرێ بە تێکڕا و بەڕەهایی بڕیاری قەدەغەکردنی بەرکاهێنانی تەکنەلۆژیا بدەین لەبەر ئەوەی شتی خراپ و زیانبەخشی تێدایە یان لێکەوتەی خراپی لێ دروست دەبێت، هاوکات ناشکرێ بەڕەهایی ڕێگا بە بەکارهێنانی بدەین، بەبێ سنوور و بێ قەید و بەند، بە پاساوی ئازادیی تاکەکەسی.

چونکە قورئان ڕێگای بە هەندێ شت داوە، بەڵکوو واجبی کردووە، ئەگەرچی بەزاهیری زیانی تێدایە، بۆ نموونە جیهادی واجب کردووە، لەگەڵ ئەوەی گیان بەختکردن و ئەزیەت و ئازاری تێدایە.

لە هەمان کاتدا مەی خواردن و قوماری قەدەغە کردووە، چونکە زیانیان زیاترە لە سوود و قازانجیان: {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا} (البقرة: ٢١٩).

دووەم: تەکنۆلۆژیا ئامراز و وەسیلەن، خودی ئامرازیش هیچ حوکمێکی سەربەخۆی لەسەر نییە، بەڵکوو حوکمی ئەو ئامرازە، هەمان حوکمی ئەو ئامانجەیە کە دەخرێتە خزمەتی.

چونکە -وەک وتمان- ئامرازەکان دوو جەمسەرن، وەک چۆن بۆ مەبەستی چاک و کاری باش بەکار دێت، بە هەمان شێوە بۆ مەبەست و کاری خراپ بەکار دێت.

بۆ نموونە: (مۆبایل، یان تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان) دەکرێ بۆ پەیوەندی و هەواڵپرسینی خزمان و دۆستان بەکار بهێنرێت کە پێویستە و دەشکرێت بۆ ئازاردانی خەڵک و سووکایەتی بە عەرز و نامووس و کەرامەتیان و گێچەڵکردن بە خوشکان و کچانیان بەکار بهێنرێت کە حەرامە.

بۆیە پێشەوا شاتبی دەڵێ: «وقد تقرر أن الوسائل من حيث هي وسائل غير مقصودة لانفسها، وإنما هي تبع للمقاصد، بحيث لو سقطت المقاصد سقطت الوسائل، وبحيث لو توصل إلى المقاصد دونها لم يتوسل بها.»

واتە: جێگیر بووە کە ئامرازەکان -لەو ڕووەوە کە ئامرازن- خودی خۆیان مەبەست نین، بەڵکوو پاشکۆی مەبەستەکانن، بە جۆرێ ئەگەر مەبەستەکان؛ نەمان، ئامرازەکانیش نامێنن و بە جۆرێ ئەگەر دەکرا بگات بە مەبەستەکان بێ ئامرازەکان، ئەوە ناکرێنە ئامراز.

کەواتە: ئەگەر ئامێرەکانی تەکنەلۆژیا بۆ شتی باش و سوودبەخش بەکار هێنران، ئەوە دروستە، ئەگەر بۆ شتی خراپ و زیانبەخش بەکار هێنران، ئەوە حەرامە.

سێیەم: هەر ئامرازێک ئەگەر خودی خۆشی حەڵاڵ و دروست بێ، بەڵام لەگەڵ حەرامێک تێکەڵ بوو یان ئەو حەڵاڵە بووە هۆی پەیدابوونی حەرامێک، ئەوە ئەو حەڵاڵەش حەرام دەبێ با عیبادەتێکی واجبیش بێ.

بۆیە بنەمایەکی شەرعی دەڵێ: «الطاعة إذا صارت سببا للمعصية ترتفع الطاعة.»

واتە: ئەگەر عیبادەتێک بووە هۆکار و ئامرازی تاوانێک، ئەوە حوکمی عیبادەتەکەی هەڵدەگیرێت. بۆ نموونە حەجی ماڵی خوا یەکێکە لە واجبە گەورەکانی ئیسلام بۆ کەسێ توانای ماددی و جەستەیی هەبێ، ئەگەر بە ڕشوە جێبەجێ دەکرا، ئەوە ئەو حەجە واجب نابێ لەسەر ئەو کەسە.

ئەی ئەگەر ئامرازێکی تەکنەلۆژیا بووە هۆکاری ئالوودەبوون بە تاوان وەک قومار و قسەی ناشرین و جنێو و پەیوەندیی ناشەرعی و سەیری فیلمی سێکسی و بەفیڕۆدانی کاتێکی زۆر و پشتگوێخستنی ئەرکی ئایینی و دونیایی، ئەی چۆن بۆ ئەو کەسە نابێتە حەرام کە بەم جۆرە بەکاری دەهێنێت!

بۆیە قورئان کاتێ مەی خواردن و قومار حەرام دەکات، عیللەتەکەی بەیان دەکات بەوەی: {إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوة وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ والْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاة فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ } (المائدة: ٩١).

کەواتە: هەر شتێک بووە هۆی دروستبوونی ئەم کارە خراپانە، ئەوە حەرام دەبێ ئەگەر خودی خۆشی ڕێپێدراو بێت.

چوارەم: ئەسڵ لە هەموو شتێک؛ حەڵاڵ و ڕەوابوونە، مادام لەگەڵ دەقێکی شەرعی دژایەتی نەکات. کەواتە بەکارهێنانی ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا ڕەوا و ڕێپێدراوە، تەنها لەو کاتانەدا نەبێ کە دژایەتیی دەقێک یان مەبەستێکی شەرعی دەکات، یان دەبێتە هۆی دروستبوونی قەدەغەکراوێکی شەرعی، ئەوکات حەرام دەبێ. موباحیش سروشتی وایە بەگوێرەی نییەت و جێگا و زەمان و زەمین و کەسەکان دەگۆڕێت، هەروەها موباح لە ڕووی کولییەوە داوا کراوە، بەڵام لە ڕووی جوزئیاتەوە پێنج حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت. بە مانایەکی تر: ناکرێ بەیەکجاری واز لە شتی موباح بهێنی و ناشکرێ ژیانت گشتی بە موباحات پڕ بکەیتەوە و زەروریات و حاجیات پشتگوێ بخەیت.

پێنجەم: میانڕەوی و ئیعتیدال لە هەموو شتێک پێویستە و زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی لە هەموو کارێک؛ شتێکی خراپە.

تەنانەت خودای گەورە زەمی ئەوانە دەکات کە زیادەڕەوییان لە بەندایەتیدا کرد: {ورَهْبَانِيَّة ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ} (الحديد: ٢٧). هەروەها پێغەمبەری مەزن بانگی ئەو گەنجانەی کرد کە ویستیان زیادەڕەوی بکەن لە بەندایەتی و پێی ڕاگەیاندن سوننەت و ڕێبازی من، میانڕەوییە لە هەموو شتێک.

بۆیە زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا و بەفیڕۆدانی کاتێکی زۆر و بەقوربانیکردنی ئەرکە ئایینییەکان وەک نوێژ و سیلەی ڕەحم و ئەرکە دونیاییەکان وەک خوێندن و کار و کەسابەت لە پێناویدا، هەرگیز لە شەریعەتدا جێگای قەبووڵ نییە.

لەبەر ئەوە «ابن المقفع» جوانی وتووە کە دەڵێ: «ما رأيت إسرافا الا وبجانبه حق مضيع.»

واتە: هیچ زیادەڕەوییەکم نەدیوە کە مافێک لە پەنایدا نەفەوتابێت.

مسوڵمان دەبێ بزانێ ئەو لەم ژیانە و لە بەڕێکردنی ئەم تەمەنە کورتە بەرپرسیارە و ڕووبەڕووی «وعن عمره فيم أبلاه» دەبێتەوە.

مرۆڤ دەبێ بزانێ بۆ چ ئەرک و فەرمانێک هاتووەتە ئەم ژیانە و دەبێ چۆن هەڵسوکەوت بکات. دەبێ پێگە و پەیامی خۆی بناسێت و بزانێ کە ئەو بۆ ئەوە دروست بووە ڕاستییە مەزنەکان

بزانێت و بزانێ کە زاتێک ئەم گەردوون و ژیانەی خولقاندووە و مرۆڤی دروست کردووە بۆ ئەوەی لەم هەموو نیعمەتانە بەهرەمەند بێ، بەڵام دواجار دەبێ ئەوەش بزانێ لەسەر بەکارهێنانی گشت نیعمەتەکان پرسیاری لێ دەکرێت.

کەواتە: بۆ کەسی مسوڵمان و ژیر، نەشیاو و نەزانییە شەو و ڕۆژ بخاتە سەر یەک بۆ کوشتنی کاتی خۆی لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا، بەبێ گوێدانە ئەرکەکانی تری.

## لە کۆتاییدا دەڵێم:

بێبەرنامەیی و بێکاری و فەراغی فیکری و ڕۆحی و پەروەردەیی زۆربەی گەنجەکانمان وای کردووە کە ئالوودە ببن بە ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا و بەکارهێنانی بەشە خراپەکەی بەزۆری. ئەوەتا بەپێی داتای کۆمپانیای «سمیلار وێب ئەنەلایز»ی ئیسرائیلی، عێراق لە پلەی یەکەمی جیهاندایە لە کردنەوەی ماڵپەڕە سێکسییەکان و لەپاش عێراق، میسر دێت.

بەپێی داتای نافەرمیی عێراق، ڕۆژانە نزیکەی سێ ملیۆن و سێ سەد و بیست هەزار کەس سەیری ڤیدیۆ سێکسییەکان دەکەن و لەو ڕێژەیەش بە خەملاندن ڕۆژانە لەسەرووی چوار سەد هەزار کەس لە هەرێمی کوردستان سەردانی ماڵپەڕی سێکسی دەکەن. هەروەها ئەو یارییەی کە ئێستا خەڵکێکی زۆری لە منداڵ و گەنج و لاو و گەورە و بچووک و ژن و پیاوی سەرقاڵ کردووە، یاریی «PUBGە» کە لە ڕاپۆرتێکی تەلەڤزیۆنی کە خۆم بینیم، ئافرەت هەبوو دەیوت: ڕۆژانە پێنج تا شەش سەعات ئەو یارییە دەکەم!

هەروەها لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەواڵێکی دەڵتەزێن بڵاو کرایەوە کە هەندێ گەنج ویستوویانە لاسایی ئەو یارییە بکەنەوە و تەسویری بکەن، کاتێ چەکەکە ڕوو لە سنگی یەکێکیان ڕادەگرێت و نازانێت فیشەک لەسەر پێیە، دەیتەقێنێ و بەر سنگی دەکەوێت و دەمودەست دەیکوژێت.

دواجار دەبێ بە هۆشیاری و وریاییەوە دەست بۆ ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا بەرین، سوود لە لایەنە پۆزەتیڤ و باشەکانی وەربگرین و خۆمان لە لایەنە نێگەتیڤ و خراپەکانی بەدوور بگرین.

ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، پێویستی بە هەڵمەتی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی لەلایەن سەرجەم دەزگاکانی کۆمەڵگاوە هەیە، لە «مزگەوت» و «قوتابخانە» و «زانکۆ» و «سەنتەر و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی» هەیە، بەڵکوو پێویستە ئەم ڕۆشنبیرییە شۆڕ ببێتەوە بۆ باخچەی ساوایان، لەوێوە منداڵە ساواکانمان گۆش بکرێن.

## سەرچاوەکان:


١. قواعد الاحكام فى مصالح الانام: عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام، الملقب بسلطان العلماء (ت ٦٦٠هـ)، راجعه وعلق عليه: طه عبد الرؤوف سعد، مكتبه الكليات الأزهرية، القاهرة، ١٩٩١م: ٧/١.

٢. الموافقات: إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي الغرناطي الشهير بالشاطبي (ت ٧٩٠هـ) المحقق: أبو عبيدة مشهور بن حسن ال سلمان، دار ابن عفان، الطبعة الأولى، ١٩٩٧م: ٣٥٣/٢.

٣. موسوعة القواعد الفقهية: محمد صدقي بن أحمد البورنو أبو الحارث الغزي، الطبعة الأولى، ١٩٩٧م: ٣٠٠/٦.

٤. تطور استخدام تكنولوجيا المعلومات في العملية التعليمية: https://ar.wikibooks.org/wiki

٥. أثر التكنولوجيا في التعليم: إسلام غنيمات، ٥ مارس ٢٠١٩، موقع: https://mawdoo٣.com

٦. أثر التكنولوجيا على التعليم سلبا وإيجابا: صهيب شبلي الخزاعلة، ٣٠ مارس ٢٠١٩م، موقع: https://mawdoo٣.com

٧. أثر التكنولوجيا على التعليم: خلود أبو حسين، ٢ مارس ٢٠١٦م، موقع: https://mawdoo٣.com

# بیبلیۆگرافیا

ئامادەکردن: بوار نوورەدین

سالی ١٩٦٢ لە قەڵادزێ لەدایکبووە. لە ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد و ئەرشیڤی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم و  پڕۆژەی ئینسایکلۆپیدیای پارێزگای سلێمانیدا کاری کردوە. دەیان کتێب و لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای بڵاوکردووەتەوە، پێداچوونەوەی بۆ زۆرتر لە ١٠٠ کتێب کردووە.

bwar.biblo@gmail.com



## یەکەم: بیبلیۆگرافیا چییە؟

بیبلیۆگرافیا وشەیەکی گریکییە و لە «Biblion» واتە سەرچاوە و «Grapro» واتە زانیاری پێک هاتووە، واتای هەردووکیشیان: زانیاری لە بارەی سەرچاوەکان، یان ڕێکخستنی زانیاریی سەرچاوەکان. لە زمانی کوردیدا هیچ وشەیەکمان بەرامبەر وشەی بیبلیۆگرافیادا نییە، عەرەبەکانیش هەر ئەم وشەیە بەکار دەهێنن، تەنها لەبریی پیتی «گ»، پیتی «غ» دەنووسن. وشەی بیبلیۆگرافیا و بایۆگرافیا زۆر جیاوازن، دووەمیان ڕێک بەرامبەر «ژیاننامە»یە و زمانی کوردی پێویستی پێی نییە.

بیبلیۆگرافیا سەرچاوەیەکی گشتییە، ئەگەر ئامادەکارەکەی بە شێوەیەکی کردەیی و دیوانەئاسا کارەکەی بکات، ئەرکی ئاسان نابێت، لەبریی بەکاربەران، سەرچاوە بە سەرچاوە، کتێب بە کتێب و کتێبخانە بە کتێبخانە دەگەڕێت، لاپەڕە بە لاپەڕە هەڵیدەداتەوە، سەرچاوەکان بەڕیزکراوی ڕێک دەخات، بەم کارەشی هاوکاریی خوێنەر، نووسەران و توێژەران دەکات، بەکاربەرانیش کەڵکێکی زۆری لێ وەردەگرن و ماندووبوون، کات و خەرجییشیان بۆ دەگەڕێتەوە.

ئامادەکاری بیبلیۆگرافیا، پێویستە ئاشکرای بکات کە بیبلیۆگرافیا بۆ چ سەرچاوەیەک ئامادە دەکات: دەستنووس، کتێب، گۆڤار یان ڕۆژنامە. لە کتێبدا، پێویستە جۆری کتێبەکان دیاری بکرێت: کوردی، یان عەرەبی و فارسی، دواتر ئایا هەموو کتێبێک، یان تەنها ئەو کتێبانەی باسی مێژوو، ئەدەب، چیرۆک و دیوانی شاعیران دەکەن. مەرجێکی تری بیبلیۆگرافیا، دیاریکردنی ساڵی چاپکردن و بڵاوبوونەوەی کتێبەکانە، پێویستە ئامادەکار، چەند ساڵێک بۆ سنووری کارەکەی دەستنیشان بکات. بیبلیۆگرافیا، جگە لە جۆری گشتی، گونجاوتر و باشترە، بایەخ بە بابەتی تایبەتیش بدرێت، وەک: بەشەکانی ئەدەب، حیزب و کۆمەڵەی سیاسی، ڕێکخراو و ناوەندی ڕۆشنبیری، ڕووداوی مێژوویی، کەسایەتی، شار، ناوچە و بەم شێوەیە.

ئامادەکاری بیبلیۆگرافیا، دوای دیاریکردنی ئەو سنوورانە، پێویستە ئەو داتایانەی ڕیزیان دەکات، گومانی زۆریان لەسەر نەبێت و مافی تەواویان پێ بدات، بە لانی کەمەوە لە ٩٠٪ی ئامانجەکەی بەدەستەوە بدات. شێوازی ئامادەکردنەکەیشی زۆر گرنگە، پێویستە بە جۆرێک ئامادە بکرێت کە بەکاربەری بیبلیۆگرافیاکە، بە کەمترین کات و ئاسانترین شێوە؛ سەرچاوەکان بدۆزێتەوە.

بیبلیۆگرافیا دوو جۆری سەرەکیی هەیە، بەپێی ناوی نووسەر و وەرگێڕ، یان بەپێی ناونیشانی کتێب و ساڵی چاپکردنیان ئامادە دەکرێت. لە جۆری یەکەمدا، ناوی نووسەرەکان بەپێی ڕیزبەندیی پیتەکان ڕێک دەخرێن و لەژێر هەر ناوێکیشدا؛ ناونیشانی بەرهەمەکان بەپێی ڕیزبەندیی پیتەکان دادەنرێن، وەک ئەوەی «د. حوسامەدین نەقشبەندی» ئامادەی کردووە.

لە پرۆژەی «کورد و کوردستان - بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا (١٩٢٠-٢٠١٠)»دا، هەردوو جۆرەکەم تێکەڵ کردووە، تا ڕادەیەک کەڵکم لە شێوازەکەی ڕەوانشاد مستەفا نەریمان وەرگرتووە، بەڵام بە شێوەیەکی فراوانتر. تەوەرەی یەکەم کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا بەپێی پیتەکانی زمانی کوردی ڕیز کراون، تەوەرەی دووەمیش ناوی نووسەران و دواتریش ناوی وەرگێڕەکان، بەپێی پیتەکانی زمانی کوردی ڕیز کراون و لەژێر ناوی هەر یەکێکیاندا، ناونیشانی کتێب و ژمارەی کتێبەکە لە بیبلیۆگرافیای تەوەرەی یەکەمدا نووسراوە. واتە هەر بەرگێک، بیبلیۆگرافیای ناونیشانی کتێبەکان و دواتریش بیبلیۆگرافیای نووسەران و وەرگێڕەکانە.

بیبلیۆگرافیای گشتی، بابەتێکی گشتی و فراوان دەکاتە سنوور و تەوەرە، نموونەش؛ «ببلیۆگرافیای دووصەد ساڵی کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٨٦)»ی ڕەوانشاد مستەفا نەریمانە کە زۆر گشتییە،

بیبلیۆگرافیاش هەیە یەک دوو تەوەرە هەڵدەبژێرێت و کاری لەسەر دەکات، لە ناونیشاندا تایبەتییە و لە کرۆکدا تا ڕادەیەک گشتییە، نموونەش بیبلیۆگرافیاکەی «د. حوسامەدین نەقشبەندی»یە، هەروەها پرۆژەی «کورد و کوردستان – بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە کتێبی کوردیدا (١٩٢٠-٢٠١٠)».

بە هۆی ئەوەی کێشەیەکی کتێبی کوردی «ناونیشان»ە، کە بەپێی زانستی کتێب، پێویستە کورتترین پێناسەی کتێبەکە بێت، ئەمەش لە کتێبی کوردیدا بەداخەوە زۆر کەم پێڕەو کراوە، واتە زۆربەی کتێبەکان لە ڕێگەی ناونیشانەوە؛ کرۆکی بابەتەکانیان ناناسرێنەوە، لە پێناوی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا، پێرستی هەموو ئەو کتێبانەمان نووسیوەتەوە کە بیبلیۆگرافیامان بۆ ئامادە کردوون. بە هۆی نەبوونی کتێبخانەی نیشتمانی و کێشەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردییەوە، کۆدی زۆربەی کتێبەکانی نێو پرۆژەی «کورد و کوردستان»یش لە پەراوێزدا نووسراون، تا بەکاربەر لە شوێنی کتێبەکە ئاگادار بکەینەوە.

*****

بیبلیۆگرافیای گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان، چەند مەرجێکیان هەیە: چ گۆڤارێک، هەموو ژمارەکان، یان ژمارەی چەند ساڵێک، هەموو بابەتەکان، یان تەنها بابەتی مێژوویی و ئەدەبی، هەموو نووسەرەکان، یان تەنها فلان نووسەر و بەم شێوەیە.

بیبلیۆگرافیای گۆڤار و ڕۆژنامە، بەزۆری بە دوو جۆر ئامادە دەکرێت: بیبلیۆگرافیای نووسەران، کە بەپێی پیتەکانی زمانی کوردی «لە ئەلفەوە تا یێ» ڕێک دەخرێن و بە فۆنتێکی جیاواز و تەنها یەک جار دەنووسرێن، لەژێر ناوەکانیشدا؛ بابەتەکان بەپێی بڵاوبوونەوەیان بەم شێوەیە ڕیز دەکرێن: ناونیشانی بابەت، ژمارە، مانگ و ساڵی بڵاوکراوەکە، ژمارەی لاپەڕە.

دووەمیان بیبلیۆگرافیای بابەتەکانە، کە بەپێی کرۆکی بابەتەکان بەسەر چەند تەوەرەیەکدا دابەش دەکرێن و بەپێی پیتەکانی زمانی کوردی «لە ئەلفەوە تا یێ« و بابەتی هەر تەوەرەیەکیش، بەپێی پیتەکانی زمانی کوردی ڕیز دەکرێن: ناونیشانی بابەت، ناوی نووسەر، ژمارە، مانگ و ساڵی بڵاوکراوەکە، ژمارەی لاپەڕە.

بیبلیۆگرافیا و پۆلێنکردنی کتێب، ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی؛ هەڵە و کەموکوڕیی تێ دەکەوێت. نائەکادیمیبوونی سەرچاوەکانیش، کاریگەرییان لەسەر بیبلیۆگرافیا و پێرستکاری هەیە، گرانتر و ئاڵۆزتریشی دەکەن. لە پرۆژەی «کورد و کوردستان – بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە کتێبی کوردیدا (١٩٢٠-٢٠١٠)»دا، چەندین گرفت و کێشەی کتێب، کتێبخانە و بیبلیۆگرافیای کوردی باس کراون، کە لێرەدا کاتی باسکردنی نییە.

## دووەم: مێژووی زانستی بیبلیۆگرافیا لە کتێبخانەی کوردیدا

ڕەوانشاد مستەفا نەریمان، یەکەم بیبلیۆگرافیای پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردووە و ئەم کتێبەی داناوە: کتێبخانەی کوردی، بە یارمەتیی وەزارەتی زانیاری چاپ کراوە، چاپی یەکەم، چ: شارەوانی، کەرکووک، ١٩٦٠، ٧٥ لاپەڕەی پێوانە ١٦×٢٣ سانتیمەترە.

لە دووەم هەوڵیشدا و بۆ یەکەم جار وشەی بیبلیۆگرافیای لەم کتێبەدا بەکار هێناوە: ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٧٥)، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپی یەکەم، چ: کۆڕ، بەغدا، ١٩٧٧، کە ٢٨٦ی لاپەڕەی پێوانە ١٧×٢٤سم. هەر مستەفا نەریمان، ئەم کتێبەشی داناوە: فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد، بە یارمەتیی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپ کراوە، چاپی یەکەم، چ: ئەسعەد، بەغدا، ١٩٨٦،



به پێویستی دەزانم «ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیا» بخرێتە پرۆگرامی زانکۆکانی کوردستانەوە، بۆ ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیای هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامە کەڵك لە خوێندکاران وەربگیرێت.

ئەمیش ١٥٤ لاپەڕەی پێوانە ١٦×٢٤سم بووە.

دوا هەوڵیشی ئەم کتێبە بووە: بیبلیۆگرافیای دووصەد ساڵی کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٨٦)، بڵاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپی یەکەم، چ: الزمان، بەغدا، ١٩٨٩، کە ٤٠٨ لاپەڕەی پێوانە ١٧×٢٣سم و چاپی دووەمی کتێبی دووەمیەتی و فراوانتری کردووە.

جگە لەو بیبلیۆگرافیایانەی پێشتر ناومان هێنان، کۆمەڵێک بیبلیۆگرافیای زانستییش ئامادە کراون، وەک: ئەو بیبلیۆگرافیایەی د. کەمال مەزهەر لە پاشکۆی کتێبی «مێژوو - کورتەباسێکی مێژوو و کورد و مێژوو، بە یاریدەی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە، چاپی یەکەم، چ: دار ئافاق عەرەبییە، بەغدا، ١٩٨٣»دا ئامادەی کردووە.

هەروەها ئەو دوو بیبلیۆگرافیایەی د. نەجاتی عەبدوڵڵا ئامادەی کردوون: بیبلیۆگرافیای کوردناسی - کورد و کوردستان لە سەرچاوە فەڕەنسییەکاندا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپی یەکەم، چ: حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩. وە: بیبلیۆگرافیای کوردناسی - کورد و کوردستان لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپی یەکەم، چ: حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩.

چەند کەسێکی تریش بیبلیۆگرافیایان ئامادە کردووە، وەک: جووتیار حاجی تۆفیق، جەبار سابیر، ڕێکار مزووری، شوان سلێمان یابە، د. عومەر ئیبراهیم عەزیز، مۆفەق میراودەلی، نەوزاد عەلی ئەحمەد، ن. أ. ئالێکسانیان و یاسین قادر بەرزنجی.

لە کتێبخانەی کوردیدا، بیبلیۆگرافیای تایبەتی زۆر کەمە و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بەتایبەتی لە سەدەی بیستدا، کە دیارترینیان ئەمانەن:

١. عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی (١٩٢٥-١٩٦٩)، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپی یەکەم، چ: کۆڕ، بەغدا، ١٩٧٨.

٢. حسێن عارف، بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی (١٩٢٥-١٩٨٣)، بڵاوکراوەی گۆڤاری کاروان، چاپی یەکەم، چ: ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨.

٣. د. عەبدوڵڵا غەفوور، بیبلیۆگرافیای کوردستان (١٩٠٣-١٩٩٥)، چاپی یەکەم، چ: ئاپیک، سوید، ١٩٩٥.

٤. ئەکرەم قەرەداغی، بیبلیۆگرافی کورد و کوردستان، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، چ: فەرهەنگ، سلێمانی، ١٩٩٩.

٥. ئێمەش چەند بیبلیۆگرافیایەکی تایبەتیمان ئامادە کردووە، کە بە هۆی درێژیی بابەتەکەوە ناتوانین ڕیزیان بکەین.

## سێیەم: ڕۆڵی بیبلیۆگرافیا لە پێشخستنی لێکۆڵینەوەدا

بیبلیۆگرافیا دۆزەرەوەی سەرچاوەکانە، ئەو کتێبە نییە یەکێک ئیشی پێی بێت و یەکێکی تر حەزی لە خوێندنەوەی نەبێت، درەنگ و زوو، هەموو چین و توێژەکان ئیشیان پێی دەبێت. پێمان وایە دۆزینەوەی سەرچاوە؛ کاری لێکۆڵەر نییە، کە



بەشێکی بەکاربەرانی بیبلیۆگرافیا، بەئاشکرایی بیبلیۆگرافیاکان بەکار دەهێنن و وەك سەرچاوە ئاماژەیان پێ نادەن، یان بەتایبەتی بۆیان ئامادە دەکرێت، کەچی ئاماژەی پێ نەکردووە.

بەداخەوە ئەم گرفتە لەمێژە ئێخەی لێکۆڵەری کوردی گرتووە، بێگومان بە خوێندکارانی ناوەندەکانی ئەکادیمیی کوردستانیشەوە، هەروەها فێری بەکارهێنانی نەبوون و ناکرێن. کاتێک خوێندکار یان هەر نووسەرێک بڕیاری لێکۆڵینەوەیەک دەدات، پێویستە ڕوو لە کتێبخانەکان بکات، تا بتوانێت بە هۆی چەند ڕێکارێکەوە سەرچاوەکان بدۆزێتەوە:

١. سیستمی پۆلێنکردنی کتێبەکان لەناو کتێبخانەکاندا

٢. بیبلیۆگرافیا

باشترین و نوێترین ڕێکاریش، سیستمێکی پێشکەوتووی وەک: ماڵپەڕ و داتابەیسە، کە ناوی بابەتەکە دەنووسرێت و لە هەموو سەرچاوەکان ئاگاداری دەکاتەوە.

هەروەک لە پێشەکیی پرۆژەی کورد و کوردستاندا ئاماژەم پێ کردووە، پێویستە داتا و زانیاریی ناو کتێبخانە و بیبلیۆگرافیاکان بخرێنە ناو داتابەیسێکی پرۆفیشناڵەوە، بۆ ئەوەی کارئاسانیی زۆرتری بەکاربەران بکەن، ئەمەش پێویستی بە پشتگیریی ناوەندێکی تایبەتییە، کە ئایا وەزارەتی خوێندنی باڵا، یان وەزارەتی ڕۆشنبیری دەبێت. لەم پێناوەدا چەند هەوڵێکم داوە، کە بەداخەوە تا ئێستا ئەنجامی نەبووە، دوا هەوڵیشم کۆتایی ساڵی ٢٠١٩ لەگەڵ ناوەندی «کەشکۆڵ»ی زانکۆی ئەمەریکیدا بووە.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگە، چونکە با کتێبخانەی کوردی دەیان بیبلیۆگرافیاشی تێدا بێت، ئەگەر خوێنەران و خوێندکاران پێی نەزانن و ئاگاداری نەبن، یان نەزانن چۆن و بۆچی بەکاری بهێنن، چ بایەخێکی دەبێت؟ بۆ نموونە؛ تا ئێستا زۆرتر لە دە هەزار لاپەڕە بیبلیۆگرافیام ئامادە کردووە، بۆچی دەبێ خوێندکار ڕوو لە من بکات و داوای سەرچاوەم لێ بکات؟ کە ئەمەش چەندین جار دووبارە بووەتەوە و دەبێتەوە... با بە شێوەیەکی ڕوونتر قسە بکەین، مامۆستاکانی زانکۆ کاتێک خوێندکار بۆ توێژینەوە ڕادەسپێرن، پێویستە ڕێنماییان بکەن و ڕێنیشاندەریان بن، بەڵام ئایا هەموو مامۆستاکانیش ئاگاداریی بیبلیۆگرافیاکانن؟ ئەمەش پرسیارێکی زۆر جددی و پەیوەستە بە تەوەرەی سەرەکیی ئەم نووسینەوە.

بە پێویستی دەزانین مامۆستایان ئاوڕ لە کتێبخانەکان بدەنەوە، تا زانیاریی تەواویان لە بارەی بیبلیۆگرافیاکانەوە هەبێت، بۆ ئەوەی کاتێک خوێندکاران بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ڕادەسپێردرێن، پەنجە بخەنە سەر سەرچاوەکان و هاوکاریی خوێندکارانی پێ بکەن، هەروەها خوێندکارانیش پێویستە پێش ئەوەی دەست بە کارەکەیان بکەن، سەرەتا بچن زانیاری لە بارەی بیبلیۆگرافیاکانەوە پەیدا بکەن و بزانن ئایا بیبلیۆگرافیا بۆ کرۆکی لێکۆڵینەوەکەیان ئامادە کراوە، یان چ بیبلیۆگرافیایەک زانیارییان لە بارەی کرۆکی لێکۆڵینەوەکەیان پێ دەدات، یان چ

کتێبخانەیەک داتابەیسی بۆ کتێبەکانی داناوە.

لەگەڵ نووسینی ئەم بابەتەدا، بیرۆکەی ئەوەم بۆ دروست بووە کە بە زووترین کات هەوڵی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیای بیبلیۆگرافیاکان بدەم، واتە لە کتێبێکدا هەموو ئەو سەرچاوە و بیبلیۆگرافیایانە کۆ بکەینەوە و بیخەینە ڕوو کە پەیوەندییان بە کورد و کوردستان و ڕەوشی نووسین، لێکۆڵینەوە و ڕۆشنبیریی کوردەوە هەیە.

ئەگەر هەڵە نەبم مەرجێکی توێژینەوەش؛ خوێندنەوە و شیکردنەوە و تەنانەت ڕەخنەگرتنە لە لێکۆڵینەوەکانی پێشووتر، کە بیبلیۆگرافیا دەتوانێ کارئاسانی بۆ ئەم پرسیارە بکات.

بەکاربەری بیبلیۆگرافیا؛ بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە ئەستۆ ئەگەر وەک سەرچاوە ئاماژە بە بیبلیۆگرافیاکان بکات، ئەوکات ئەگەر سەرچاوەش ببوێرێت، بەشێکی نەنگییەکەی دەکەوێتە سەرشانی ئامادەکاری بیبلیۆگرافیاکە.

بەشێکی بەکاربەرانی بیبلیۆگرافیا، بەئاشکرایی بیبلیۆگرافیاکان بەکار دەهێنن و وەک سەرچاوە ئاماژەیان پێ نادەن، یان بەتایبەتی بۆیان ئامادە دەکرێت، کەچی ئاماژەی پێ نەکردووە، ئەمەش دوو هۆکاری هەیە؛ یان بەئەنقەست نایبنووسن، تا خوێنەر وا تێبگەیەنن کە خۆیان ئاگاداری سەرچاوەی زانیارییەکانن، یان بە پێویستی نازانن، بە مەرجێک ئەو لێکۆڵینەوانە پەسندترن کە بیبلیۆگرافیا لە ڕیزی سەرچاوەکانیاندا هەبێت.

کتێبخانە و ڕۆشنبیریی کوردی پێویستی زۆری بە بیبلیۆگرافیا هەیە، کە زۆر کەم ئامادە کراوە و دەکرێت، ئەمەش چەند هۆکارێکی هەیە، بەتایبەتی سەختیی ئامادەکردن و کێشەی چاپکردن، کە لە لێرەدا کاتی باسکردنی نییە.

## چوارەم: هەوڵەکانمان لە بواری بیبلیۆگرافیادا؟

بە پێویستی نازانم باسی هیچ کێشە و گرفتێک بکەم، کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیادا تووشی بووم...

یەکەم هەوڵم؛ ئامادەکردنی «بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆری کوردی (١٨٦٠- ٢٠٠٤)» بوو، کە د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ پێشەکیی بۆ نووسیوە و پێیدا چووەتەوە و ساڵی ٢٠٠٤ چاپ کراوە. کرۆکی پێشەکییەکەی د. عیزەدین بووە هۆی ئەوەی بایەخی زۆرتر بە بیبلیۆگرافیا بدەم، ئیتر لەوەبەدوا هەوڵی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیام داوە. لە ماوەی چەند ساڵێکدا پڕۆژەی «کورد و کوردستان - بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا (١٩٢٠-٢٠١٠)»م تەواو کرد، کە ٥٢٠٦ لاپەڕەیە و ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و بەسەر هەشت بابەتی سەرەکیدا دابەش کراوە: مێژووی کۆن، مێژووی هاوچەرخ، ئەدەب، کۆمەڵ، ڕاگەیاندن، ئایینەکان، هونەر و زمان، مێژووی هاوچەرخ چوار بەش و ئەدەبیش دوو بەشە.

پڕۆژەی «کورد و کوردستان - بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا»، هەموو ئەو کتێبانەی کۆ کردووەتەوە کە لە ماوەی نەوەد ساڵدا (١٩٢٠-٢٠١٠) لە بارەی ئەو زانست و زانیارییانەوە نووسراون کە پەیوەندییان بە کورد و کوردستانەوە هەیە، واتە هەموو ئەو چەمک و زانستانەی پەیوەندییان بە مێژوو، زمان، ئەدەب، ڕۆشنبیری، هونەر، ڕاگەیاندنی کوردییەوە هەیە، کە بەشێکن لە کورد، هەروەها شار، گوند، شوێن، هەموو هۆز و پێکهاتەیەک، کە پەیوەندییان بە کوردستانەوە هەیە. پڕۆژەی ناوبراو، بەرهەم و ڕەنج و ماندووبوونی ٩٠ ساڵی زۆربەی نووسەران و وەرگێڕەکانی کوردی تێدا کۆ کراوەتەوە، فراوانترین سەرچاوەیە لە بارەی کورد و کوردستانەوە.

لە هەوڵدام بیبلیۆگرافیای کتێبی ساڵانی ٢٠١١

تا ۲۰۲۰یش ئامادە بکەم و پڕۆژەی «کورد و کوردستان» تا ۱۰۰ ساڵ بهێنم، هێشتا بڕیاری تەواوم نەداوە و بە هۆی دوو پڕۆژەوە دوام خستووە، کە یەکێکیان پێنج ساڵ ئیشم تێدا کردووە. هیوادارم بتوانم لەم هەوڵەشدا سەرکەوتوو بم، ئیتر ئەنجامی چاپکردن و بڵاوکردنەوەکەی هەر چییەک بێت.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم «ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیا» بخرێتە پڕۆگرامی زانکۆکانی کوردستانەوە، بۆ ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیای هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامە کەڵک لە خوێندکاران وەربگیرێت، لە یەکێک لە قۆناغەکانی خوێندندا؛ هەر چەند خوێندکارێک، بیبلیۆگرافیا بۆ چەند ژمارەیەکی گۆڤار یان ڕۆژنامەیەک ئامادە بکەن، بەتایبەتییش ئەوانەی پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ڕەوشی زانستی و ئەکادیمیی زانکۆکەوە هەیە.

**سەرچاوە:**


١. مستەفا نەریمان، ببلیۆگرافیای دووصەد ساڵی کتێبی کوردی (۱۷۸۷-۱۹۸٦)، بڵاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپی یەکەم، چ: الزمان، بەغدا، ۱۹۸۹.

٢. د. حسام الدین علی غالب النقشبندی، ما ألف عن تأریخ الکرد وکردستان باللغة العربیة والمعربة حتی عام ۲۰۰۷م - بیبلوغرافیا متخصصة ومعرفة، من منشورات بنکەی ژین، مط: شڤان، السلیمانیة، ۲۰۱۱.

٣. بوار نوورەدین، بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆری کوردی (۱۸٦۰-۲۰۰٤)، د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ (پێداچوونەوە و پێشەکی)، بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چ: شڤان، سلێمانی، ۲۰۰٤.

٤. بوار نوورەدین، کورد و کوردستان - بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا (۱۹۲۰-۲۰۱۰)، ۱۲ بەرگ و ٥۰۲٦ لاپەڕە، تاران، ۲۰۱٦.

# بیرەوەرییەکانی مەولود باوەمراد

## (٤١) ساڵ لەناو ڕابوونی ئیسلامی و (٢٥) ساڵ لە سەرکردایەتیی یەکگرتوودا



بەشی دووەم

بەپێویستی دەبینم لەسەرەتای ئەم بەشی دووهەمەوە کورتە سەرنجێک بخەمە سەر نووسینەوە و بڵاوکردنەوەی ئەم بیرەوەریانە، کە بە سوپاسەوە گۆڤاری خاڵ و خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەرەکەی برای بەرێزم کاک توفیق کەریم، پێشنیاری بڵاوکرنەوەی بیرەوەریەکانی لە گۆڤارەکەدا بۆکردم، لەگەڵ رێزم بۆ هەموو خێزانی گۆڤارەکە، پاش بڵاوبوونەوەی ئەڵقەی یەکەمی یادەوەریەکان، لەلایەک چەند بەرێزێکەوە هەندێ سەرنج و تێبینیم پێگەشت کە پێویستی بەم لەسەر وەستانە هەبوو.

ئەزموون بەهەموو دیوە گەش و تەڵخەکانیەوە، بەهەڵکشان و نوشست و داخزانەکانیەوە، لەسەر ئاستی تاک یان کۆمەڵە و گردبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی/ سیاسی بۆخۆی و لەخۆیدا دەسکەوتە، بیر و ئەندێشەکان لە بۆشایدا سەوز نابن، دواجار لە کار و جوڵە و رەفتار و گوتاری تاکە هەڵگرەکانی و ئەو فۆرم و مۆدێلەی تیایدا بەرجەستە دەبێت خۆی نمایش دەکات و وەک کارەکتەرێک ئامادەیی بوون لە ناو دنیای کۆمەڵگە پەیدا دەکات.

لێرەوە دەمەوێت بڵێم: ئەوەندەی پەیوەندی بەنووسینەوەی ئەم بیرەوەریانەوە هەیە کەپەیوەستن بە کار و جوڵەی بەندە لەماوەی ٤٠ ساڵی رابردووی ناو تەوژمی ئیسلامیی کوردستاندا، کە سەرەتاکەی بەگردبوونەوەوە لەدەوری کەسایەتییە ئیخوانیەکاندا دەستپێکردوە و ٢٥ ساڵی لە سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامیی دا گوزەراوە.

مەبەست نووسینەوەی مێژوو نییە چونکە ئاشکرایە، مێژوو زانستە, پێوەر و رێسای خۆی هەیە، فەلسەفەی ژیانی مرۆڤە لەناو زەمەندا، گوزارشتە لە بیری ئینسانەکانی هەرکۆمەڵگەیەک دەربارەی ئاوەدانی و شارستانیەت، بیرەوەری دەکرێ سوودی بۆ مێژوونووس هەبێت ئەگینا خۆی نابێتە مێژوو.

مەبەست دروستکردنی وێنەیەکی رتووشکراو و فەنتازیەک لەرابردووی خود نییە، چونکە ناکرێ دەرکی ئەوە نەکەین کە یادەوەری ئێمەمانان لە دەرفەتی کار و هەڵسورانێکی مەودا دیاریکراودا، بە بەراورد بە یادەوەری هەموو ئەوانەی لەم نیشتمانەی ئێمەدا خەباتی سیاسی و حزبی و فیکری و رێکخستن و خەباتی چەکداری و پەیوەندی دیبلۆماسی ئەقلیمی و رێکەوتنی ئاشکرا و نهێنی و دووبەرەکی و شەری براکوژی و بەرەی ناوخۆیی و عێراقی و کۆنگرە و هاوپەیمانی وڵاتان و رۆژانی سەختی شەری بەرگریی لەگەل و نیشتمان و دنیایەک هەڵدێر و خۆگرتن و راستبوونەوە دۆراندن و ئاوارەیی حوکمدان و زیندانی و...هتد، دەستمایەیەکی ئەوتۆی هەبێت کە وێنەیەکی مەزنی بەرچاو لەخاوەنەکەی بگرێت.

مەزەندەی ئەوە دەکەم تەنها سودێکی گرنگ و بەرچاوی ئەم بیرەوەیانە- هی بەندە و کەسانیتری ناو رەوتەکە- ئەوەبێت، کە گەنجە بە توانا و زیرەک و خاوەن سەلیقەکانی شیکاریی و تێرامان، لەرێگەی یادەوەریەکانی کارەکتەرێکی ناو ئەم رەوتەوە، لە وردەکاری سەرەتا و رێرەوی ئەم رەوتە ئاگاداربن و بۆشایی و ئەڵقە وونەکانی بدۆزنەوە، پرسیاری دەبوو چی بکرایە؟ چی نەکرایە؟ بۆچی واکرا؟ خەلەلەکان لەکوێ و لەچیدان؟ وەڵامێک بێت بۆ ئەو پرسیارە چارەنووسازەی کە بۆچی پاش ئەم ماوە زەمەنییە دوور و درێژەی تەمەنی تەوژمی ئیسلامیی کوردستان هێشتا لە پەراوێزی ژیانی گشتی کۆمەڵگەدایە و لە جێگەی خۆیدا پاش و پێش دەکات!

لەگێرانەوەی ئەسڵی روداوەکاندا ئەوەندەی لەمنەوە دیاربووە و زانیومە دین و ئەخلاقی راستگۆیی رێنمامە، لە شیکار و تەفسیری هۆکار و ئەنجامەکانیشدا، ئەوە رای شەخسی منە و لەسەر هیچ کەس و حزبێک ماڵ نییە و هەرکەسیش ئازادە قسە و رای جیاواز و ناکۆی خۆی هەبێت لەسەریان.

## خاڵی جیاوازیی و ئیرادەی بەردەوامی

مامۆستا صدیق وەک مامۆستا»صبحی داودی» لەکتێبی (فی دروب الدعوة) لاپەرە(١٤٣)دا باس لە مامۆستا صدیق دەکات و دەڵێت: لەلایەن (فلەیح سامەڕای)ەوە لەسەر داوای (نوعمان عەبدولڕەزاق سامەڕائی) کە سەرۆکی حزبی ئیسلامیی بوو، ڕاسپێرام سەردانی ناوچەی هەڵەبجە بکەم، لە ئابی /١٩٦٠دا لەگەڵ مامۆستا «عابدین رشید» بەرەو هەڵەبجە بەڕێکەوتین، پاش بینین و گفتوگۆ لەگەڵ مەرحومی مامۆستا مەلا صاڵحی گەورە و مامۆستا مەلا عوسماندا، لە یەکێک لە ژورەکانی مزگەوت لەگەڵ دووگەنج جیابووینەوە، کە ئەوانیش مامۆستا مەلا صدیق عەبدولەعزیز و مامۆستا مەلا جەلال مەلا ساڵح بوون، لەدانیشتنێکی ئارام و ئامانجداردا، ئەم چوارە مامۆستا عابدین و من و مامۆستا مەل اصدیق و مامۆستا مەلا جەلال کۆبووینەوە، دەستمانکردن بە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی بانگەوازی ئیخوان موسلیمین و ئامانجەکانی، ئەوانیش بە جەستە و دڵ و عەقڵیان گوێیان بۆ قسەکانمان دەگرت، ئەم کۆبوونەوەیە چوارسەعاتی خایاند و بە بەیعەت لەسەر کارکردن بۆ بڵاوکردنەوەی دەعوە و گوێڕایەڵی لەخۆشی و ناخۆشی، و....هتد کۆتاییهات.

هەروەها مامۆستا صبحی دەڵێت: پێداگرم و دووپاتی دەکەمەوە بەهەموو ڕاستگۆیی و ئەمانەتێکەوە، وە شاهێدی لەبەردەم خودادا دەدەم، کە یەکەم ئوسرەی ئیخوانی لە هەڵەبجە لە سەرەتای ئابی ١٩٦٠دا دروستبووە، لەم ئوسرەوە کاری ڕێکخستنی ئیخوانی گوازراوەتەوە بۆ سلێمانی و ناوچەکانیتری پارێزگاکە.... وە کاری تەنزیمی ئیخوانیمان بەم ئوسرەیە دەستپێکرد.

دکتۆرە ئیمان عەبدولحەمید دەباغ لە کتێبی» الاخوان المسلمون فی العراق» لەژێر ناونیشانی (الاخوان المسلمون في الالوية والاقضية الكوردية) تیشکی زیاتر دەخاتە سەر مێژووی ئیخوان موسلمین لە کوردستان بە گشتی و لە هەڵەبجە بەتایبەتی، بڕوانە لاپەرە : ٢٦٣.

سەرکردەکانی ئیخوان موسلیمینی عێراق کۆکن لە سەرئەوەی بەفەرمانی ڕابەری گشتی ئیخوان موسلیمینی ئەوکاتی عێراق ڕەحمەتی «دکتۆر عبدالكريم زەیدان» کاری ڕێکخستن و پەیوەندی ڕێکخستن بەوشێوەیەی لە کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمیندا پەیرەودەکرێت، بە پێڕاگەیاندن لە ساڵی ١٩٧١ وە ڕاگیراوە، واتە بێدەرکردنی بەیاننامە و بڵاوکراوەی جەماعەت.

لەو دواییانەدا مەکتەبی ئیرشادی ئیخوان موسلیمین، لەسەر داوای ئەو ئیخوانە عێراقیانەی دەرەوە کە هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقیان بوژاندبووەوە، دکتۆر فەیسەڵ مەولەوی ڕادەسپێرێ، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان، بە مەبەستی دەستلەکارکێشانەوەی وەک موراقبی گشتی ئیخوانی عێراق و ڕێگەدان بە کەسانیتری ئیخوانی عێراق بۆ دەستپێکردنەوەی ڕێکخستن، بەڵام دکتۆر عەبدولکەریم ئەو پێشنیارە قبوڵ ناکات و پاساوی شەرعیش بۆ ڕاگرتنی ڕێکخستن دەهێنێتەوە، مەلەفێکم لەوبارەوە لاپارێزراوە.

مەبەستم لەم سەرەتایە بۆ چوونە ناو باسەکە ئەوەیە ئاماژە بەو خاڵی جیاوازییە بکەم کە کاری مامۆستا صدیق و کەسانیتری سەربەهەمان کۆمەڵە و مەدرەسەی ئیخوان کە لە شارەکە و ناوچەکەدا هەبوون لێک جیادەکردەوە.

مامۆستا صدیق و هەمیشە و شێلگیرانە دەیووت: دەبێت کاری ڕێکخستن دەستپێبکرێتەوە و کار بەڕێکخستن بکرێت، بڕیاری ئەم ڕاگرتنی ڕێکخستنە تائێستە ئەگەر بۆ جێگەکانیتری عێراق پاساوی مانەوەی مابێت بۆ کوردستان پاساوی نییە، ئێستە بەدەیان حزب و ڕێکخستنی سیاسی نەتەوەیی و چەپ و ڕاست لە کوردستان خەریکی کارکردنن؟؟ خەڵک قوربانی بۆ ئەم ئەفکارانە دەدات، ئێمە لەپێشترین بۆ قوربانیدان بۆ ئەفکارێک خزمەت بەدین و دنیای خەڵکی ئەم میللەتە بکات، و....هتد.

ئەو هۆکارە بابەتیانەی کاریگەرییان لەسەر ئەم تێگەشتن و ڕوانینەی مامۆستا صدیق هەبوو دەبارەی کاری ئیسلامیی لەکوردستان، کە بەڕای ئەو دەبوو لەخاڵی دەستپێکردنەوەی کارکردن بەڕێکخستنی ئیخوان موسلیمین دەستپێبکات:

١. سەرهەڵدان و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران ساڵی ١٩٧٩ بەڕێبەرایەتی ئایەتوڵڵا خومەینی، یەکێک لەڕووداوە هەژێنەر و تەکاندەرەکانی گۆڕانکاری مێژووی سەردەمەکە بوو لەسەر ئاستی هەموو ناوچەکە و بگرە جیهانیش، تا سەردەمانێک هاندەر و بزوێنەر و سەرچاوەی ئیلهامی زۆرێک لە کۆمەڵە و گردبوونەوە ئیسلامییەکانی ناو تەوژمی ئیسلامیی بوو.

٢. سەرهەڵدانی جیهادی گەلی ئەفغانی بەرامبەر دەستێوەردانی سوپایی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران لەو وڵاتە، حەماسەت و دڵگەرمییەکی بێوێنەی بۆ جیهاد لەناو گەنجانی تەوژمی ئیسلامیی لەسەر ئاستی جیهان دروستکردبوو، نەوەی نوێی ئیسلامییەکانی کوردستانیش لەو کاریگەریە بەدەرنەبوون، هۆنراوە و سرود و ئەلبوومی وێنەی موجاهیدان لە سەرنگەرەکانی جیهاددا توێشویەکی گرنگی عەزیمەت و پابەندی بوو.

٣. سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی چەکداری کورد و گەرموگوڕی ڕێکخستنەکانیان لە ناوشارەکاندا و لەگەڵ هەبوونی دڵەڕاوکە و مەترسی لە کاردانەوە قورس و توندەکانی ڕژێمی بەعس بەڵام ورەیەکی بەرچاوی بە بەر جەماوەری کوردستاندا کردبووەوە، لە هەمانکاتیشدا بە دروشم و گوتارەکانیان کە دژ بە ئایینی ئیسلام و دینداری بوون، جۆرێک لە تەحەدا و کاردانەوەی بۆ کەسایەتی و لایەنگرانی تەوژمی ئیسلامیی دروستکردبوو.

٤. دروستبوونی چەندین ڕێکخراو و کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردی جیهادی کە لە پەنای جمهوری ئیسلامیدا دەستیان بەکار و چالاکی کردبوو.

٥. هەبوونی ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵکی سەر بە تەوژمی ئیسلامیی لە شارەکەدا، لە هەموو چین و توێژەکاندا، مامۆستایانی ئایینی، مامۆستایانی قوتابخانەکان، خەڵکی عەشایەر، کاسبکار، گەنجان و ئافرەتان و...هتد، ئەم تەوژمە لە پەرەسەندن و گەشەکردندا بوو.

مامۆستا صدیق بەشێوەیەکی سەرسوڕێنەر بەدواداچوونی بۆ هەواڵ و ڕوداو و گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە بەگشتی و لەو خاڵانەی سەرەوەدا بەتایبەتی دەکرد، بەو ئامرازە سادانەی ئەوکات لەبەردەستبوون، تەنانەت بۆ زانینی هەواڵ و ڕوداوی نوێ خەڵکی دەنارده بەغدا و موسڵ و پاوە و کرماشان و لەڕێگەی خزم و دۆستانیەوە جۆرێک لە ئاگاداریی لە کار و چالاکی حزبە کوردستانیەکانیش هەبوو.

هۆکارە زاتیەکانی جورئەتی دەسپێشخەری مامۆستا صدیق لەم کارەیدا و شڵەقاندنی گۆمی مەنگی ڕاگرتن و ڕاوەستانی کاری ڕێکخستن لە کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمیندا، کە لە ئەگەری کەشفبوونی لەلایەن حزبی بەعسەوە لەو سەردەمەدا ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی جدی لێدەکرا، بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ژینگەی پەروەردە و پێگەشتنی خانەوادەیی مامۆستا، کە لەخێزانێکی زانا و ناودار و ئایینپەروەر و خاوەن مەدرەسەی دەرس و دەوری زانستی شەرعی و پێگەیاندنی زانایان بوو لە ناوچەکەدا، لە لایەکیترەوە برا گەورەکانی(مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان و مامۆستا مەلا علی و مامۆستا مەلا عمر) و بەشێکی زۆر لەخزم و کەسە نزیکەکانی، کەسی ناسراوی سەر بەهەمان ڕەوتی ئیخوان موسلیمین بوون، بەڕێژەی جیاوازی پابەندی.

جگە لەوەی-وەک لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا- لە کەسە یەکەمەکانی دروستبوونی ئەڵقەی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمن بوو، لە ناوچەکەدا لە ڕێگەی حزبی ئیسلامییەوە، زۆرجار ئەڵقەی پەیوەندی نێوان بەرپرسە ئیخوانیەکانی بەغدا و کەرکوک و هەڵەبجە بووە.



مامۆستا صدیق هەمیشە دەیووت: دەبێت کاری ڕێکخستن دەستپێبکرێتەوە و کار بەڕێکخستن بکرێت، بڕیاری ئەم ڕاگرتنی ڕێکخستنە تائێستە ئەگەر بۆ جێگەکانیتری عێراق پاساوی مانەوەی مابێت بۆ کوردستان پاساوی نییە.

### دنیای غەیبەت و قسەی شەرعیەت

ئەوانەی هاوڕا و پشتگیریی مامۆستا صدیق بوون، لەمەسەلەی کارکردن بە ڕێکخستن و بۆژاندنەوەی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمین لە ناوچەکەدا، لە جیلی یەکەمی ئیخوان لە شارەکەدا، تەنها مەرحومی مامۆستا مەلاعوسمانی برای پشتگیری بیرۆکەکەی دەکرد و هەڵوێستەکەی مامۆستای بەراست دەزانی، لە جیلی دووهەمیش ژمارەیەکی زۆرکەم قەناعەتیان بە بۆچوون و بڕیارەکەی مامۆستا هەبوو لەگەڵی هاتبوون.

لە نیوەی دووهەمی ساڵانی حەفتاکاندا دیاردەی دەرسی گشتی لە هەندێ مزگەوتەکان و ماڵانی شاری هەڵەبجەدا سەریهەڵدابوو، مامۆستا صدیق بۆخۆی لە دەرسەکانی هەفتەی جارێکی پاش عەسرانی مزگەوتی مامۆستا مەلا ساڵحی گەورە-کە بە مزگەوتی کانی عاشقانیش ناودەبرا- ئامادە دەبوو، مامۆستا مەلا ئەمین عەبدولڕەحمانی زەردۆیی دەرسەکەی دەوتەوە، هەرجارە و بابەتێکی ئیمانی و ئەخلاقی و تەزکیە و عیباداتی گشتی تیا دەوترایەوە.

لە فرەجوڵان و چالاکی ئەو کۆمەڵە گەنجەی بەدەوری مامۆستاوە بووین، سەرمان بە هەموو دەرسێکی گشتی مزگەوتەکان و ماڵەکاندا دەکرد، بۆ گەیاندنی فیکرەکەمان بە گەنجانیتری شارەکە و بەڕاشکاوی باسی گێڕانەوەی ڕێکخستن و کاری بەڕێکخستنی ئیخوانمان بۆ دەکردن، هەندێجاریش دەبووینە موفتی و فەتوای شەرعی نەبوونی ڕاگرتنی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقمان دەدا، لەلایەن دکتۆر عەبدولکەریم زەیدانەوە، سەرنجی هەندێکمان ڕادەکێشا و دەمانهێنانە دەرسی گشتی و ئوسرەکانی خۆمان، هەوڵی زۆریشماندەدا ئەم بیرۆکەیە بیگەیەنینە دەرەوەی شارەکە.

ئەم جوڵە و دەم و دەستنەوەستانە گەنجانەیەی ئێمە، شلەژان و شپرزەییەکی لەناو ئیخوانەکانی شارەکەدا دروستکرد، هێڵێکی جیایی و پۆلبەندیەکی توندی لێکەوتەوە، بەجۆرێک بڕواناکەم بە چاک و خراپ بە ڕەوا و ناڕەوا کەس لە غەیبەت و تانە و لۆمەکردنی یەکتر ڕزگاری بووبێ؟؟من وەک بڵێی لەپڕ کەوتم بەسەرشتێکی چاوەڕوان نەکراودا چونکە تا ئەو کاتە وامدەزانی وەک دەڵێن» هەموو لەکین و هەمووچوون یەکین» تووشی دڵەڕاوکە و گومانبووم؟ بەڵام سروشتی حزب و ڕێکخستن وایە تاک وەک مێگەل بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت، منیش پاشماوەیەک ئەو حیرەت و دڵگیرانەم نەما، لەگەڵ دۆخەکە ڕاهاتم.

لێرەوە بابەتی شەرعیەت و ناشەرعیەتی خستنەوەگەڕی ڕێکخستن و کارکردن بەڕێکخستن لەژێرناوی ئیخوان موسلیمیندا لە نێوان سەرکردەکانی جیلی یەکەم و دووهەمی ئیخوانی هەڵەبجە ودەوروبەری لەگەڵ مامۆستا صدیق و هێڵەکەی ئێمەدا سەریهەڵدا، ئەوان دەیانووت: ئەم کارەی مامۆستا صدیق کە بەناوی ئیخوانەوە کاری ڕێکخستنی دەستپێکردوەتەوە بێمۆڵەت و بێبڕیاری سەرکردایەتی ئیخوانی عێراقە، کارێکی ناشەرعییە و هیچ شەرعییەتێک و هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی بۆمۆڵەت پێدانی نییە؟ ئەگەر شتێک هەیە بۆ ئێمە نایزانین؟ یان بۆ ئەم بابەتە لەگەڵ ئێمە باس

مامۆستا صدیق بەشێوەیەکی سەرسوڕێنەر بەدواداچوونی بۆ هەواڵ و ڕوداو و گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە بەگشتی و لەو خاڵانەی سەرەوەدا بەتایبەتی دەکرد، بەو ئامرازە سادانەی ئەوکات لەبەردەستبوون.



ناکات؟ نابێ بەم قسانە ئەم گەنجانە هەڵخەڵەتێنی و بەم ناوەوە لەدەوری خۆی کۆیانکاتەوە؟ لەڕاستیدا مونتەڵەقی مامۆستا جیاوازبوو لەوان، مامۆستا صدیق لە ڕوانگەی زەرورەت و ئەوانیش لە ڕوانگەی ڕوخسەتەوە دەیانڕوانیە بابەتەکە.

### شەرعیەتی ڕێکخستن و ڕێکخستنی حزبی سیاسی:

سەبارەت بە ڕۆڵ و کاریگەریی ڕێکخستن، کەس ناتوانێت گرنگی و بایەخی چەمک و فەلسەفەی ڕێکخستن و سیستماتیکبوون-التنظیم و النظام- لە هەموو گۆشە و پارچەیەکی ژیان و بوونەوەر و گشت مەخلوقاتەکاندا نادیدە بگرێت. ڕێکخستن لەدێر زەمانەوە لە زانستی کەلامدا و تائێستەشی لەگەڵدا بێت لەژێر ناوی»دەلیلی نزم» بۆخۆی یەکێکە لە دەلیلە لۆژیکیەکانی هەبوونی خودایەکی زانا و دانا و کاربەجێ، کە لەپشت ڕێکخستن و کارکردن و جوڵەی لەڕادەی عەقڵا بەدەوری ورد و هەستیاری کۆی خەلقی جودەوەیە، ئەم چەمکە گەردوونییە پشتی تیۆریەکانی ڕێکەوتگەرایی و پوچگەرایی و بوونگەرایی لەزەوی دەدات.

ڕێکخستن یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی ئیدارە و ڕێکخستنی گشتی دەوڵەت و دامەزراوەکانی، بەهەمانشێوە ڕەگەزێکی سەرەکی ئیداری کارە، لە گشت کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتدا، بێ ڕێکخستن هیچ پلان و دابەشکردنی کار و بەرپرسیاریەتی، و...هتد، لە حکومەت و کۆمپانیاکانی کاردا نایەتەدی.

لە تیۆری گشتی حزبە سیاسیەکاندا، ڕێکخستن جەوهەری بوونی هەر حزب و کۆمەڵەیەکی سیاسیە، تەنانەت هەندێ جار حزبەکان بە ڕێکخستنە سیاسیەکان ناودەبرێن، یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی هەر حزب و کۆمەڵەیەک.

یەکێک لە ئەرکە ناسراوە گرنگەکانی حزب، گۆڕینی گردبوونەوەی کۆمەڵە کەسێکی پەرش وبڵاوە لە دەوری بەرنامە و فیکرەیەک، بۆکارێکی ئامانجداری بەرنامەکراوی ئاڕاستەکراو، حزب بەهۆی ئامرازی ڕێکخستنەوە چوارچێوەیەکی کۆکەرەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە دەڕەخسێنێ.

دەوترێت ڕێکخستن «پەیوەندی نێوان فیکر و کردەیە» کە ئامانجە سیاسیەکانی وەک فیکر و ئەندێشەی سیاسی، دەگۆڕێت بۆ ڕەفتار و کردار و گوتاری ئەندامانی و لەوێشەوە ئاڕاستەی جەماوەر دەکرێت، بەمانایەکیتر ڕێکخستن چوارچێوەیە کە لەمیانەیەوە و بەهۆیەوە حزب ئەندامانی بۆ خەباتی هاوبەش و یەکپارچەی لەگەڵا جەماوەر ساز و تەییار دەکات.

ڕێکخستن هێزە، کۆمەڵەی سیاسی بێ ڕێکخستن، پەیکەر و دابەشکردنی کار و بەرپرسیاریەتی و بڕیار و هەڵوێست و پەروەردە و هۆشیاری و بڵاوبوونەوەی بیر و دیدە سیاسیەکانی نزیکە لە مەحاڵ. گردبوونەوەی کۆمەڵە کەسێک لە هاوڵاتیان، بەدەوری بیر و ئەندێشەیەکدا، بێ ڕەگەزی ڕێکخستن وەک چالاکی یانەیەکی ڕۆشنبیری و کاروباری موریدانی تەریقەتێکی تەصەوف و کۆمەڵەیەکی تایفی لێدێت.

کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین بەوە بەناوبانگ و ناسراوە کە ڕێکخستن یەکێکە لەپایە سەرەکیەکانی کارکردنی و هۆکاری تۆکمەیی و مانەوە و بەرگەگرتنی پەلاماردان و کێچەڵ پێگێڕانی بووە لەم ماوە درێژەی تەمەنیدا.

سەبارەت بە شەرعیەت: ئاشکرایە تانەدان لە شەرعیەتی کاری ڕێکخستن و گردبوونەوەی کۆمەڵێک کەس لەژێر ناوی یان بەناوی حزب و ڕێکخستنێکی دەسنیشانکراوەوە، بۆئەوکات و بۆئێستەش لەڕووی پەیڕەوی ناوخۆی حزبەکان و یاسای حزبە سیاسیەکانەوە ئەو تانەیە ڕاستە، هیچ هێز و لایەنێک ناتوانێت ئیدعای ڕێکخستن و حزبایەتی بەناوی حزب وڕێکخستنێکەوە بکات بەبێ بڕیار و ڕازیبوونی سەرۆک و سەرکردایەتی حزبەکە، ئەمە جیاوازە لە پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی ڕێباز و ڕەوت و جیهانبینی و دیدی ئیخوان موسلمین بۆ ئیسلام و کاری ئیسلامی و شێوازی دینداری، وەک تەوژم و ڕێبازێکی گشتی هەمووکەس دەتوانێت لای خۆیەوە هەوادار و شوێنکەوتووی ڕێبازی ئەوان بێت، یان وەریگرێت و سوودی لێببینێت.

ئەگەرچی مامۆستا صدیق زۆربێباک بوو لەم قسە وباسانە، زۆر جێگەی بایەخپێدانی نەبوون، بەڵام ئێمەی تووشی جۆرێک لە گوشاری دەروونی کردبوو، زۆرجار داوامان لەمامۆستا دەکرد بەڵکو بە هەرشێوەیەک هەیە ئەم گرفتە چارەسەربکات.

دەبێ ئەوەش بڵێم، مامۆستا صدیق هیچ کاتێ بەئێمەی نەوتبوو ئەم کارە مۆڵەتی سەرکردایەتی ئیخوان موسلیمینی هەیە؟ هەمووجار دەیوت ئەوەی دەیکەین زەرورەت و شەرعییە یان نا؟

بەدڵنیایی هیچ کەس ئەو وێنەیە نییە کە ئێمە لە زهنی خۆماندا وێنەمان بۆکێشاوە، بەڵکو هەمووکەس بەقەدەر ئیحساس و ڕوانینی خۆمان بەرامبەر بەوکەسە دەیناسین، بۆیە هەرحوکمدانێک بەرامبەر بە کەسێک لەسەر ئیحساس هەڵەیەکی کوشندەیە و پەتی دۆستایەتی دەپچڕێنێ.

نەیارانی ئەم کار و بۆچوونەی مامۆستا صدیق، ڕایان وابوو بەجیا لەوەی مۆڵەت و بڕیاری قیادەی ئیخوان لەسەر ئەم کارەی هەیە یان نا، مامۆستا کەسیەتی هەڵگرتنی ئەم کار و بەرپرسیاریەتییە نییە؟ کەسی لەپێشتر لەو هەن و دەبێ ئەوان ئەم ڕێگەیە ئاچوخ بکەن، لەڕاستیدا ئەوان بە ئیحساسی خۆیان-هەستی دەروونی- بۆ مامۆستا صدیقیان دەڕوانی، ئێمەش لەگەڵی دەژیاین، دواتریش بە ئەزموونی کردەیی بۆمان دەرکەوت کە عەسای سیحری لە ئارادا نییە، نە لەو باشتر دەڵێن، نە لەوباشتر دەکەن؟

لەپایزی ساڵی (١٩٧٩) جارێکیان ڕەحمەتی مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی لەڕێگەی مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمانەوە داوایکردبوو کە مامۆستا صدیق ڕێگە بدات من لەگەڵ ئەو سێ نەفەرەی دەوری ئەو کۆببمەوە (مامۆستا محەمەد ڕەئوف، مامۆستا ئەحمەد شافیعی، بەندە) سەرلەبەیانیەک لە ژورەکەی مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان لە مزگەوتەکەی خۆی -مزگەوتی شافیعی- لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم کۆبووینەوە، بەحزوری مامۆستا مەلا عوسمان، قسەکان زۆری خایاند بەڵام لەسەر دوو تەوەرە بوون، ئایا ئەوەی دەکرێت و ئەم خەڵکە و ئەم مامۆستایانە دەیکەن کاری ئیسلامیی نییە؟ فێرکردنی قورئانی پیرۆز بەمناڵان و گەنجان، دەرسی تەفسیر، سیرەی پێغەمبەر، فێرکردنی ئەخلاقی ئیسلامیی، و..هتد، ئێوە هەرئەوە بەکاری ئیسلامیی دەزانن کە ئەم ناوەی بەسەرەوە بێت؟ مەبەستی ناوی ڕێکخستن بوو.

تەوەرەی دووهەم قسەکردن بوو لەسەر شەرعییەت و کەناڵی ڕوخسەتی ئەم کارەی مامۆستا صدیق، وتی ئەم کارە ڕوخسەتی نییە و شەرعیەتی نییە، ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین بە هیچ کەناڵ و کەسێکی متمانە پێکراوی جێگەی خۆیەوە نەبەسراوە، نموونەی بەکارەبا و عەموودی کارەبا هێنایەوە، وتی: ئێستە کارەبا لە دەربەندیخانەوە دێت بۆ هەڵەبجە، نابێت تەلی ئەم کارەبایە لەوێوە تائێرە بەهەموو عەمودەکانەوە بەسترابێت؟ ئەگەر لە سەرچاوەکەی

کارەبا وەرنەگریت کارەبا لێرە هەیە؟ ئەگەر لەرێگە پچڕا کارەبا دەگاتە هەڵەبجە؟ ئەم ئیشەی مامۆستا وەک ئەم کارەبا و سەرچاوەی کارەبایە وایە، نە بەسراوە بەهیچ سەرچاوەیەکەوە، عەمودەکانی رەنگە تاک و تەرا لە سەیدسادق بەملاوە بێت!

لەراستیدا چۆن چووبوین وەهاش هاتینە دەرەوە، چونکە ئەوەی باسیکرد، کێشەی ئێمە نەبوو لەبەر خۆمان بەڵکو کێشەی ئێمەبوو لەبەر ئەوان، وەک ئاماژەم پێکرد مامۆستا صدیق ئێمەی لەسەر زەرورەتی شەرعی و دینی ئەمکارە دڵقایم و راهێنابوو، گومانێک لەئارادا نەبوو، بە تایبەت زانا و موفتییەکی وەک مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان تەسدیق و پشتیوانی دەکات، کێشەمان ئەوان بوون کە داوای روخسەت و عەموود و تەلی کارەبایان دەکرد لە سەرچاوەیەکی ئیخوانی عێراقەوە؟

نازانم رەحمەتی مامۆستا ئیبراهیم ئاگای لەوە بووبێ یان نا، چەندین جار لەلایەن کەسانیتری مامۆستا و قوتابی ئەوانەوە، ئەم قسانەی ئەومان بە توندتر و زبرتر بەگوێدا درابوو.

نزیک بە هەمانکات، مامۆستا ئیبراهیم داوایکردبوو بۆ گفتوگۆ لەسەر هەمان بابەت لەگەڵ مامۆستا صدیق کۆ ببێتەوە؟ کۆبوونەوەکە کرابوو، لەسەر خاڵی شەرعیەت و ناشەرعیەت، مامۆستا صدیق ئەو بەیاننامەیەی بۆ خوێندبوویەوە کە لەهاوینی هەمان ساڵدا دەرمانکردبوو، مامۆستا ئیبراهیمیش ووتبووی جا ئەمە چییە؟ ئینشایەکی جوانە و نابێتە دەلیلی هیچ. ئەکید رەحمەتی مامۆستا ئیبراهیم بیری لەوە نەکردبوویەوە، ئەم بەیانە مەترسی خۆی هەیە، گوزارشت لە ئیرادەی دامەزراندنی رێکخستنێکی ئیسلامیی دەکات، تازە گەرانەوە دواوەی بەم قسانە و تانە و تەشهیر لەدەست دەرچووە.

دواتر زانیم کە لە کۆبوونەوەی شورای برایانی ناکۆک لەگەڵ کاری مامۆستا صدیق، بڕیاریاندابوو مامۆستا ئیبراهیم راسپێرن بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا صدیق و ئەوانەی بەدەوری ئەوەوەن. وەک ئاماژەم پێکرد ئەم بابەتی شەرعیەت و ناشەرعیەتی کاری رێکخستنەی ئیخوان ئێمەی ئیحراج کردبوو، لای خۆمانەوە سەرمان بەهەموو کەلەبەرێکدا دەکردن بۆ دۆزینەوەی ئاسۆیەکی چارەسەرکردنی.

رۆژێکی جومعە لەموسڵ بڕیارمدا لەمزگەوتی-حی الکفائات – لای دکتۆر مستەفا پێنجوێنی نوێژ بکەم، پێش نوێژ چوومەلای عەرزمکرد ئەم نیوەڕۆیە دەمەوێت خۆم تەنها لەماڵی بەرێزتان پێکەوە نان بخۆین، چەند پرسیاری زەرورم هەیە؟ فەرمووی باشە بەسەرچاو، لەسەرسفرە کابرایەکی عەگاڵ بەسەری باڵابەرزی ریشدرێژمان لەگەڵبوو، دکتۆر روی تێکردم، ووتی: فەرموو، منیش ووتم ئەی ئەم کابرایە گوێی لەقسەکان دەبێت؟ هی ئەوەنین جگە لە جەنابت کەس بیانبیسێ، فەرمووی بێخەمبە وابزانە کۆترە دارێکە؟ گوێ لەهیچ ناگرێت، منیش باسی کاری مامۆستا صدیق و خۆمانم بۆ کرد، سەرەتا وتی من مامۆستا صدیق باش دەناسم، پیاوێکی دڵسۆز و لێهاتووە، وتی: چەند رۆژ لەمەوبەر دکتۆر عبدالكريم زەیدان سەردانی کردم لەم ژوورە پێکەوە دانیشتین، ئەم پیاوە هێشتا لەژیاندایە و پێداگرە لەسەر رای خۆی، سەرپێچیکردنی پاساوی گەرەکە، بابەتەکەی زۆر درێژکردەوە لە فیقە و ئوسوڵ و قاعیدەی کارکردن، دواتر وتی: شەرعی و ناشەرعی رێکخستن و کاری رێکخستن قسەی خودا و دین نییە؟ هی قەواعیدی کارکردنی جەماعەتە؟ ئێوە خۆتان دەتوانن مەوقیفەکە تەقییم بکەن؟ رەنگە ئێستا پرسیاری ئەوە لای خوێنەر دروست ببێت، ئەوەی مامۆستا صدیق لەساڵی ١٩٩٢ دا کردی بە دروستکردنی(بزوتنەوەی راپەرینی ئیسلامیی) بۆ هەر ئەوکات و پاش دەرکردنی ئەو بەیاننامەیە لە ساڵی ١٩٨٧ دا نەیکرد؟ جگە لەو راستیەی کە دەبێت هەر پرس و رووداوێکی مێژوویی لە سیاقی قۆناغە مێژووییەکەی خۆی و دراوەکانی سەردەمەکەی خۆیدا سەیر بکرێت و بخوێنرێتەوە، بەڵام لە ئەڵقەکانی دواتردا سەرنجی خۆم لەو بارەیەوە دەردەبڕم.




# کتێبی
# دەربارەی میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان
## (نووسینی زانستیی یان سەرابی ئەکادیمیی؟!)

**ئارام عەلی سەعید**



لەدایکبووی ١٩٧٧ ی شارەزوور. هەڵگری بڕوانامەی ماستەر لەمێژووی ئیسلامیی. ڕۆژنامەنووسە و خاوەنی سێ کتێبی چاپکراوە بەناوەکانی "صەلاحەددینی ئەیوبی گەورەتر لەڕەخنەگرانی، دۆزی کورد لەنێوان بیری نەتەوەیی و ئایینییدا، ئاسۆی ئیسلام".

هەمووکات لەدونیای ڕۆشنبیریی و مەعریفیدا باس لەوە کراوە کە «نووسین» بەرپرسیارێتییە، گەر ئەم بەرپرسیارێتییە بەواتا گشتییەکەی پێوەر بێت بۆ هەموو نووسین و نووسەرێک ئەوا بۆ مامۆستایەکی زانکۆ کە تانووپۆی وەزیفەکەی دەست و پەنجە نەرمکردنە لەگەڵ کردەی زانست و گەڕان بەدوای زانیاری سەرچاوەدارو کنە و پشکنین و کێومالّی بەڵگەنامەو بابەتیبوونی توێژینەوەدا ئەوا زیاد لەهەموو نووسەرێکی ئاسایی یان دەرەوەی ناونیشانی زانکۆیی بەرپرسیارتر و ئەرکدارترە لەبەرانبەر پرۆسەی نووسیندا.

ئەم بکەرە «زانستی»ە پێویستە وردەکار بێت و ئەزموون و پسپۆرییەکەی ڕەنگدانەوەی ناو نووسینەکەی بێت، نووسینێک کە نابێت خاڵی بێت لەو پێدراوە زانستیی و ژێدەرە ڕەسەنانەی ناوەڕۆکی نووسینەکە یان بەواتا ئەکادیمییەکەی جەوهەری ڕاستەقینەی توێژینەوەکە پێکدەهێنن، لێرەوەیە مامۆستای زانکۆ خوێندکار پێدەگەیەنێت و پایە بنچینەییەکانی شێوازی تەدریس لەلایان بۆ فێرخوازان جەختکردنەوەیە لەسەر وردەکاریی نووسینی توێژینەوەو خستنەڕووی زانیاری دروست و زانستیانە.

زۆرجار گوێبیستی ڕەخنە و نیگەرانییەکانی مامۆستایانی زانکۆ و توێژەرانی زانستی دەبین لەوەی کە بەشێک لە نووقسانییەکانی ژیانکردن و لێکەوتە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان بە تەواوی بوارەکانیەوە لەکوردستان غیابی زانستی بوون و نەگەڕانەوەیە بۆ دەرگای زانکۆ و کارنەکردنە بەو بەها و نۆرم و پێدراوانەی خودی زانکۆ و ئەکادیمیاکان بەرهەمیان دێنن، لێرەوە تەریب بەیەک دونیای ڕۆشنبیریی و کایەی مەعریفی ڕووبەڕووی زۆرترین ڕەخنەو بەریەککەوتن دەبێتەوە لەلایەن ئەکادیمیست و پسپۆڕانی نێو زانکۆکانەوە، لەوانەیە ئەمە دوورابییەکی بەرفراوان بێت لەنێوان بەشێک لەدونیابینی زانکۆیی و عەقڵییەتی دەرەوەی زانکۆکان بۆ ڕوانین لەکۆی پرۆسە فیکریی و ڕۆشنبیری و مەعریفییەکان، یاخود خاڵی ناکۆکی توێژەرانی ناو زانکۆکان بێت لەوەی کەپێویستە دواجار سەرلەبەری پرۆسەی نووسین و بابەتە مێژوویی و فەرهەنگیی و ژیارییەکان بەفلتەرەکانی زانکۆدا تێپەڕن و لەقاڵب بدرێن ئینجا شایستەییبوونیان هەیە.

بەڵام لەمانە ترسناکتر و تراژیدییتر ئەوەیە کە بۆخۆی نووسین یاخود توێژینەوە زانکۆییەکان خاڵی ببنەوە لەسەرچاوە و کەرەستە پێکهێنەرە مەرجدارەکانی خۆیان، یاخود دووربکەونەوە لەو قووڵاییانەی کە توێژەر لەڕێگای توێژینەوەکەیەوە دەگەیەننە ڕاستیی و دەرەنجامێک دەخەنەوە، یان ڕووبەڕووی کێشەی سەرچاوە یان بێ سەلیقەیی و لاوازی خودی توێژەرەکان ببنەوە، چونکە بەشێک لەو ناونیشان و پلەبەرزکردنەوانەی مامۆستایانی زانکۆ وەریدەگرن لە دامەزرواەکانیان لەڕێگای بەرهەمهێنان و نووسینی توێژینەوەی زانستییەوەیە، واتە ئاست و توانستەکان لە زانستیبوون و هێز و پێزی ناوەڕۆکی توێژەینەوەکانەوە هەڵدەسەنگێنرێن، هەرلەوێشەوە شایستەی دارایی و دابینکردنی ژیانی ماددییان دەستەبەردەکەن، واتە هەوڵە زانستییەکانیان زامنی دەستەبەرکردنی ژیانێکی باشتریشە بۆیان.

ئەم پێشەکییەم بۆ بابەتێکی سەرپێیی و سادە و بێقووڵایی نەنووسیوە، یان خستنەڕوو و ڕاستکردنەوەی ڕووداوێکی مێژوویی نییە کە شاهید حاڵێک بەگۆڕینی ڕاستیی و دروستیی ڕووداوەکە زانیارییەکانی پێچەوانە کردبێتەوە، هەروەک چۆن پەرچەکردارێکی سایکۆلۆژیش نییە لەمەڕ نووسینێک کە پەیوەست بێت بە ویستە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی ڕۆژانەمان.

هەڵبەت ئەم هەوڵە بچووکەم دەروازەیەکە بۆ تەواوکاریی ناو باسێک کە سێکوچکەی «زانست و تەکنیک و ناوەڕۆک» ئیشی تیا دەکات، ویژدانی

مرۆیی و ئاکاری ئیسلامییش لەلایەکی ترەوە خەمی ناو پرۆسەکەن لەپێناو گەیاندنی پەیامێکی ئامانجداردا، ئەم نووسینەم هەوڵێک یان ئیزافەیەکی تەواوکارییە لەبارەی پرسێکی گرنگ کە پەیوەستە بە «ڕاگەیاندنی ئیسلامیی» و گواستنەوەی واقیعیەتێکی کەڵەکەبووی مێژوویی لانیکەمی نزیکەی چل ساڵ لە کاری ڕۆژنامەنووسیی باشووری کوردستانە.

دەربارەی میدیای ئیسلامیی لە هەرێمی کوردستان» یەکێکە لەو هەوڵانەی کە پ.ی.د. بەهادین ئەحمەد بەبێ هیچ ئاماژەیەکی «پێشەکی» لە سێ بەشی جیاوازدا لەمەڕ میدیای ئیسلامیی لەباشووری کوردستان نووسیویەتی.

ئەم نووسینە کە مامۆستا»تۆفیق کەریم» وەک بەرپرسی دەزگای»خاڵ» کە ئەرکی لەچاپدانی کتێبەکەیان گرتووەتە ئەستۆ پێشەکییەکی بۆ نووسیوە لەم پێشەکییەوە خوێنەر تێدەگات لەوەی کە مەبەست لەم نووسینە چییە و پێویستە چۆن لەم هەوڵانە بڕوانرێت لەبارەی مێژووی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی لە باشوور لای هێزە ئیسلامییەکان، بەرپرسی «دەزگای خاڵ» لەپاڵ ئەم دەربڕینانەشدا هێما بۆئەوە دەکات کە تاوەکوو کارەکتەر و بکەرە ئیسلامییەکان لەژیاندا ماون زەرووره خۆیان خەم لە نووسینەوەی ئەم مێژووە بخۆن تاوەکوو لەدوای خۆیان بە ئاوەژوو یان هەر هەوڵێکی چەواشەکارانە لە دەرەوەی خۆیان نەنووسرێتەوەو نەبێتە واقیعێکی سەپێنراو بۆ ئایندە تاوەکوو وەک ڕاستییەکی سەلمێنراو مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

تەواو هاوڕای ناو تێگەیشتنەکانی ئەم دیباجە کورتەی بەرپرسی دەزگای»خاڵ»م وەک ناوەرۆک و مەبەست، بەڵام لەڕووی سیاقی نووسینەوە بۆ سێ بەشی «١٣٦» لاپەڕەییەک لەچوارچێوەی پەرتووکێکدا کە ناونووسکرابێت بە سێ باس، واتە»بەحس»، بەحس گەلێک کە نووقسان و ناتەواون لەڕووی زانستیی و تەکنیکی نووسین و ڕەچاوکردنی ئوسوڵی دارشتنەوە، نەدەبوو ئەو ناتەواویی و کرچ و کاڵیی و زانیاریی نادروست و هەڵەی مێژوویی بەسەریدا تێپەڕێت کە ڕووبەرێکی فراوانی ناو ئەم کتێبەی گرتووەتەوە، لانیکەم ئەم سێ بەشە کوورتە بەتایبەتی دوابەشیان خۆی ئاگای لە مێژووەکانیان و زانیاریی و بەشێک لەو تەکنیک و هونەرانەیە کە ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی تیادەرچووە و چاپکراون، هاوکات مامۆستا تۆفیق بەشێکیش بووە لەوانەی کە وەزیفەی سەرنووسەریی و خاوەن ئیمتیاز و ستافی نووسین و تەنانەت بەرپرسی بەشێک لەو ناوەندانەی ڕاگەیاندنەکانیش بووەو ڕۆڵی لە دەرچوونی گۆڤار و ڕۆژنامەکانیشیاندا وەک سیاسەتی کارکردن گێڕاوە، بەتایبەتی ئەو بڵاوکراوانەی کە لە دوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان و رووخاندنی سەدام تاوەکوو بەئێستاش دەگەن چاپکراون، دەبوو (خاڵ) وەک پێویست پیتی لەسەر خاڵ دابنایە.

ئەو کەموکورتیانەی لەم باسانەدا هەیە لەوانەیە بۆکەسێکی ئاسایی کە وەکو چالاکیی کەسیی و توانای خۆیی و حەزی دەروونیی بیەوێت بنووسێت و دارای ناووناوبانگ بێت چاوەڕوانکراوبێت، چونکە لانیکەمی ناونیشانی زانستیی و پێشگر و پاشگرێکی ئەکادیمی نییە و وەکو هەر کەسێکی دی لێی دەڕوانرێت کەبەشدارییکردووە لەپرۆسەیەکی فەرهەنگیی و هەوڵێکی نووسیندا، بەڵام بۆ مامۆستایەکی زانکۆ کە لەوانەیە بەرلەم نووسینانەش چەندین نووسینی دی هاوشێوەی ئەمانەی وەک بەشێک لەپێداویستیی ئەکادیمی و توێژینەوەی زانستی پێشکەشی بەشەکەی و تەنانەت خوێنەرانیش کردبێت، ڕێگە پێنەدراوە و کارەساتە، گەربێت و دەرفەتی تێپەڕینی پێ بدرێت، بۆیە هەر بێدەنگبوونێک لەم هەڵە مێژووییانە کە بەناوی توێژینەوەی زانستییەوە بڵاودەکرێنەوە بۆخۆی بەشداربوونە لەهەمان پرۆسەدا. دڵنیام ئەوزانیارییە گشتیانەی پەیوەستن بەئاستی نووسین و بەڵگە نووسراوەکانی ناو ئەم

پەرتووکەی مامۆستا بەهادین توێژەری زۆر ورد و خاوەن سەلیقەی زمانەوانیی و ڕۆژنامەوانیی و زانیاری قووڵ لەسەر داتا و مێژووەکان دەتوانێت بەکتێبێکی دووهێندەی وەک خۆی وەڵامی زانستییانەی بداتەوە و خوێنەریش لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، چونکە ناتەواوییەکانی ئێجگار زۆرن.

ئەوەی من لێرەدا دەینووسم وەکو بەشێک لەڕاستکردنەوە بۆ تەواوکاریی ئەم هەوڵەی مامۆستا بەهادین ئەحمەد مشتێکە لە خەرواری زانیاریی و شارەزاییەکی کەمی خۆم کە تاڕادەیەک ئاگایی و خوێندنەوە و ئیشکردنم لەسەریان هەیە، بەو هیوایەی وەکو ئیزافەیەک بۆ باشترکردنی ناوەڕۆکەکەی لێی بڕوانرێت و ڕەخنەکانم بونیاتنەر و پشتبەستووبن بە زانیاریی و تێگەیشتنی واقیعی و بەڵگەی سەلمێنەر بۆ مێژووی بەشێک لە ڕۆژنامەنووسیی کوردی باشووری کوردستان.

گەر لە ناونیشانی نووسینەکەوە دەست پێبکەم »دەربارەی میدیای ئیسلامی لەهەرێمی کوردستان»، ئەم ناونیشانە ناونیشانێکی زۆر گشتگیر و فراوانە و دوورە لەناونیشانێک کە بۆ توێژینەوەی زانستیی بنووسرێت، مامۆستا خۆی دەزانێت ناونیشانی نووسینی زانستیی لەناو زانکۆ و دەرەوەی زانکۆش گەر بێت و پەیوەست بێت بە زەمەنێکی دیاریکراوی مێژووییەوە یان قۆناغبەندی «کات» ی تێدابێت ئاتاج بە دەست نیشانکردنی زەمەنە، پێویستە بەدیاریکراوی ئەو زەمەنە لە تایتڵی نووسینەکەدا ڕەنگدانەوەی هەبێت، ئاماژە نەکردن بە زەمەن توێژەر سەرگەردان و پاشان خوێنەریش پەرت و بڵاو و شپرزە دەکات، ئەم ناونیشانە سەرەتایەکی تەمومژاوی دەبێت لە کۆکردنەوەی زانیاریی و تێگەیشتن لە ماناو مەبەستەکانی ناو نووسینەکە، بۆیە دیاریی نەکردنی ماوەی زەمەنیی لەم ناونیشانە گشتگیرەدا دەسپێکی ناڕوونیی و ئاڵۆزیی ناو هەریەک لەبەشەکانی دەخاتەڕوو، لەوانەیە توێژەر ئەزموونێکی ئەوتۆی نەبێت لەنووسینی توێژینەوەی زانستییدا بەتایبەتی لەبواری زانستە مرۆڤایەتییەکان.

بەشی یەکەمی تەرخانکراوە بەناوی»ڕاگەیاندن لە قورئانی پیرۆزدا»، ئەم بەشە وەکو دەروازەیەکە بۆئەوەی بیسەلمێنێت بوونی ڕاگەیاندن و میدیای ئیسلامیی وەکو قۆناغی سەرەتا و بنچینەی فیکرییەکەی بنەمایەکی هەیە کە شەرعیەت لە فەرموودەی خوداوە وەردەگرێت، لەنێو بەش و تێکستە جیاوازەکانیدا باس لە قورئان و «پەیوەندییکردن» و ئەو ئاماژە قورئانیانە دەکات کە هێمان بۆ «گەیاندن» و تێگەیاندن و چۆنیەتی «ڕووداوو گواستنەوەی هەواڵ و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست لەیەکدیی» و زۆر بابەتی دی پەیوەست بە هەواڵ و تەنانەت ژانرەکانیشی.

لێرەدا قسە لەسەر ناوەڕۆکی ئەم بەشە نییە بەهێندەی ئەوەی قسە لەسەر ڕەهەندە زانستییەکەیەتی، بەشی یەکەمی ئەم کتێبە لەڕووی زانستی نووسین و پێوەرەکانی بابەتیی بوونەوە گەر وەرگێڕانێکی بابەتێکی وەرگیراو نەبێت تەنها وتارێکی ڕۆژنامەوانییە و هیچی دی.

قورئان بۆخۆی یەکەمین سەرچاوەیە بەتایبەتی بۆ توێژینەوە یان نووسینیی بابەتێ کە هەڵگری پاشخانێکی ئیسلامیی بێت و پەیوەست بێت بە تێگەیشتنە قورئانییەکانەوە، یاخود باسێکی زانستیی کە بارگاویی بێت بە پێدراوە ئیسلامییەکان، قورئان یەکەم سەرچاوەی زانیارییەکانیەتی و یەکەم سەرچاوەیە لەڕیزبەندیی سەرچاوە زانستییەکاندا، لێرەشدا باسەکەی مامۆستا بەهادین بۆ گەیاندنی دیاردەیەکە کەبریتییە لە ڕۆژنامەنووسیی یان میدیای ئیسلامیی، چ جای ئەوەش ناونیشانی بەشەکە بە «ڕاگەیاندن لە قورئانی پیرۆزدا» دەست پێ دەکات، لەم نووسینەی مامۆستا «بەهادین» دا زیاد لە پەنجا شوێندا ئایەتی قورئانی کردووەتە پاڵپشت بۆ سەلماندنی بۆچوونەکان و تێگەیاندنی خوێنەر لەوەی کە ڕووبەرێکی فراوانی قورئان

هەڵگری باکگراوندێکە دەکرێت ببێتە بەڵگە بۆئەوەی کە ڕاگەیاندن لەم پەرتووکەی خودادا فەرامۆش نەکراوەو ئاماژەکانی ڕوونن لە هەواڵ و ڕووداوو چیرۆکەکانیدا.

گرفتەکە لێرەوەیە گەربێت و خوێنەرێک ڕۆشنبیریی ئیسلامیی لاواز بێت یان ئاشنا نەبێت بە ئایەت و تێکستە قورئانییەکان ناتوانێت بەبێ ئاماژەدان بەناوی سوورەت و ئایەتەکان بۆ سەرچاوەی ئایەتەکان بگەڕێتەوە، کە ئایا ئەمانە بۆخۆیان ئایەتی ناو قورئانن یان هەر دەستەواژەیەکی عەرەبین و بە ڕێنووسێکی دروست و ڕێکخراوەوە ڕیزکراون؟! چونکە لەو شەست ئایەتەی ڕیزکراون نە ناوی سورەتەکان نووسراوە نە ژمارەی ئایەتەکان، هاوکات بە وەرگێڕانێکی دەقا و دەقی حەرفیی بە کوردیی کراون نەک لێکدانەوە و قووڵبوونەوە لەمانا و مەبەستەکانی قورئان تاوەکوو خوێنەر تێی بگات، ئەمەش بۆ خۆی خاڵێکی لاوازە بۆ نووسینێک کە هەڵگری ناونیشانێکی زانستیی زانکۆیی بێت چ جای ئەوەی توێژەرێکی پاشخان ئیسلامیی توێژینەوەکەشی نووسیی بێت لەئاگاییەوە بێت یان نائاگایی بەسەریدا تێپەڕێت.

لێرەدا پرسیار لە نووسەری ئەم پەرتووکە دەکەم ئایا هۆکاری چییە لابرنی ناوی سورەت و ژمارەی ئایەت و ناونیشانەکانیان؟ ئەمە لەکام پێودانگە زانستیی و ئەکادیمییەکانی نووسینی توێژینەوەی زانستیدا جێی دەبێتەوە؟! ئایا بۆ لەبەشی دووەمدا سی و شەش پەراوێزی سەرچاوەدار ڕیزکراوە، بەڵام لەبەشی یەکەم دەست نیشانکردنی پەراوێزی زانستی نابینرێت؟! گەر مەبەستت لە پێشەکیی یاخود دەروازەیەکی نووسینەکەتە نەدەبوو هەڵگری ناوی «بەش» بێت یان وەک مامۆستا تۆفیق نووسیوویەتی ناونیشانی»باس» یان بەحسی هەبێت، وەکو یەکێک لەبەشە پێکهێنەرەکانی ناو توێژینەوەکە، گەر پێشەکیی و دەسپێکێک بووایە دواجار جیاکارییەک دەبوو بۆ تێگەیشتنی خوێنەر کە وەکو هەر نووسینێکی تری زانستیی مافی توێژەرە پێشەکیی بنووسێت و پشت بەهەر دەق و دەستەواژەیەکیش ببەستێت لەڕێڕەوی نووسینەکەیدا، چونکە پەیوەندیی بەسەلیقەی خۆیی و ناوەرۆکی توێژینەوەکەیەوە هەیە.

خاڵێکی تری ئاڵۆزی ئەم بەشە دەرەتانی بابەتی بوونیشی لاواز دەکات بریتییە لەو کۆتاییە کورتەی توێژەر نووسیویەتی بۆکۆی بەشەکە بەناوی «وتەی کۆتایی»، ئەم وتەیە بەهێندەی ئەوەی لەوەعزی واعیزێک و تێکەڵ بە گوتارێکی سیاسیی سادەی بێقووڵایی لایەنگرانەی نووسەرێکی ئاراستەکراو نزیکە کەمتر لە بەرئەنجامی نووسینێک دەچێت هەڵگری واتاکانی توێژینەوەی زانستیی بێت، بەمشێوەیە دەنووسێت» هەروەک دووڕووەکان (منافقین) لەڕابردوودا زۆر دەترسان سورەتیان لەسەر دابەزێت باوەڕی ساختەیان بەخودا و پەیامی پێغەمبەرەکەی ئاشکرا بکات و لەنێو بڕواداراندا ئابڕوویان بچێت؟! ئەمڕۆش هاوڕێبازەکانیان و دزو گەندەڵچییەکان زۆر لەچاوی کامێراو هەواڵی رووپەڕی ڕۆژنامەکان دەترسن کە ڕاستیی نهێنییەکانیان ئاشکرا بکات و ڕووی ڕاستەقینەیان لەبەردەم جەماوەردا هەڵبماڵێت؟!!» ئەمە دواوتەی توێژەرێکی ئەکادیمییە لەمەڕ تێگەیشتن لە ڕووحی قورئان و بەراوردکردن و بە بەڵگەهێنانەوەی بۆ دیاردەیەکی سەردەمیی کە بریتییە لە ڕاگەیاندن، لێرەدا من بەهۆی کەمیی شوێن و ماوە بۆ نووسینەکەم وازی لێدەهێنم و بەشێکی تری وەڵامەکەی بۆ خوێنەر بەجێدەهێڵم!

کەواتە دەکرێت ئەم بەشەی توێژەر نووسیویەتی بەناوی «ڕاگەیاندن لە قورئانی پیرۆز»دا وەکو بابەتی نووسەرێک یان وەرگێڕانی بابەتێک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت کە چەند سەرچاوەیەکی لەناو نووسینەکەی بەکارهێناوەو سوودی لێ بینیون کە چوار سەرچاوەی عەرەبییە، نەک وەکو

توێژینەوە یان باسێکی زانستیی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر نازانستیی بوونی باسەکەی.

بەشی دووەمی نووسینەکەی مامۆستا بەهادین کە جەوهەری باسەکەیە لەدەسپێکیدا ئاماژە بەوە دەدات کە هەڵسەنگاندنی میدیای ئیسلامییەکان بەهۆی گیرخواردنی لەنێوان چەمک و ئەرکی بانگەوازو سیاسەتدا لەدیدێکی ئەکادیمیی و زانستیی و ڕەخنەییەوە کارێکی نەک ئاسان نییە بەڵکو قورس و پڕ زەحمەتیشە، زۆر سەیرە مامۆستایەک پلەی زانستییەکەی گەیشتبێتە دکتۆرا و لەوێشەوە پرۆفیسۆری یاریدەدەر، داد و بێدادی ئەوەی بێت لە میدیاگەلێکی سەردەمی نوێدا بەدەستەبەربوونی ئەو هەموو ئامرازی ئاسانکارییانەوە و زەمەنەکەشی دوێنێیەکی نێزیک بێت، ئەم کارە بە قورس و زەحمەت ببینێت! لەوانەیە دەرەتانی دەستخستنی زانیارییەکان لای مامۆستا قورس بێت و کاتی ئەوەی نەبێت پێوەیان ماندووبێت، بەڵام هێندە پرکۆسپ و تەنگژەش نییە بەتایبەتی بۆ توێژەری بە ئەزموون و خاوەن قەڵەمی باش، لەوانەیە بۆ پشتگیریی بۆچوونەکەشم بەشی سێیەمی نووسینەکە باشترین بەڵگە بێت کە سەرلەبەری ناتەواویی و نوقسانییە لەڕووی زانیاریی و داتاو حەقیقەتی مێژووییەوە، کە تەنیا هۆکاریش ورد نەبوونەوە و نەگەڕانە بەدوای سەرچاوە و زانیارییەکاندا لەبارەی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوانەی مەبەستی بووە لەسەریان بدوێت.

جگە لەوەش ناونیشانی ئەم بەشە هەڵگری گرفتێکی مەعریفییە کە لەنێو ناوەندە ئەکادیمیی و ڕۆشنبیرییەکاندا شتێک نەماوە بەناوی میدیای تایبەتمەند و جیاکردنەوەی بۆ ناونیشانێکی ئایدۆلۆژیی، مامۆستا خۆی شارەزای تیۆرەکانی ڕاگەیاندنە کە ئەلف و بێی سەرەتای زانستی ڕاگەیاندن لەناوەندە زانکۆییەکان دەخوێندرێت باس لەو چوار تیۆرە دەکرێت کەبەپێی قۆناغبەندیی پەیڕەویی لێکراوە، گەر بۆ ڕابردوو ئەو تیۆرانەی دەسەڵات و ئایدۆلۆژیا زەمینەی گونجاوی بۆ ڕەخساندبن پەیڕەوییان لێکرابێت لەکاری میدیاییدا، لەئێستای پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و دونیای گۆڕانکارییەکان میدیا کەوتووەتە بەردەم داکەوتەی «بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی»ەوە، ئەمە بۆ ئەو میدیایەش ڕاستە کە تۆ ناوتناوە»میدیای ئیسلامیی»، باڵادەستیی ئەم تیۆرە نوێیە بۆخۆی ئەم میدیایەشی لە تەنگژە و کۆسپی ئایدۆلۆژیی قووتار کرد، ئەو ئەرکەی لەکۆڵ خستەوە لەسەر ئەو جیاوازییە کلاسیکیانە ئیش بکات کە زەمان و زەمینەیان کۆتاییهاتووە و هێزە ئیسلامییەکانیش بەتایبەتیی لەدوای ساڵی ٢٠٠٠ وە کەوتنە خۆ بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی ئایدۆلۆژیاو بەسەنتەربوونی حزب و پرەنسیپەکانی.

لەم بەشەدا کە مامۆستا هەوڵیداوە ڕوخسارێکی ئەکادیمیانە بە کۆی نووسینەکە ببەخشێت و تاڕادەیەک کاری بۆهێماکردن بەسەرچاوەکان کردووە، چەندین پەرەگرافی تێدایە پێکەوە بەستراون بەدوای یەکدا و مانا و ناوەرۆکەکان لای خوێنەر وەکو پێویست وەرناگیرێن، واتە مەبەست ونبووە لەبەدوای یەکداهاتنی ئەو زانیارییانەی وەرگیراون، بەتایبەتیی لە لاپەڕەکانی (٣٧ - ٤٤ن بەپێچەوانەوە لاپەڕەکانی (٤٧ - ٥١) زۆربەیان لەسەر میدیا جیاوازەکانە و بەناوهێنانیشیان ئاماژە بەسەرچاوەی پێویست نەکراوە کە زانیارییەکانی لێ وەرگیراوە، یاخود خاڵییە لەڕای توێژەرێکی بواری ڕاگەیاندن بۆ بەستنەوەی هەمان بیر و بۆچوون بەداکەوتەی مێژووی «میدیای ئیسلامی»ەوە هەروەکوو خۆی وای ناوناوە. لەگەڵ ئەمانەشدا کاتێک باسی تێکەڵکردنی کاری بانگەواز و سیاسەت دەکات ناکۆکیی لەبۆچوونەکانیدا هەیە، بۆ نموونە لەشوێنێکدا کە باسی هەندێک لەو میدیایانە دەکات بەتایبەتی کەناڵە تەلەفزیۆنییە ئاسمانییەکانی وەک»سپێدە، پەیام، بانگەواز، ئامۆژگاری» هێما بۆ تایبەتمەندبوونی هەندێکیان دەکات و پشتی بەستووە بە زانیارییە نوێیەکان لەمەڕ گوتاری ئەو کەناڵانە، جیاواز لەمانە کاتێک دەیەوێت بەرئەنجام



دەربارەی میدیای ئیسلامی لەهەرێمی کوردستان»، ئەم ناونیشانە ناونیشانێکی زۆر گشتگیرو فراوانەو دوورە لەناونیشانێك کە بۆ توێژینەوەی زانستیی بنووسرێت.

بخاتەڕوو باس لەتێکەڵاویی لە چەمک و زاراوە و لە ئەرک و ئامانجی کاری بانگەواز و سیاسەت دەکات، هاوکات تەواوی ئەو میدیایانە بە نەبوونی پلان و ستراتیژێکی ڕوون وێنا دەکات دوور لە هەر پاڵپشتییەک بە بەڵگە و زانیارییەک کە لە دەرەنجامدا باسیکردووە، جگە لەوەش هەردوو چەمکی»میدیای ئیسلامی» و»میدیای بانگەواز»ی وەکو دوو دەربڕینی جیاواز بۆ مەبەستێک تێکەڵکردووە دوور لەستراتیژییەتی توێژینەوە.

لەم بەشەدا بەریەککەوتنێکی زۆر لەو ناونیشانە گشتگیرەی نووسەر بەدی دەکرێت لەبارەی هەڵسەنگاندنی گوتاری ئەومیدیایانەی ئەو هەندێکیان لەنێوان تایبەتمەندو ئەوانی دی بەتێکەڵاوی لەگوتاری بانگخوازیی و سیاسیی وێنا دەکات.

بەشی سێیەم کە دوابەشی باسەکەیە بەشێوەیەکی نارێکخراو چ لە خستنەڕووی زانیارییەکان و چ لەڕووی داڕشتن و خاڵبەندیی و ئوسوڵی نووسینی زانستییەوە حەفتاو پێنج لەو گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانەی بەوێنەی بەرگی یەکەمی زۆربەیانەوە تێدایە. بێگومان بۆ نووسەر یاخود گەر ناوی توێژینەوەی لێ بنێین بۆ توێژەر ئەم بەشە پڕ بەڵگەنامەترین باسە بەهۆی وێنەو ڕوخساری بەرگی سەرەوەی ئەو بڵاوکراوانەوە کە دانراون تێیدا و زۆربەشیان زانیارییە مێژووییەکانی یەکەم ڕووپەڕیان ڕوون و دیارن.

ناونیشانی ئەم بەشە «گوڵبژێرێک لە ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لەهەرێمی کوردستان ١٩٨٤-٢٠٠٦»، بێگومان منیش لەو حەفتا و پێنج گوڵەی مامۆستا چەند گوڵێکی کەم وەک نموونە هەڵدەبژێرم بەهۆی ئەو ڕووبەرەی بۆ نووسینەکەم دیاریکراوە لە گۆڤاری»خاڵ» و ڕاست و دروستییان بۆ خوێنەر دەخەمەڕوو، ڕاستییەک بەپشت بەستن بە بەڵگە و زانیاریی بەردەست، ڕاستکردنەوەیەک لە قەڵەمی نووسەرێکەوەیە لەلایەک بەشێک لە ئەرشیفەکانی ئەم مێژووە نوێیەی یاداشتکردووە و لەلایەکی دی لەنزیکەوە بەدواداچوونی بۆ مێژووی دەرچوون و چاپکردنی هەندێک لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە کردووە لە زمانی شاهید حاڵ و کارەکتەرەکانیانەوە کە مامۆستا نووسیویەتی لە کتێبەکەیدا.

سەرەتا بەکارهێنانی زاراوەی «هەرێمی کوردستان» هەڵەیەکی مێژووییە بۆ قۆناغێکی دیاریکراو لەمێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، بەتایبەتی بۆ پێش ڕاپەڕین کە نە زاراوەی هەرێم لەو قۆناغەدا بوونی هەبووە بۆ کوردستان و نە ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەش لەوکاتەدا لە کوردستان دەرچوون، گەرچی بۆ داکەوتەی سیاسیی و فیکریی و ئایینیی و فەرهەنگیی کوردستانیش بوو بێت، بۆ نووسەر واباش بوو بینیووسیایە»باشووری کوردستان» گەر باشووریش ڕاست بێت ! نەک هەرێمی کوردستان، چونکە لەگەڵ قۆناغەکەشدا نزیکایەتیەکی زیاتری هەبوو، لەڕووی داکەوتەی سیاسیی و دەستووریشەوە لەوکاتانەدا شتێک نەبووە ناوی هەرێمی کوردستان بێت.

تایبەت بەو گۆڤار و ڕۆژنامانەش لەم بەشەدا هاتووە سەرەتا هەندێک لەو نموونانە وەردەگرم بریتین لە گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوە ئیسلامییەکانی پێش ڕاپەڕین، پێویستە بەرلەباسکردنیان هێما



پرسیار لەنووسەری ئەم پەرتووکە دەکەم ئایا هۆکاری چییە لابردنی ناوی سورەت و ژمارەی ئایەت و ناونیشانەکانیان؟ ئەمە لەکام پێودانگە زانستیی و ئەکادیمییەکانی نووسینی توێژینەوەی زانستیدا جێی دەبێتەوە؟!.

بۆ ئەوە بکەم کاتێک ناوەرۆکی هەریەکە لەمانە دەخوێنیتەوە و بەراوردیان دەکەیت لەگەڵ ناوەرۆکی کتێبی «ڕۆژنامەنووسی ئیسلامی ١٩٨٢ - ١٩٩١» هەژار حاتەم کەلەساڵی ٢٠٠٥ دا چاپکراوە ڕووبەڕێک وردەکارییەکانی یان کۆپیکراوی ناو ئەو کتێبە یاخود تەواوی ناوەرۆک و زانیارییەکان لەوێوە گواستراونەتەوە بەبێ ئەوەی لەم بەشەدا بۆ یەک جاریش بووە مامۆستا بەهادین ئاماژە بەو سەرچاوەیە بکات.

## ئاسۆی ئیسلام

مامۆستا بەمشێوەیە باسی ئەم گۆڤارەی کردووە»گۆڤارێکی مانگانەی سیاسی بووە لەلایەن مەکتەبی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانەوە لەشاخ دەرچووە.

هەموو ژمارەکانی پێش ڕاپەڕین دەرچووەو شەهیدی ئەندازیار (ئازاد بەرزنجی) ئەندامی سەرکردایەتی و بەرپرسی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستان سەرنووسەری بووە کە ساڵی ١٩٨٧ بەبۆردومانی فڕۆکەکانی ڕژێم لەدەوروبەری خورماڵ شەهید بووە.

سەرجەم (٥) ژمارەی لێ دەرچووە، ژمارە(١) لەساڵی (١٩٨٤ ) و ژمارە (٥) لەساڵی (١٩٨٦) و دواژمارەی (٦) کە دەستنووس بووەو ئامادەی چاپکردن بووە بەهۆی بۆردومانی ناوچەکە لەلایەن ڕژێمەوە لەساڵی(١٩٨٧) و دواتر شەهیدبوونی سەرنووسەرەکەیەوە هەروا بەدەستنووسی ماوەتەوە و چاپ نەکراوە».

ڕاستکردنەوەی ئەم زانیارییانە زۆری دەوێت، ناچارم بەمشێوەیە بۆی ڕاست بکەمەوە:

١- گۆڤارەکە مانگانە نەبووە و بەشێوەی (خولیی) دەرچووە، هاوکات تەنها سیاسیی نەبووە، بەڵکو لەڕووپەڕی بەرگی یەکەمی نووسراوە «گۆڤارێکی ئیسلامیی ڕامیارییە نووسینگەی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق دەری دەکات».

٢- شەهید ئازاد بەرزنجی بەر لە دەرچوونی ژمارە (١)ی ئامادەکردووە و تەنانەت سەروتارەکەشی نووسیوە، بەرلەوەی چاپی بکات شەهید بووە، واتە لەو ژمارانەی دواتر دەرچووە ناوبراو سەرنووسەری نەبووە، نەک ئەوەش بەڵکو تەواوی ژمارەکانی سەرنووسەرێکی دیاریکراوی نەبووە، ئەوەی هەبووە تەنها ستافێکی نووسین و کارگێڕیی بووە و پێکەوە کاروبارەکانیان بەڕێوە بردووە، هەروەکو لەکتێبی «ئاسۆی ئیسلام» تەواوی ئەو وردەکارییانەم لەچوارچێوەی ساغکردنەوەیەکی زانستیدا بڵاوکردووەتەوە.

٣- شەهید ئازاد لەساڵی ١٩٨٧ شەهید نەبووە، بەڵکو لە ١٩٨٥/٣/١٠ شەهیدبووە، لە خورماڵیش شەهید نەبووە، لە مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ دووهاوڕێی تری شەهیدبوون.

٤- سەرجەم (٥) ژمارە نەبووە، بەڵکو (٦) ژمارەی دەرچووە و ئێستا بەچاپکراوی، ژمارە(٦) یشی بەردەستە نەک دەستنووس.

٥- ساڵی ١٩٨٤ دەرنەچووە و لەدوای نیوەی

دووەمی ١٩٨٥ دەرچووە.

هەڵەکان زۆرن و ڕاستکردنەوەکانیش بە هەمانشێواز، مامۆستا بەهادین بۆئەوەی دووچاری ئەم هەڵە گەورانە نەبووایە من نوسخەیەک لەتوێژینەوەکەی خۆمم بەدیاری بۆناردبوو سەبارەت بەگۆڤاری»ئاسۆی ئیسلام« دەیتوانی کەمێک کاتی خۆی بداتێ و تەواوی ئەو وردەکارییانەی پەیوەست بوو بەم گۆڤارەوە لەوێوە وەربگرتایە. نووسەر هاتووە تەواوی زانیارییەکانی ئەم گۆڤارە لەکتێبی «ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامی ١٩٨٢ ـ ١٩٩١» لاپەڕە ٤٤ ـ ٤٥ وەرگرتووە و ئاماژەی بەسەرچاوەکەشی نەکردووە.

## گۆڤاری ئاڵای ئیسلام

باسی ئەم گۆڤارە بەمشێوەیە هاتووە «یەکەم ژمارەی لەساڵی ١٩٨٦ دەرچووە»، لێرەدا دوو هەڵەی تێدایە:

١، ئەم گۆڤارە ژمارەی لەسەرنەبووە بەشێوەی زنجیرەیی بەدوای یەکداهاتن، بەڵکو ژمارەکان بەپێی ساڵەکان لەناویاندا دەرچووە، واتە ئەوانەی دەرچوون لەماوەی ساڵەکەدا دیاریکراون تەنها ژمارەکانی ناو ساڵەکانە و هیچی دی.

٢ـ ساڵی ١٩٨٦ یەک ژمارە نییە وەک ئاماژەی پێکراوە، بەڵکو تەنیا لەو ساڵەدا چوارجار چوار ژمارەی لێدەرچووە لە چوار مێژووی جیاوازدا کە سێ مانگیان دیارەو لەبەردەستدایە، بەڵام دانەیەکیان تائێستا ونە، ئەوانەی کە بەردەستن بریتین لە مانگەکانی (٧ و١٠ و١٢) ئەوەشیان کە نادیارە لەنێوان مانگی (٧و١٠) دایە.

## گۆڤاری ڕاپەڕین

ئەم گۆڤارەش زانیارییەکانی بە هەمانشێوە لەکتێبی «ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لە کوردتانی عێراق ١٩٨٢ ـ ١٩٩١» لاپەڕە ٦٨ وەرگیراوە و ئاماژە بەسەرچاوەکەی نەکراوە.

## گۆڤاری مەشخەڵ

بەمشێوەیە نووسراوە»گۆڤارێکی مانگانەی ئیسلامی بووە لە هەندەران دەرچووە، ژمارە(١) لە ساڵی(١٩٨٧)و ژمارە(٢) ی لەمانگی گوڵانی هەمان ساڵ دەرچووە.

١ـ کەم وکورتی ناساندنی ئەم گۆڤارە لەوەدایە نەناسێنراوە، تەنها بەخستنە ڕوویەکی سادە لە کۆڵکراوەتەوە، لەکاتێکدا ئەم گۆڤارە گۆڤارێکی ئیسلامیی گشتیی بووە و یەکێتی قوتابیان و لاوانی ئیسلامیی دەریکردووە.

٢ـ مامۆستا نووسیویەتی ژمارە (٢) یشی لەمانگی گوڵانی هەمان ساڵ دەرچووە، ڕاستییەکەی بەمشێوەیە کە ژمارە (٢)ی لە بەهاری ساڵی ١٩٩٢ دەرچووە نەک ١٩٨٧، تائێستاش لەزۆربەی کتێبخانەی ڕۆشنبیرە ئیسلامییەکانی کوردستان نوسخەی هەیە.




ژمارە (٢)ی گۆڤاری مەشخەڵ، ١٩٩٢

## گۆڤاری بانگی ڕاستی

تەواوی زانیارییەکانی وەرگیراوی هەمان زانیاری ناو کتێبی «ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لە کوردتانی عێراق ١٩٨٢ - ١٩٩١» ە، ل١٢٢.

لێرەدا هەریەک لە گۆڤارەکانی «دەنگی باوەڕ، النفیر، الصف، بانگەواز، هەڵەبجە، شهدا، بانگی غەریب، بانگی حەق، جودی، گزنگ» ئیزافەیەکیان تیا نییە بۆ گۆڤارەکانی پێش ڕاپەڕین و بەبەراوردکردنیان لەگەڵ وردەکارییەکانی ناو کتێبی »ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی ١٩٨٢ - ١٩٩١»ی توێژەر هەژارحاتەم و جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە جگە لە لێکچوون و وەکو یەک بوونێکی دووبارەکراوە بەبێ ناوهێنانی ئەو سەرچاوەیەی لێی وەرگیراوە.

## چەند نموونەیەك لە گۆڤارو ڕۆژنامە و بڵاوکراوە ئیسلامییەکانی دوای ڕاپەڕین

بەسەرنجدان و خوێندنەوەی ئەو زانیارییانەی لە خاڵی دووەمی بەشی سێیەمی نووسینەکەدا هاتووە سەبارەت بە گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی دوای ڕاپەڕین کە بۆ ساڵی ٢٠٢٠ چاپکراوە بەدەر لەوەی هەڵەیەکی زۆر لە گواستنەوەی زانیارییەکان هەیە، لەمەش وێرانتر دەربڕینەکانی نووسەر کۆنن و کۆپیکراوی زەمەنێکی ڕابردوون، تەنانەت مامۆستا لەم چاپە نوێیەدا سەیری نەکردوون و پێداچوونەوەیەکی گشتی نە لەڕووی دارشتن و زمانەوانیی و یەکێتیی نووسینەوە - کە فۆرمێکی ستانداردیان هەبێت — کردووە و نە توانیویەتی دەربڕینی زەمەنەکان بگۆڕێت، بۆیە لەزۆر شوێندا بۆ هەندێک لەو ڕۆژنامانە دەڵێت»بەردەوامە لە دەرچوون» لەکاتێکدا تێیاندایە زیاد لەماوەی هەشت ساڵە وەستاوە، لەنموونەی ڕۆژنامەی کۆمەڵ کە لە ٢٠١٢/٢/١٤ ەوە دەرناچێت، پاشان ئاماژە بەوەکراوە کە (٤٠٠) ژمارەی لێدەرچووە لەکاتێکدا کۆتا ژمارەی ڕۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە(٥١٠) یە، ڕۆژنامەی یەکگرتوو ماوەی پێنج ساڵە وەستاوە!!

## ڕۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی

ئەوەی لەم کتێبە نووسراوە سەبارەت بەم ڕۆژنامەیە بۆ خوێنەر دەڵێت» ژمارەی یەکەمی لە ١٩٩٢/٤/١١ دەرچووە و تاوەکوو ئێستاش بەردەوامە لە دەرچوون، ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ڕۆژنامەی (باسک) کە کورتکراوەی بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانە.

ڕاستیەکەی بەمشێوەیەیە: ژمارەی (سفر)ی لەو مێژووەدا دەرچووە، ژمارە (١)ی لە ١٩٩٢/٤/٢٦ دەرچووە، بە دروستبوونی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی کوردستان ئەو ڕۆژنامەیەش وەستاو کۆتایی هات، دواتر لەگەڵ ڕۆژنامەی (ڕاپەڕین) لەژێر ناوێکی نوێدا کۆبوونەوە بەناوی (ڕێگای یەکبوون) لە ١٩٩٩/٨/٢١ دەرچووە، پاشان لەدوای دروستبوونی کێشە ناوخۆییەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی ئەم ڕۆژنامەیە تاوەکو ژمارە(٧٨) ی دەرچووبوو، لەژمارە (٧٩) بەدواوە ستافێکی دیکە دەریانکردەوە بە هەمان ناوەوە تاوەکوو ژمارە (١٠٧)، ئیدی لەژمارە (١٠٨) ەوە جارێکی دی «بزووتنەوەی ئیسلامی» دەرچوو، هەروەک چۆن حزبەکە جارێکی دی خۆی ڕاگەیاندەوە لەدوای هەڵوەشاندنەوەی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، لێرەوە تاوەکوو ژمارە (٣٣٦) بە ناوی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە دەرچوو، پاشان کاتێک «د. موحەممەد بازیانی» بووبە بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندنی ئەو حزبە ناوەکەی لە٢٠٠٩/٣/١٠ ەوە گۆڕی بە (باسک) کە دەکاتە ژمارە (٣٣٧)، ئیدی ئەم ژمارەیە بەردەوام بوو تاوەکوو ساڵی ٢٠١٢ کە ژمارە (٥٠٠) یشی تێپەڕاندو هەر لەوساڵەدا وەستا. ئەمە ڕاستیی و دروستیی و بەڵگەنامەیی ئەو ڕۆژنامانەن کە مامۆستا بە هادین لە ٢٠٢٠ دا دەڵێت تاوەکو ئێستا بەردەوامن لەدەرچوون.



ئەم هەوڵە بچووکەم دەروازەیەکە بۆ تەواوکاریی ناو باسێك کە سێکوچکەی (زانست و تەکنیك و ناوەرۆك) ئیشی تیادەکات و ویژدانی مرۆیی و ئاکاری ئیسلامییش خەمی ناو پرۆسەکەن لەپێناو گەیاندنی پەیامێکی ئامانجداردا.

## رۆژنامەی رابوون

لەم پەرتووکەدا بەمشێوەیە باسکراوە «مانگانەیەکی ئیسلامی گشتی بووە لەلایەن پەیوەندی ئیسلامی خوێندکارانی کوردستانەوە لە هەولێر دەرچووە، سەرنووسەری (شاخەوان قادر) و دواتر (دلۆڤان جەمیل) بوون، یەکەم ژمارەی لە رۆژی (١٩٩١/٣/١) و دواژمارەی (٤٤) ی لەساڵی ١٩٩٧ دەرچووە».

**راستی و دروستیی زانیارییەکان بۆ ئەم رۆژنامەیە بەمشێوەیەیە:**

١- لەلایەن پەیوەندیی ئیسلامیی خوێندکاران و لاوانی کوردستانەوە دەرچووە نەک تەنها پەیوەندیی ئیسلامیی خوێندکارانی کوردستان، بەڵگەش ئەوەیە لەسەر رووپەڕی رۆژنامەکە بەوشێوەیە نووسراوە کە هەڵگری ناوی رێکخراوەکەیە.

٢- ژمارەکانی(سفر)ی ئەزموونی و (١و ٢ و ٨ و ٩)ی ناوی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری لەسەر نەبووە، ژمارەکانی (٣و٤) یاسین عەزیز خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر بووە، ژمارەکانی(٤و٥و٦و٧) یاسین عەزیز خاوەنی ئیمتیازبووە، ئیبراهیم عومەر سادق سەرنووسەر بووە، لەژمارەکانی (١٠و١١و١٢و١٣و١٤و١٥) یاسین عەزیز خاوەنی ئیمتیاز و شاخەوان حەسەن قادر ناوێکی خوازراو بووە بۆ سەرنووسەر، لە ژمارە(١٦ - ٤٤) ئیبراهیم مەلازادە خاوەن ئیمتیاز و دلۆڤان جەمیل ناوێکی خوازراوی سەرنووسەر بووە، بەڵام عەبدولجەلیل حەمەزیاد زیاتر ئەرکی سەرنووسەری دەبینی، لە کۆتا ژمارەشدا کە دوای ژمارە(٤٤)ە و تایبەتە کامەران بابان زادە خاوەن ئیمتیاز و عەبدورەحمان ئەحمەد ناسراو بە (د. خاڵس) سەرنووسەر بووە.

## پەیامی ئیصلاح

لە کتێبەکەدا بەمشێوەیە نووسراوە»ژمارە (١) لە مانگی تشرینی دووەمی (١٩٩٥) لەشاری سلێمانی دەرچووەو تەنیا ئەم ژمارەی لێ دەرچووە».

گۆڤاری ئیصلاح لە نووسینەکەی مامۆستا بەهادین وا باسکراوە کە تەنها ژمارە(١) ی دەرچووە، لەڕاستیدا ژمارە(٢)یشی دەرچووە و بەردەستە و ئێستا لە ئەرشیفی زۆر لە رۆشنبیرە ئیسلامییەکان دەست دەکەوێت کە مێژووەکەی حوزەیرانی ١٩٩٦ ی زایینیە بەرامبەر بە موحەرڕەمی ١٤١٧ی کۆچی.




ژمارە (٢)ی گۆڤاری پەیامی ئیسلاح



پێویستە خۆمان لەو ڕاستییە نەبوێرین کە ئەوەی ئەمڕۆ لەزانکۆو بەشێك لەناوەندە ئەکادیمییەکانی هەرێمی کوردستاندا دەگوزەرێت جگە لەکارەساتێك بۆ زانست و بارگرانییەك لەسەرشانی ئەو ناوەندانە هیچی دی نییە.

## بڵاوکراوەی پەیام

بەمشێوەیە لە پەرتووکی (دەربارەی میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان) نووسراوە «بڵاوکراوەیەکی پەروەردەیی ڕۆشنبیری گشتییە، ڕێکخراوی پەیامی ڕۆشنبیری دەریدەکات» و ئەم ڕێکخراوە سەربە کۆمەڵی ئیسلامییە. بۆ ڕاستکردنەوەی زانیاریی و وردەکاریی ئەم گۆڤارە پێویستە بەمشێوەیە خوێنەر بزانێت کە: ڕێکخراوی پەیامی ڕۆشنبیری جگە لەناوێک لەم نووسینەدا بیستراوەو باسکراوە هیچ بوونێکی نییەو کۆمەڵیش ڕێکخراوێکی نەبووە تاوەکوو ئەمڕۆ بەو ناوەوە.

سەبارەت بە خودی گۆڤارەکەش ژمارە(سفر)ی لەساڵی ١٩٩٦ بەناوی «قەڵەم» ەوە دەرچووە کەدەستەیەک لە مامۆستایانی ئیسلامیی لە هەولێر دەریانکردووە، لە ژمارە(١١)ەوە لەئازاری ١٩٩٩دا ناوەکەی دەبێتە «پەیامی قەڵەم»و ناوی ئەو دەستەی مامۆستایانەیش کە دەریانکردووە دەگۆڕێت بە پەیوەندی مامۆستایانی ئیسلامی کوردستان، دواتر لەساڵی ١٩٩٩دا لە ژمارە ١٣ و ١٤ دا خاوەندارێتییەکەی بۆ یەکبوونی مامۆستایانی ئیسلامیی کوردستان دەگۆڕدرێت، لە شوباتی ٢٠٠٤ دا ناوەکەی دەگۆڕدرێت و دەبێت بە «پەیامی مامۆستا»و ناوی ڕێکخراوەکەش دەبێت بە یەکێتی مامۆستایانی ئیسلامیی کوردستان.

لە شوباتی ٢٠٠٦ دا لە ژمارە (٢٤)ەوە ناوەکەی بوو بە»پەیام»و بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە، تاوەکو ژمارە (٤٣)ی بەمشێوەیە بەردەوام بووە، لەبەهاری ٢٠١١دا بەتەواوی وەستا، هاوکات «پەیام» وەک گۆڤارێکی مامۆستایان پێناسەکراوەو ژمارەو مێژووی لەسەرنووسراوە، بەڵام لەکتێبەکەی مامۆستا بە بڵاوکراوە ناسێنراوە لەکاتێکدا هەر لە ژمارەکانی سەرەتایەوە مۆڵەتی فەرمی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی هەیە.

ئەوەی لەم بەشەدا بڵاوکراوەتەوە کە زیاد لە حەفتا ڕۆژنامەو گۆڤارە بەشێکی زۆری هەڵەیە و بەبێ زانیارییەکی ورد قسەیان لەسەرکراوە، ئەمەش پەیوەستە بە پشت نەبەستن بە وردەکاریی پێویست و تۆکمەو تێروتەسەل لەسەر ئەسڵی ژمارەکانی ئەو (٧٥) گۆڤار و ڕۆژنامەو بڵاوکراوانەو هەوڵ نەدان بۆ ناسین و دۆزینەوەی ناوی ئەوستاف و بەرپرسانەی دەریانکردوون. کە زۆربەیان بەردەستن و زۆر ئاساییە بەپەیوەندییکردن پێیانەوە زانیاریی درووست و مەیدانیی وەربگیرێت و خۆ لە هەڵەو پەڵەی ناقۆلا بەدوور بگیرێت.

لەکۆتاییدا دەڵێم پێویستە خۆمان لەو ڕاستییە نەبوێرین کە ئەوەی ئەمڕۆ لەزانکۆو بەشێک لەناوەندە ئەکادیمییەکانی هەرێمی کوردستاندا دەگوزەرێت جگە لەکارەساتێک بۆ زانست و بارگرانییەک لەسەرشانی ئەو ناوەندانە هیچی دی نییە، ئەمە نموونەی یەکێکە لەو هەولآنەی کە لە زانکۆکانی هەرێمدا دەدرێن و پلەی زانستی بالایان لەسەر وەردەگیرێت گەر پلەی زانستیشی لەسەر وەرنەگیرێت، هەڵبەتە مشتێکە لەنموونەی ئەو خەرواره مەعریفیی و زانستییەی ناوبراو ئیشی لەسەر کردووە و دەکرێت بەگومانەوە لە گشت نووسین و توێژینەوە ئەکادیمییەکان بڕوانین.

یەکێک لەخاڵە لاوازەکانی ئەم سێ باسەی لەم پەرتووکەدا نووسراوە ئەوەیە کە جگە لەهەندێ لایەنی تیۆریی نەبێت کە دراوەتە دەم یەک، بەکەمیی سەرچاوەی ڕەسەن و گونجاوی تێدا بەکارهاتووە. لاوازییەکی تری ئەم نووسینە –بەدەر لەپلەو ناونیشانی نووسەر– ئەوەیە کە ئەو بەڕێزە بۆ خۆی کاراکتەری ناو هەندێک لەو ناوەندە میدیاییە بووە کە باسی کردووە،

کەموکورتییەکانی وەکو کەسێکە لەدەرەوەی ئەو دەزگایانە و هیچ ڕێگەچارەیەکیشی نەبووە بۆ دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوە تا بگاتە زانیاریی وردو درووست، لەبەر ئەوە تێپەڕینی ئەو هەڵانە بەسەر نووسەردا مایەی گلەیی و سەرزەنشتە. جێگای خۆیەتی ناوەندە زانکۆییەکان و ئەو دەزگایانەی بەناوی ئەکادیمیاوە پلەی زانستیی و ناونیشانی قەبە دەبەخشنە ئەوانەی ناونراون توێژەر لیژنەی تایبەتیی و پسپۆڕیان هەبێت بۆ پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندنی ئەو توێژینەوانەی کە دەنووسرێن، چونکە ئەمانە لە داهاتوودا دەبنە مێژوو یاخود بینای داتاو زانیارییان لەسەر دەکرێت، دیسانەوە بۆ نووسینی توێژینەوەی تر، گەر بەمشێوەیە بڕوات چەند ساڵێکی دی دەبینە خاوەنی فەرهەنگێکی ساختە و ناڕاست چ لەڕووی زانستیی و ئەکادیمییەوە چ لەڕووی ناوەرۆکەوە، لەمانەش ترسناکتر ئەوەیە وا لەقوتابیی و زانستخوازی جدیی زانکۆ دەکات کە متمانەی بەخوێندنەکەی نەمێنێت، کاتێک ببینێت مامۆستاکەی باسی زانستی لەمجۆرە بەرهەم بهێنێت بە کۆمەڵێک ناتەواویی و هەڵەی ناوەرۆک و زانستییەوە.

دەخوازم مامۆستا بەهادین ئەم نووسینە وەک بەشێک لە تەواوکاریی باسەکەی بخوێنێتەوە تا لەچاپێکی تردا ئەو چەند کەم وکوورتیەی دەست نیشانم کردووە لەگەڵ ئەوانەی تردا کە لێرە ماوەی بڵاوبوونەوەیان نەبووە ڕاست بکاتەوە بۆئەوەی خوێنەری کورد بتوانن لێی بەهرەمەندبن.

## سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


١. ئاسۆی ئیسلام، ئۆرگانی ناوەندی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کوردستان، ئارام عەلی سەعید، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٩.
٢. ڕۆژنامەنووسی ئیسلامی لەکوردستانی عێراق ١٩٨٢ -١٩٩١، هەژارحاتەم، چاپی یەکەم، سلێمانی،٢٠٠٥.
٣. ڕابوون، پێشەنگی ڕۆژنامەگەری ئیسلامی تایبەت بە خوێندکاران و قوتابیان لە کوردستان، کامەران بابان زادە، دەستنووس ئامادەیە بۆچاپ.
٤. گۆڤاری ئالای ئسلام،.ژمارەکانی ساڵانی ١٩٨٦ ـ ٢٠٠١
٥. گۆڤاری ئیصلاح، ژمارە٢، حوزەیرانی ١٩٩٦.
٦. گۆڤاری مەشخەڵ، ژمارە ٢، بەهاری ١٩٩٢.
٧. ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە ٥١٠، ٢٠١٢/٢/١٤.
٨. ڕۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ژمارە سفر، ١٩٩٢/٤/١٢.
٩. ڕۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ژمارە ١، ١٩٩٢/٤/٢٦.
١٠. ڕۆژنامەی ڕێگای یەکبوون، ژمارە ١، ١٩٩٩/٨/٢١.
١١. هەمان سەرچاوە، ژمارە ٧٩ ـ ١٠٧.
١٢. ڕۆژنامەی باسک، ژمارە ٣٣٧، ٢٠٠٩/٣/١٠.
١٣. بڵاوکراوەی قەڵەم، ژمارە سفر، ١٩٩٦.
١٤. پەیامی قەڵەم، ژمارە ١١، ئازاری ١٩٩٩.
١٥. هەمان سەرچاوە، ژمارە ١٣ و١٤، ١٩٩٩.
١٦. پەیامی مامۆستا، ژمارە ١٨، شوباتی ٢٠٠٤.
١٧. گۆڤاری پەیام، ژمارە ٢٤، شوباتی ٢٠٠٦.
١٨. هەمان سەرچاوە، ژمارە ٤٣، بەهاری ٢٠١١.

لەوەتی بەدیهێنەری حەکیم مرۆڤی هێناوەتە سەرزەوی جەنگ و ململانێ لە نێوان عەقڵ و ئارەزوودا، لەنێوان فیترەت و هەوەستدا، لەنێوان زانین و جەهلدا دەستیپێکردوە، زۆربەی ئەودوانەییانەی کە بۆ مرۆڤ نیمچە ئەزەلین و پێکەوە شێلراون بەو نەفسەوە کە بەدیهێنەر دروستیکردوە، لە لایەک نهێنی تاقیکردنەوەی مرۆڤن و لە لایەک کەرەسەی ئازادی و موخەییەرین بۆ مرۆڤ.

## چیرۆکی حەقیقەت لای کێیە؟

ئەم چیرۆکە لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە مرۆڤەکان لەسەرەتای ژیانەوە یەک دەستەو یەک ئوممەت و یەک دونیابینی و لەیەک جێگاو جوگرافیا بوون، بەڵام کە زۆربوون و گەشەیان کردو بڵاوبونەوەو ژیان گۆڕا و لەیەک دوورکەوتنەوە، جیاوازی بیروڕا و پاشان بیروباوەڕ و دواتر دونیابینی و پاشتر بەڕێوەبردنی ناوچەی جیاواز، کە ئەمانە سەریان هەڵداو دروست بوون ئیتر سەرەتای حەقیقەت چییە و لای کێیە دروست بوو، وردە وردە تەشەنەی کردو بۆ کۆنترۆڵکردن و لانیکەمی مانەوە لەسەر یەکتاپەرستی و فیترەت بەدیهێنەر پەیوەندی دەکاتەوە بەزەویەوە بەپێی پێویست و زەمان و مەکان پەیام و پەیامنێر دەنێرێت، لەقۆناغێکیتردا مرۆڤ زیاتر گەشە دەکات و تام و چێژ لەدروستکراوەکانی سەرزەوی دەبینێت و چاوکرانەوە و دونیابینی زیاتر دەگۆڕێت و دەسەڵات و پاوەنخوازی سەرهەڵدەدات، جیاوازی و ناکۆکی و شەڕ سەرهەڵدەدات، کێ لەسەرحەقەو کێ ناحەقە دەستپێدەکات، لەلایەک عەقڵی مرۆڤ و خواستەکانی پەرەدەسێنێت و لەلایەک ناکۆکیەکان قووڵ دەبنەوە، بۆیە خوای گەورە بەپێی پێویست بەردەوام پەیام و پەیامبەر دەنێرێت بۆ راستکردنەوە و دورکەوتنەوە لەشەڕ و فەساد و تەماعکاری و خوود پەسەندی، تاوای لێدێت لەیەک کاتدا چەند پێغەمبەرێک لەسەر زەویدا پێکەوە هەبوون، بۆ نمونە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەربێت) لە ناوچەیەک پێغەمبەر بوە، لەهەمان کاتدا (لوط) (سەلامی خوای لەسەربێت) لەناو چەیەکی دیکە و بۆ قومێکی دیکە بووە، پاش ئەوان بەماوەیەک یەعقوب (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە ناوچەیەکی عەرەب نشین بووە، یوسفی کوڕی (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە میسر پێغەمبەر بوە،.. هتد، لەنێوان حەزرەتی موسی و حەزرەتی عیسی (١٢) پێغەمبەری دیکە هاتوون بۆ ڕێپیشاندان و راستکردنەوەی مرۆڤ و هەندێکیان شەهیدکراون.

پێش هاتنی حەزرەتی عیسی بەچەند سەدەیەک فەلسەفە سەرهەڵدەدات، سەردەمی دەوڵەت و دام و دەزگایە، بابەتی حیکمەت و حەق و حەقیقەت و ماف و دەستکەوت و دەسەڵات و پۆلێنکردنی مرۆڤەکان دەبێتە سیستمی حوکمرانی و زیاتر قووڵ دەبێتەوە، سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ دەبنە جێگای بایەخ و گرنگیدانی زیاتری دەسەلاتداران و خەڵکی بەگشتی، تائێستاش کاریگەریان هەیە و هەر ماوە.

بەهاتنی حەزرەتی مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) گۆڕانکاریەکی گەورە و قووڵ و شۆرشێکی گەورەی هەمەلایەنە دەستپێدەکات، گۆمی فیکر و فەلسەفە دەشڵەژێنێت و پێناسەی حەق و حەقیقەت حیکمەت و زانست و سەرچاوەی ئەسڵی بوون و زانست و نەخۆشی و چاکبوونەوەو مردن و زیندووبونەوە سەرلەنوێ دەکاتەوە، خۆی وەک ئادەم لەدایک دەبێت، بەکۆرپەیی قسە دەکات و شایەتی بۆ حەق و پاکی دەدات، گەورە دەبێت، بە ئیزنی خوا نەخۆش و کوێرو سەقەت چاک دەکاتەوە، مردوو زیندوو دەکاتەوە، بەرهەڵستی لەهەژار و مەزڵووم دەکات و بەرابنەر بە زووڵم و فەساد و چەواشەکاری دەوەستێتەوە، ناڕەوایی و عەیب و درۆ و دەلەسەی ئەوکەسانە ڕووندەکاتەوە کە بەناوی خوا و ئاسمان و ئایینەوە دونیا دەخۆن و خەڵک فریو دەدەن، بۆیە دواجار دەسەڵاتداران و کاهینان یەکدەگرن و بڕیاری کوشتنی دەدەن، خوای گەورەش ئەو بەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان، ئەوانیش

کەسێک پەیدا دەکەن و دەیکوژن و ڕایدەگەنن کە عیسایان لە خاچداوە، دەشزانن ئەو نییە، بەڵام بۆ پەردەپۆشکردنی دۆڕان و بێ ئابروویەکەیان ڕایانگەیاند کە عیسایان کوشت، بۆ ئەوەی لەوە زیاتر حەق و حەقیقەت نەشوێنێت و خەڵک گومڕا نەکات، ئەو فاسد و گومڕایانە هیچ هەڵە و ناڕاستیەکیان لە عیسی نەبینی و نەیاندەتوانی تەنها یەک بەڵگە و قسەی ڕاستی خۆشیان بخەنە ڕوو، بەڵام لەپاڵ ئیدعای حەق و پاراستنی حەقدا هەموورێگایەکیان دەگرتەبەر بۆ ئەوەی بانگەوازی ئیسلاحخوازی و یەکتاپەرستی و عەدالەتخوازی یەکسانی مرۆڤەکانی عیسی پەرە نەسەنێت و دەسەڵات و هەواو ئارەزووەکانی ئەو فاسیدانە کەم نەکات و لەناو نەچێت و کێشەو قەیرانی گەورەی بۆ دروست نەبێت.

پێش ئەوەی فەلسەفە گەشە بکات و بڵاوبێتەوە، (١٥٠٠) ساڵ پێش لەدایک بوونی مەسیح لەئێرانەوە بیروباوەڕێکی نوێ سەرهەڵدەدات، ئەویش ئایینی دوانەییە، واتە دوو خودا لەیەک کاتدا، خودای خێر و خودای شەڕ، دواتر لەسەردەمی زەردەشتدا پەرە دەسەنێت و ڕێز دەگیرێت لە ئاگر و ئاو و گڵ و هەوا، پاشان لەسەردەمی دەسەڵاتدار و ئیمپراتۆرەکانی ئێراندا ئاگر زیاتر بایەخی پێدەدرێت و تەقدیس دەکرێت، جێگای ئاین و فەلسەفە دەگرێتەوە، دەبێتە حەق و حەقیقەتی ڕەها، بۆ هەموو ڕزق و ڕۆزی و نەخۆشی شەڕەکان پەنای بۆدەبەن، چەندەها شیعرو شانامە و چیرۆک و ئەفسانە بۆ ئاگر دروست دەکەن، عەقڵ و خەیاڵدانی خەڵکی پێ پڕ و سیخناخ دەکەن، بەتایبەت کاتێک کە دەسەڵاتدارەکان توانیان قەناعەت بەخەڵک بکەن کە ئاگری پیرۆز پاڵپشتی دەسەڵاتەکانیانە، ئەم حاڵەتەی ئێران درێژە دەکێشێت تاساڵی ٢٢٤-٢٤٢ کە ئەردەشێری کوڕی بابک کۆتایی دێنێت بە سەردەمی حوکمرانی پارسەکان و دەسەڵاتی نوێی ساسانی خۆی ڕادەگەیەنێک، بە میتۆد و بەرنامەو فەلسەفەو دەستورێکی نوێوە کە ناوی ناوە عەهدی ئەردەشیر و دەسەڵات و بیروباوەری دوو خوایی لەئاسمانەوە دێنێتە سەرزەوی، خوای حوکمڕانی سیاسی و دەسەڵاتی عەسکەری و دارایی و ژیان و بژێوی قەڵەمرەوی ئیمپراتۆریەتەکەی دەداتە خۆی، هەرکەس کە جێگرەوەی دەبێت و جێگرەوەکەش پێش مردنی خۆی دیاریدەکات و هەرکەسێک لە کوڕ و کەسە نزیکەکانی کە گومانی هەبێت لێیان کە پاش خۆی داوای دەسەڵات دەکەن هەموویان دەکوژێت و ڕایدەگەیەنێت بۆ پاراستنی دەسەڵاتی موقەددەس ئەو کارە دەکات، شایانی باسە عەهدی ئەردەشیر ئەوەندە بەپێز و بەووردی نوسراوە هەموو دەسەڵاتدارێکی کۆن و نوێ شەیدای بوون و زۆربەی دەسەڵاتدارە کۆنەکان لەبەریانکردوە، لەدەستووری عەهدی ئەردەشیردا حەق و حەقیقەت پاوانکراوەو ڕێگا بەهیچ کەسێک نادات لەپیاوان ئایین و ئەهلی حیکمەت و خوێندەواران لەسنووری ماددە و بڕگەکانی دەرچن. (٦١٠) ساڵ پێش دابەزینی دوا پەیامی ئاسمان بۆسەرزەوی بۆ کۆتایی هێنان بە وەحی و سەردەمی پێغەمبەرایەتی، بارودۆخی مرۆڤایەتی و جەدەلی حەق و حەقیقەت لای کێیە و کام ئایین ڕاست و ئەسڵەکەیە و کام فەلسەفە و حیکمەت دروستە و پێکاوێتی، کام مەدرەسە ڕێگا ڕاستەکەی دۆزیورتەوە؟ چۆن دەکرێت زەوی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەئاسمانەوە هەبێت و ئاسمان قسە و بڕیار و هەڵوێستی هەبێت لەسەر زەوی؟ ئەم پرسیارانەو چەندەهای دیکە لەهەناوی چەند سەنتەرێکی دەسەڵات و ئایین و ئیمپراتۆریەتدا دەکولا و پێوەی سەرقاڵ بوو،ن کەمێکی زۆر کەمیان دەیانویست بگەنە حەق و حەقیقەت، زۆرینەشیان هەرکەس بۆمەرامێک بەکاریان دەهێنا، دەسەڵاتدار بۆ بەردەوامی دەسەڵاتەکەی و داگیرکاریی زیاتر، خەڵکی دیکەش وەک پەناگا یان ناچاریی یان نەزانی و خۆیان دابوو بەدەستەوە.

قورئان لە (٦١٠) زاینیدا دێتە خوارەوە، بە

«إقرأ» دەست پێدەکات، بە باسی زانست و قەڵەم و بەدیهێنان و مرۆڤ و بەدیهێنەر لەدەرگای عەقڵ و بیرکردنەوەی مرۆڤ دەدات، جگە لە خوای بەدیهێنەر و زانست و بیرکردنەوە و مرۆڤ و گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ لای بەدیهێنەرەکەی ئاماژە بەهیچی دیکە ناکات، لەسەرەتاوە باسی هیچ ئایین و دەسەڵات و فەلسەفەیەک ناکات، سورەتی (إقرأ) وەک کلیلی هەموو ئاماژەکانی قورئان دادەبەزێنێت، پاشان لەماوەی (٢٣) ساڵدا و بەشێوەیەکی تەدریجی زەمانی و مەکانی و لەگەڵ ڕوداوەکاندا و بەپێی پێداویستی، هەموو قورئان دێتە خوارەوە..

بۆ چارەسەر و وەڵامی حەق و حەقیقەت میتۆدێکی حەکیمانە و ڕوونی گرتوەتە بەر و بە مەنتیقێکی واقیعی مرۆڤ دەدوێنێت، سەرەتا هەموو مرۆڤەکان ئازاد دەکات لەهەڵبژاردنی بیرو باوەردا، پاشان لە بتەکان دەدات و دەڵێت ئەوانە لەئێوە کەم بایەختر و کەم بەهاترن، حەیفە ئێوە بیانپەرستن، پاشان دێت بەمرۆڤ دەڵێت زەوی و مانگ و خۆر و ئاسمانەکان و هەرچی تێدایە بۆ خزمەتی تۆ دروستکراوە و ملکەچی بەکارهێنانی تۆیە و تۆ گەورە و سەییدی ئەم بوونەوەرەیت، بۆئەوەی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو قەناعەت و حەق و حەقیقەتەی کە هەرچی پێشتر ناونراون لەلایەن خوداوە درەستکراون و لە خودی مرۆڤ کەمترو کەم بایەخترن، دوای ئەو قۆناغە زۆر بەڕوونی و بەحیکمەت و لە هەناوی کۆمەڵێک چیرۆک و بەسەرهاتی سەرنجراکێشدا باسی ئایینە ئاسمانیەکان دەکات، ناوی (٢٥) پێغەمبەر دێنێ و حەق و حەقیقەت بۆ پەیامەکانیان ڕادەگەنێت، پەیامی هەندێکیان زۆر بەووردی ڕۆشن دەکاتەوە، بەتایبەت پێغەمبەرانی وەک: نوح و ئیبراهیم و یوسف و موسا و عیسا و محەمەد (سەلامی خوایان لەسەربێت)، لەم پێغەمبەرانە سیانیان سەنتەری کێشەو مشتومڕی باسی حەق و حەقیقەت بوون لای زۆرینەی مرۆڤایەتی، ئەوانیش: ئیبراهیم و موسا و عیسا بوون (سەلامی خوسیان لەسەربێت)، بۆ چارەسەری ئەومشتو مڕە و وشککردنی فێڵ و تەڵەکەو چەواشەکاریەکانی ئەوانەی لەپشتی ئەو مشتومڕە نارەوایانەوە بوون، قورئان زۆرترین پانتایی پێداوون و بەرهەڵستکاریەکی توند و ڕۆشنیان لێ دەکات، بۆ ئیبراهیم دەڵێت: (ملة أبيكم إبراهيم)، واتە هەمووتان شوێن عەقیدەی یەکتاپەرستی ئیبراهیم بکەون، بۆ تەورات و ئینجیل بەمیتۆدکی قسەبڕ و ڕۆشن ئایەت دەنێرێت و پێناسەی هەردوکیان وەک پێناسەی قورئان دەکات و دەڵێت: ( هدى ونور)، (هدی و نوور) کە پێناسەی تەورات و ئینجیل و قورئان خۆیەتی ئاماژەیە بەوەی هەرسێکیان وەک یەک لەسەر حەق و حەقیقەتن و پاشان بەشێکی زۆر لەئایەتەکانی تەوارات و ئینجیل لەقورئاندا جێگیر دەکاتەوە.

بۆ وەڵامی فەلسەفەو عەقڵ و حیکمەت و هاوکاری فەیلەسوفەکانیش، بەشێکی زۆر لەئایەتەکان سەبارەت بە عەقڵ و ئیشپێکردنی هاتوەتە خوارەوە، لەچەند جێگای جیاوازدا باسی حیکمەت هاتوە و بەجیا لە قورئاندا ناوی هێناوە، ئایەتەکانیش هەندێکیان بۆ ڕاستکردنەوە میتودی بەکارهێنانی عەقڵە، بەشە زۆرەکەشی بۆ ئیشپێکردنی عەقڵە، کە ئەوە خەمی گەورەی فەیلەسوفەکان بووە.

دواجار قورئان کە فەرمودە و کەلامی بەدیهێنەری مرۆڤە خۆی دەزانێت چی و کێی دروستکردوە، زۆر بەرۆشنی بەپێغەمبەر و ئوممەتەکەی و هەموو مرۆڤایەتی دەڵێت ئیدیعای حەق و حەقیقەت هەرگیز کۆتایی نایەت، چونکە حەز و هەواو ئارەزوو تێکەڵ بە حەق دەکەن، ئیتر ئیددیعای حەقیقەت دەکەن، بۆ نمونە قورئان دەفەرموێت: ﴿كان الناس أمة واحدة فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾. البقرة ٢١٣

واتە: خەڵک سەرەتا یەک ئوممەت و یەک ئایین و یەک نەتەوەبوون دواتر...

لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾.هود (١١٨، کەواتە بەهەر هۆکارێک هەبێت، ئینکاری، سەرکەشی و عینادی، نەزانین، پێنەگەشتنی حەق و راستی، توندڕەوی، گەیاندنی حەق و حەقیقەت بەڵام بە میتۆدی سەقەت، گەیاندنی حەق بەڵام بەسلوک و ڕەفتاری ناحەق و ناپەسەند، ترسی لەدەستدانی دەسەڵات یان لەدەستدانی خۆشی ئارەزووەکان، هەموو ئەوانە و هاوشێوەکانیان وادەکات کە مرۆڤ لەبەرئەوەی کائینێکە « موخەییەرە و موسەییەر» نییە وەک دروستکراوەکانی دیکە، ئەو جیاوازیە و ئەو پاوانکردنی حەق و حەقیقەتە بەردەوام دەبێت، یان ملنەدان بەق و حەقیقەت بەردەوام دەبێت.

لێرەدا بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێت و هەمیشەش پێویستە بەرە و پێش بڕوات و نەوەستێت و تێکنەچێت و بۆگەن نەکات، بۆ ئەوەی ژینگەی دەروون و سروشت و سیاسەت و بەڕێوەبردن و زانست و مەعریفە، وەک پێداویستی ژیانێکی ئاسایی و سەربەرزانە و شەرەفمەندانە و شیاو بەمرۆڤ و پێگەو بەهای مرۆڤ بەردەوام بێت، بەدیهێنەر یەک پێوەری سەرەکی داناوە کە مرۆڤ پابەند بێت پێوەی، هەموو پێوەرەکانی دیکە خۆیان دروست دەبن و کارا دەبن، چونکە ئەو یەک پێوەرە سەرەکیە هەموو پێوەرەکانی دیکە ڕێکدەخات، ئەوکاتە هەرکەس چۆن خۆی بە خاوەنی حەق دەزانێت و چۆن دڵی خۆی خۆش دەکات و دەڵێت من گەشتووم بەحەقیقەت ئازادە و سەرکەوتووش دەبێت بەئەندازەی پابەند بوونی بەو پێوەر و ڕێسا سەرەکی و گشتییەوە، مادەم (ولا یزالون مختلفین) کەواتە چارەسەر پێوەر و ڕێساکەیە، تا ژیان بەشێوەکی نۆرماڵ بەردەوام بێت و زوڵم و ستەم و ناحەقی بەردەوام نەبێت و قووڵ نەبێتەوە و مرۆڤ پێگەکەی خۆی لەدەست نەدات کە سەنتەربوونیەتی لەسەر زەوی و لەژیان و لەژینگەو لەبوونەوەردا.

ئەو پێوەر و یاسا و ڕێسا گشتییەش بریتیە لە :

(القِسط والعدل) دادپەروەی ئەوچەمکە قووڵ و فراوانەیە کە یەکسانی و تەرازووی ڕاست و دروست و بێ دەستکاری و خەوش و خاڵیش دەگرێتەوە، ئەگەر بمانەوێت زۆر بەکورتی لە مەبەستی عەدالەت و دادپەروەی بگەیەنین، دەتوانین بڵێین ئەو عەدالەتە بریتییە لە :

عەدالەت لە حەقی خوا و بەدیهێنەردا بریتیە لە یەک زاتی تاک و تەنها و بێ شەریک و بێ یارمەتیدەر.

عەدالەت لەحەقی مرۆڤ و ژیان گوزەران و ژینگەدا ، بریتیە لەوەی زوڵم و ستەم و جیاکاریی بەهیچ جۆرە میتودو بەرنامەو پاساوێک نەکرێت، سنووربەزاندن و گەندەڵی ئەنجام نەدرێت، ژینگە لە هەموو جۆرە پیسبونێک بەپاکی ڕاگیرێت.

هەرکەسێک ڕەچاوی عەدالەت و داد پەروەری بکات بەو شێوەیە و باوەڕی پێی هەبێت ڕەفتاری پێبکات ئەوە لەسەر حەقە و گەشتوە بەحەقیقەت و ئیتر دوای باوەڕبوون بەو یاسا و ڕێسایە هەموو ئیددیعاکان ڕێژەیین و سلوک و ڕەفتار دەیسەلمێنێت چەند لە حەق و حەقیقەت نزیک و دووریی هەیە.

(مَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ )١١٧ هود.



# له ئەرشیفەوە



# عەبدولرەحمان ناجم؛ دادوەر، شاعیر، نووسەر و یەکەم بیبیلیۆگرافیانووسی کتێبخانەکانی عوسمانی

هێمن عومەر خۆشناو

دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی پێنج سەد ساڵ حوکمڕانیکردنیدا، کەسایەتیی دیار و کاریگەری هەموو نەتەوەکان لە جومگە سەرەکییەکانی ئەو دەوڵەتەدا بەشدار بوونە. لەنێو ئەو مێژووەدا زۆر کەسایەتیی کورد هەن ڕۆڵی گەورەیان بینیوە، بەڵام مخابن کورد زۆر بەکەمی لەسەر وێستگەکانی ژیانیان وەستاوە و کەم خۆیانی لێ بە خاوەن کردوون، بۆیەشە بەشی زۆریان تورک خۆی لێ بە خاوەن کردوون و لانی کەم نەوەی ئێستای کورد نایانناسێ. یەکێ لەم کەسایەتییانە؛ زانایەکی خەڵکی شاری سلێمانییە و وێڕای نووسەر و زانابییەکەی، لە چەند دەزگایەکی هەستیاری دەوڵەتدا بەرپرسیاریەتیی هەبووە، ئەویش عەبدولڕەحمان ناجم کوڕی محەمەد بەگە، لە میرەکانی سلێمانییە و کەسایەتییەکی ناودار و زانا بووە، لە ١٨٣٣/٥/٩ لە سلێمانی لەدایک بووە، ئەو بە نازناوی مەولان بەگزادەش ناسراوە کە نازناوی بنەماڵەکەیان بووە. لە مەدرەسەکانی سلێمانی و بەغدا خوێندوویەتی و هەر لەوێش ئیجازەی عیلمیی وەرگرتووە. دوای تەواوکردنی خوێندن، چوار پێنج ساڵان لە مەدرەسەکانی بەغدا مودەڕیسایەتیی کردووە. بەگوێرەی تۆماری عوسمانی؛ ئەو بە زمانەکانی تورکی، عەرەبی و فارسی توانیویەتی بخوێنێتەوە و بنووسێت و هەروەها توانای ئاخافتنیشی بە کوردی هەبووە.

پاشان دەچێتە ئەستەنبوڵ و لە ١٨٦١/٧/٨ دەبێتە فەرمانبەر و پشکنەر لە کتێبخانەکانی ئەستەنبوڵ. ئەو یەکەمین کەس بووە کە دەفتەری چاپکراوەکانی عوسمانیی لە کتێبخانەکانی ئەستەنبوڵ پۆلێن کردووە و ڕێک خستووە. ئەو شاعیر، مافپەروەر و زانای ئەدەبیات بووە لە هەر سێ زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی. لە ساڵی ١٨٦٥ بۆتە مامۆستای عوسمانی لە قوتابخانەکانی پاریس و نزیکەی دوو ساڵان لەوێ ماوەتەوە. لە ساڵی ١٨٦٧ دەگەڕێتەوە ئەستەنبوڵ و لە کاری پێشووی خۆی بەردەوام دەبێت. لەو ماوەیەی کە لە ئەستەنبوڵ بووە، وێڕای پشکنەری کتێبخانەکان، بەڕێوەبەری ژمێریاریی چاپخانەی عامیرە و مامۆستای زمانی فارسی لە قوتابخانەی ڕوشدیەی بایەزید و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی وقائع زەبتیە بووە.

لە ساڵی ١٨٧٠دا ناجم کارەکەی دەگوازرێتەوە بۆ مولکیە و دواتر بۆ قائمیقامی لاراندەیەی قۆنیە و دواتر بۆ شام. لەو ماوەیەدا نزیکەی دە ساڵان قائیمقامی قەزاکانی بێکاول عەزیز، لازقیە، حەسبیە و ئەدهەمیە بووە. لە ساڵی ١٨٨٠دا لە حەلەب بۆتە داواکاری گشتیی دادگای ئیستئیناف و نزیکەی سێ ساڵانیش لەنێوان (١٨٨٢-١٨٨٥) لە دیاربەکر وەک سەرۆکی فەرمانگە لەو کارەی بەردەوام بووە.

وێڕای کاری فەرمانبەری، ناجم بەردەوام نووسیویەتی، کتێبی قوتابخانانی ئامادە کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا شیعری هۆنیونەتەوە و لە چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکیش بەبەردەوامی بەرهەمەکانی خۆی بڵاو کردۆتەوە. بەتایبەتی ئەو وتارانەی کە لەسەر ئەدەبیاتی کوردی نووسیونی، زۆر جێگەی سەرنجن. ئەو کاتەی ناوبراو لە دیاربەکر سەرۆکی دادگای ئیستیئناف بووە، مۆسیۆ ترۆتەری کونسوڵی ئینگلیز لە چەند دەڤەرێکی وڵاتی کوردەواری گەڕاوە و لە ئەنجامی ئەو گەڕانەدا ئەوەی لا گەڵاڵە بووە کە کورد خوێندەواریان نییە و میللەتێکی دواکەوتوو و بەجێماون، بۆیە وتارێک بڵاو دەکاتەوە و لە ناوەڕۆکەکەیدا کوردان بە نەفام و جاهیل لەقەڵەم دەدا و ئاماژە بەوە دەدا کورد لە عیلم و پێشکەوتن بێبەشن. ئەم بۆچوونەی ترۆتەر دەبێتە هۆی دڵتەنگی و بێزاریی نووسەر و ڕووناکبیرانی کورد، لەوانە هەر یەک لە کەیفی جوانڕۆیی، عەبدولڕەحمان ناجم و حەسەن زوهدی لە ڕێگەی ڕۆژنامەی «ترجمان حقیقت» هەریەکەیان بەجیا وەڵامی دەدەنەوە.

دوای نووسینەکەی کەیفی، عەبدولڕەحمان ناجمیش وتارێک بە زمانی تورکی بە ناوی «»زانایان

و خەڵکی کورد» لە ڕۆژنامەکە بڵاو دەکاتەوە و سەرتاپای نووسینەکە وەڵامە بۆ ترۆتەر کە ئەمە پوختەکەیەتی:

ئەو وتارەی کە کونسوڵی ئینگلیز بڵاوی کردۆتەوە، دوورە لە ڕاستی و بە ئارەزووی خۆی نووسیویەتی. لەو بارەوە لێکۆڵینەوەکانی کونسوڵ سووک و بێبناغەن، بۆیە دەبێ وەڵامیان بدرێتەوە و ڕاست بکرێنەوە، چونکە کونسوڵ بوختان بە هەموو کوردان دەکات و دەڵێ کورد نەزان و وەحشی و بێ عیلم و عیرفانن، لە حاڵێکدا قەومی نەجیبی کورد بە بەڵگەی ئاشکرا خاوەنی فەزیڵەت و بەرهەمی باش و شوێنەواری زانستین. لە لایەنی عیلم، فەزیڵەت، خۆشنووسی و شاعیریەتییەوە ئەم نەتەوەی کوردە لە نەتەوەکانی تر ناودارترن، لە هەر جۆرە بەرهەمێک بگری، هیی کوردان هەن، لە کتێبخاناندا بەرهەمی وا هەن کە جێی ئیعتیبار و شانازین.

لە بارەی فیقهـ و شەریعەتدا، عیبادەت، موعامەلات، گرێبەستی مارەیی و ماف و سزادان، یاسای دادی، لە ڕووی شەرع و یاسای خوداییەوە و ئەو بابەتانە، بەرهەمگەلی جۆربەجۆر و بێژمار هەن. کورد لەسەر مەتن و دانراوەکانی ئیمامی شافیعی، نەوەوی، ڕافیعی و غەزالی شەرح و حاشیەی بێژماریان نووسیوە و بڵاو کردۆتەوە. شەرح و حاشیەی دانراو و مەنزوومی زانایانی کوردی وەک حەزرەتی مەولانا ئەبو بەکر کە بە ناوی «وضوح»، «أنوار»، «سراج القلوب»، «منقول التفاسير»ی یوسف الاصم، «ذات الشفاء»ی ئیبنولجەزەری، کیفایە و شەرحەکەی، «خیفایە«ی عەللامەی بێتووشی و تەئلیف و مەنزوومەی ئەحمەدی هیی شێخ مەعرووفی بەرزنجی لە مەیدانن. لە سلێمانیدا لە بنەماڵەی بەرزنجی و حەیدەریزادان کەسایەتیی خاوەن زانست و زانیاری و هونەری وەک سیبغەتوڵڵا، ئەحمەد حەیدەر، عەبدوڵڵا ئەفەندی و هیی تر. زانا گەورەکانی کورد لەسەر بابەتەکانی فیقهـ تەفسیر، ئوسوڵ، نەحوو، سەرف، مەنتیق، کەلام، هەندەسە، حیساب، عەرووز، ئەخلاق، ئەدەبیات، مێژوو و هونەر و بابەتی جۆربەجۆر بەرهەمیان نووسیوە و تەسنیف کردووە.

ئەو زانایانە بەو بەرهەمانەیان، کتێبخانەکانی دونیایان نەخشاندووە و ڕووناک کردۆتەوە. دانراوەکانی وەک «شەرحی مەقامات» و «دیوانی حەزرەتی مەولانا شێخ خالیدی سولەیمانی» لەنێو زانایاندا دەست بە دەست نووسراوەتەوە و گەڕێنراوە. ئەو دەنگ و سەدا بڵندانەی عیلم و عیرفان، ڕووناکی و شەوقیان داوەتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە. ئەو تەفتازانییەی کە وەک زانای دووەم حسێب دەکرێ، جەلالی دەوانی و محەمەد فەیزی ئەفەندیی سلێمانی کە ئێستا موفتی بەغدایە، ئایا ئەوانە لە پایەبڵندیی زانایانی کورد نین؟

مەناقیبی زەمان سەیید شێخ عەبدولقادر ئەفەندی کە ئەمڕۆ لە سلێمانیدا خاوەنی تەختە و دەرس دەداتەوە. سەیید کاکەئەحمەد ئەفەندی بەرزنجی، مەولانا ئەحمەد ئەفەندیی نۆتشی، محەمەد بن ڕەسووڵ ئەفەندیی ڕواندزی، عەبدولڕەحمان ئەفەندی ڕۆژبەیانی؛ کەسایەتیی کامل و پڕ زانستن، لە هەر زانستێکدا گەیشتوونەتە پلەیەکی باڵا و لە زوهد و تەقواشەوە لە شوێنپێی ئیمامی غەزالیدان. بە بەرهەم و نووسراوەکانیانەوە لە دوور و نزیک ناسراون، ئایا ئەو کەسە ناودارانە هەموویان زانای کورد نین؟

لە زانا گەورەکانی کورد: ئیمامی جەزەری، یەحیا ئەفەندیی ئامێدی، سەیید عەبدوللەتیف ئەفەندیی شارەزووری، مەولانا عەلیی ئەفەندیی قزڵجی، ئیبن ئادەم و ئیبن حاج و عەللامە ئەربیلی بە قەڵەم و دانراوە زانستییەکانیان وەک هەتاوی ڕۆژێ لە مەیدانن. ئەمڕۆ دانراو و بەرهەمەکانیان لە هەموو کتێبخانەکانی ئیستەنبوڵیشدا هەنە و پارێزراون.

بەهەرحاڵ، دیارە کە زانایانی کورد بە زمانی عەرەبی، فارسی، تورکی و زمانی زگماکیی خۆیان کە کوردییە، هەموو جۆرە بەرهەمێکیان نووسیوە.

لەبەر ئەوەی زمانی کورد زۆر دەوڵەمەندە و شێوەزارەکانیشی ڕەنگینە، گەلێک کتێبی ئەدەبی بە هۆنراوە و پەخشان بە زمانی کوردی نووسراون.

شاعیرانی کورد بە زمانێکی زەلاڵ و ڕەوان و واتادار و شاعیرانە و حەکیمانە، قەسیدە، مەسنەوی، چوارین و شیعری جۆربەجۆریان بە نەزم نووسیون.

زانا و شاعیرەکانی کورد وەک شاعیرانی بەدەویی عەرەب، فارسەکان و زمانپاراوەکانی تورک شیعریان نووسیوە و بەرهەمیان بۆ بەجێ هێشتووین، لەوانە: ناودارانی وەک حەزرەتی شێخ مەولانا خالید، عەللامەی بێتووشی، شێخ مەعرووفی بەرزنجی و شێخ محەمەد فەیزی ئەفەندیی موفتیی بەغدا؛ بە بەرهەمە چاپکراوەکانیان ناسراون.

خەڵکی کورد هەر بەخۆیان نێوانیان خۆشە لەگەڵ زمانی عەرەبی و فارسی، هەندێکیش لەوان بە زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی خوێندوویانە.

عەبدولڕەحمان ناجم لە نووسینە درێژەکەی خۆی بەردەوام دەبێ و دوای ئەو گەنگەشەیە، هەندێک پرسیاران لە کونسوڵی ئینگلیز دەکات و دەڵێت: ئایا کونسوڵ لە سی تا چل مەدرەسەی بچووکی شاری سلێمانی گەڕاوە کە هەموویان پڕن لە فەقێ؟ یان لە مەکتەب و مەدرەسەکانی شاری سنە گەڕاوە؟ ئایا مەدرەسەی پیرۆزی دارولئیحسانی دیوە کە وەک جامیعەی ئەزهەری میسرِ وایە؟ ژوورەکانی ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن، لە شارە دوورەکانەوە فەقێ و خوێندکار بۆ تەواوکردنی زانستەکانیان ڕووی تێ دەکەن. یان مەدرەسەکانی ساوجبلاغ، سەقز، بانە، شنۆ، تەرجان، سەردەشت، نیستان، ئەندەرکەش، بۆکان، بێتووش، چمیان و مەدرەسەکانی ئەو دەوروبەرەی بە چاوی خۆی دیتوون؟ یان مەدرەسەی قەزا بچووکەکانی سەر بە سلێمانی وەک قەرەداغ، هەڵەبجە، گوڵعەنبەر، بیارە، بازیان، قزلجە، عەسکەر، ئاغجەلەر، مەرگە، ماوەران، پشدەر و مەدرەسەکانی ڕواندز، کۆیە، هەولێر، ئامێدی، خۆشناو، شەمدینان و شوێنانی دیکەی دیتووە و هیچ ئاگای لێیان هەیە؟ کە هەر یەک لەو مەدرەسە و حوجرانە وەک دارولمەعاریفێکن.

کونسوڵ هیچ جار چاوی بە زانایانی بەشەڕەف کەوتووە لە شیرەڤان، تالش، گەیلان، داغستان و شارەکانی ترەوە بۆ زانست و خوێندن و هونەر دێنە مەدرەسە و حوجرەکانی کوردستان و دەرسە سەرەکییەکانیان دەخوێنن و ئیجازەتنامەی زانستی وەردەگرن و بۆ بڵاوکردنەوەی زانستی نوورانی دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان؟

نەخێر، هەرگیز کونسوڵ نە ئەو شتانەی بیستووە و نە دیتوونی و نە لێکۆڵینەوەیشی لە بارەوە کردوون. ئایا کونسوڵ دەزانێ کە ئەمڕۆ زۆربەی زانا و مەدرەسە و حوجرەکانی شارەکانی ئەرزەڕۆم، دیاربەکر، مێردین، سیواس، خەرپووت، موسڵ، حەلەب، بەغدا، شام، میسر، مەدینەی مونەوەرە و مەککەی موعەززەمە کوردن؟ نا، نازانێ! یان بەرهەمە زانستییە بەسوودەکانی هەندێک لەو کەسایەتییە خاوەن فەزڵانە و زانا کوردانەی کە لە تەکیەی هومول و هافای ئیستەنبوڵن دەناسێ کە ئەمڕۆ لە ڕۆژناماندا ناسراون و دەناسرێن؟ نا، بێگومان نایانناسێ!

**کونسوڵ نە دەتوانێ ئەوانە بناسێ و نە شیاوی ئەو تێگەشتنەشە لە بەرهەمەکانیان.**

کونسوڵ؛ ئەندازەی نفوسی کوردانی شارستانی و کوردانی سەر بە عەشیرەت و خێڵە کۆچەرییە کۆنەکانی ڕەشانیش نازانێ، لەسەر ئەوانە زانیاریی هەڵەی بڵاو کردۆتەوە. وەک لە پەندی پێشینانی عەرەبان هاتووە: «صاحب الدار يدری ما فی الدار.» بەڵام بەداخەوە سەد جار بەداخەوە کە ئەو کونسولانە هەمیشە لەسەر دەوڵەتی باڵای عوسمانی و میللەتی نەجیبزادەی مسوڵمان زانیاریی پڕ لە کەموکوڕی و هەڵە دەدەنە دەوڵەتەکانی خۆیان و هەروەها وتارەکانیشیان لە ڕۆژنامەکانیان بە وتاری ڕاست و دروست بڵاو دەکرێنەوە، نازانن کە وتارەکانیان بێبناغەن و زانیارییەکانیان لە

سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەرنەگیراون. نازانن کە لەلای ئەو کەسانە هەستی بەیەکەوەگرێدان و یەکبوونی دەوڵەتێ کەمترە لە دەستکەوتنی ناوبانگ و شۆرەت!

هیوادارین کونسوڵ دوای ئەو زانیارییانە، هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە و بە هیچ جۆرێکیش لێمان دڵگران نەبێ و بەم ڕستەیەی نالی کۆتایی بە نووسینەکەم دێنم:

**بۆچی نەگریم سەد کەرەتم دڵ دەشکێنێ**
**بۆچی مەی نەڕژێ شیشە لە سەد لاوە شکاوە**

لە ساڵی ١٨٨٨دا بە هۆکاری ئەوەی ناجم سەرپێچیی یاساکانی دەوڵەتی کردووە و گوێڕایەڵ نەبووە، بۆ ماوەیەک لە کاری فەرمانبەریی دەوڵەت دوور دەخرێتەوە. دوای لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە، لە ساڵی ١٨٩٠دا دیسان دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی خۆی و سەرەتا لە ئەدەنە و دواتر لە ساڵی ١٨٩٤ وەک سەرۆکی فەرمانگەی سزای گواستنەوە لە ئەلعەزیز دەوامی خۆی دەکات.

## وتار و کتێبە چاپکراوەکانی:

نووسەر بە ناوەکانی مەولان بەگزادە عەبدولڕەحمان ناجم ئەفەندی، ناجم ئەفەندی، عەبدولڕەحمان ناجم، مدعی عمومی ویلایت خداوندگار عبدالرحمن، عبدالرحمن ناجم افندی، سابق خداوندگار مدعی مومیسی ناجم افندی؛ زۆر وتار و نووسینی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە تورکی و عەرەبییەکان نووسیوە.

هەندێک وتاری سەرنجڕاکێش و گرنگی لە ڕۆژنامەی «ترجمان حقیقت» بڵاو کردوونەتەوە. باسی شاعیرانی کوردی وەک فزولی، نالی، مستەفا بەگی کوردی بە زمانی عەرەبی و فارسی نووسیون.

ناوبراو لە کۆتایی ژیانیدا ئەو کاتەی سەرۆکی دادگای ئیستئیناف بوو لە شاری ئەلعەزیز، لە ٢٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٥ لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە١.

## کتێبە چاپکراوەکانی:

١. دفتر کتبخانەء داماد ابراهیم پاشا، چاپخانەی اوقاف اسلامییە، شوباتی ساڵی ١٨٦٣.

ئەم کتێبە بیبلۆگرافیای کتێبە چاپکراوەکانی سەردەمی عوسمانیی تێدایە، تێیدا ١١٥٢ بەرگی کتێب باس دەکات و زانیارییان لە بارەوە دەخاتە ڕوو.

٢.


دفتر
کتبخانهٔ داماد ابراهیم پاشا
Belediye
KITAPLARI

ڕاهنمای دیاربکر/ڕاهنمایی ناجم

گەشتنامەیەکە بە زمانی تورکی کە لە ساڵی ١٣٠٢ی کۆچییەوە بەرامبەر ٢٧ی نیسانی ساڵی ١٨٨٥ی زایینی لە ئەستەنبوڵەوە بەرەو دیاربەکر هاتووە و چیی دیوە لە ڕێگەدا، هەمووی بە شێوەی شیعر نووسیوە. ئەم کتێبە لەگەڵ کتێبی «گلزار آثار» چاپ کراوە.

٣. گلزار آثار، مطبعة الادبیة، بیروت، ١٨٩٢/١٣٠٩.

ئەم کتێبە ٣٧٢ لاپەڕەیە و گوڵبژێرێکە لە شیعری تورکی و فارسی و عەرەبی.

٤. تسهیل التحصیل، مایسی ١٨٦٥، بەبێ شوێنی چاپ.

کتێبێکی بچووکە لە بارەی نەحووی عەرەبییەوە.

٥. هدایة الامم وینبوع الاداب والحکم، بیروت، ١٨٩٠، ٥٩٠ لاپەڕەیە.

ئەم کتێبە کۆکراوەی هەموو ئەو بەسەرهات و

گفتوگۆ و ئاخاوتنە خۆشانەیە کە بە درێژایی سەدان ساڵ وەک ئامۆژگاری و حیکمەت بەکار هاتوون.

لە کۆتایی ئەم کتێبەدا وەک نرخاندن، چەند زانا و کەسایەتییەکی ناودار بە شیعر و پەخشان تەقریزیان بۆ نووسیوە.

لە کتێبی «معجم البابطيين»، بەکورتی باسی ژیانی هاتووە و ئاماژە بەوە دراوە کە ناوبراو لە ڕۆژنامەی «الجوائب» لە ژمارە ١٤ی ساڵی ١٨٦١دا قەسیدەیەکی بڵاو کردۆتەوە، بۆ بەدواداچوون تەماشای هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکەمان کرد و چەند دێڕی دیکەشمان بەرچاو کەوتن بە زمانەکانی عەرەبی، فارسی و تورکی کە لە کتێبەکەدا ئاماژەی پێ نەکردبوو. چەند نموونەیەک لە شیعرەکان:

**إلـيك الـحكـم فـي الأيـــــــام آلا**
**ومـنكُ الـمـلك بـالإقبـال نـــــــالا**

**تهلَّلَ فـيك وجه الـمـجــــــد بِشْرًا**
**وأشـرقَ بـهجةً وزهـا جـمـــــــالا**

**بدا نجمٌ**
**فـي عصرنـا قـد بـدا نجـمٌ ذوائبـــه**
**نـورٌ يبشِّر بـيـن الكـون إعـلانـــــا**

**بأنه مع طلـوعـي للأنــــــــام غدا**
**عـبدالعزيـز وللإسلام سلطـانـــــا٢**

٦. هويت سبحاني و ماهيت انسانيه دائر رسالەدر.

ئەم کتێبە هەشت لاپەڕەیە و بە دەست نووسراوەتەوە و هەر بەو شێوە خۆشنووسییە چاپ کراوە. شیعرێکی یازدە دێڕیی خۆی بە تورکی نووسیوە کە لە تەسەوفدا زۆر قووڵ بۆتەوە و پاشان هەر بە زمانی تورکی شرۆڤەی دێڕ بە دێڕی شیعرەکەی کردووە. لە کۆتاییەکەدا ساڵی ١٢٩٦ی کۆچیی نووسیوە، کە دەکاتە ساڵی ١٨٧٩ی زایینی. وا دیارە هەر بە خەتی خۆی ئەو کتێبەی بۆ والیی ویلایەتی سووریە؛ بەهائەدین بەگ ئەفەندی ناردووە. کتێبەکە ساڵ و شوێنی چاپی بەسەرەوە نییە.




٧. دفتر کتبخانه راغب پاشا

ئەم کتێبەش دەفتەرێکە بۆ پێڕستی کتێبەکانی کتێبخانەی ڕاغیب پاشا




٨. صفوة الكلام، ترجمة عبدالرحمن ناجم و محمد نزهت.

ئەم کتێبە بۆ قوتابخانەکانی ڕوشدییە ئامادە کراوە و زیاتر چەند وتەیەکی عەرەبین و لە بەرامبەریاندا بە تورکی وەرگێڕدراون. هەروەک لە ناوەڕۆکی کتێبەکەدا دیارە هەردوو نووسەر ئامادەیان کردووە و وەریانگێڕاوە. کتێبەکە ٤٨ لاپەڕەیە و لە ساڵی ١٨٦٨ لە چاپخانەی عامرەی ئەستەنبوڵ چاپ کراوە.

لە هەردوو کتێبخانەی ئەرزەڕۆم و کتێبخانەی شارەوانیی گەورەی ئەستەنبوڵ پارێزراوە.

٩. پوختەی زانستی مەنتیق بە تورکی (ترکچە منطق خلاصەسی) ئەم کتێبە ئەو کاتە چاپ کراوە کە ناجم سەرۆکی دادگای ئیستئینافی دیاربەکر بووە، هەروەک لە بەرگەکەیدا ئاماژەی پێ دراوە. کتێبەکە لە چاپخانەی مەحموود بەگ لەنزیک بابی عالی لە ساڵی ١٨٨٦ چاپ کراوە.

ئەم کتێبەش لە کتێبخانەی ئەرزەرۆم پارێزراوە.

عەبدولڕەحمان ناجم چەند دەستخەتێکی دیکەی لەپاش بەجێ ماوە، کە لە کتێبخانەکانی عەرەبستانی سعوودیدا دەبینرێن، لەوانە:

- الاحادیث النبویة، عبد الرحمن ناجم، السلیمانی، ژمارە ٢٩٢٦، المکتبة المرکزیة السعودیة.
- تسهیل التحصیل، عبد الرحمن ناجم افندی الشهرزوری البیروتی، الرقم ١٣٦٥، تاریخ النشر: ١٣٠٧ه مکتبة المسجد النبوی، عدد الاوراق: ١٠. التصنیف: النحو والصرف والعروض.
- احسن الدلالة علی الرسالة، عبد الرحمن ناجم افندی الشهرزوری، الرقم: ١١٩٧٣، مکتبة مرکز الملک فیصل للبحوث والدراسات الاسلامیة، التصنیف: تصوف.
- انتخاب بعض الفوائد من کتاب العقد الفرید للملک السعید، عبد الرحمن ناجم افندی، الشهرزوری، الرقم: ١١٩٧٣-٢٤ مرکز الملک فیصل للبحوث والدراسات الاسلامیة، التصنیف: أدب.

## پەراوێزەکان:

١. بەشی زۆری ژیاننامەکە وەرگیراوە لە کتێبی:
Seîd veroj, portreyên şophiştî, weşanên dara,diyarbekir, 2019, r 45-56.

٢. جریدة الجوائب، العدد ٨، ١٩ تموز ١٨٦١م، ص٣.

## سەرچاوەکان:

Seîd Veroj, Portreyên şophiştî, weşanên Dara,Diyarbekir, 2019.

- جریدة الجوائب، العدد ٨، ١٩ تموز ١٨٦١م.
- ماڵپەڕی مرکز الملک فیصل للبحوث والدراسات الاسلامیة.
- معجم البابطین لشعراء العربیة فی القرنین التاسع عشر والعشرین. لە ساڵی ٢٠٠٨ دەرچووە و زیاتر لە ٢٥ بەرگە و لەسەر ئینتەرنێت و لەم ماڵپەڕدا جێگیر کراوە. ئینتەرنێت: http://www.almoajam.org
- بەرهەمەکانی عەبدولڕەحمان ناجم لە هەردوو کتێبخانەی زانکۆی ئەرزەڕۆم و کتێبخانەی شارەوانیی گەورەی ئەستەنبوڵ.
- ئەرشیڤی ڕۆژنامەی «ترجمان حقیقت».



# بڵاوکراوەی نوێی
# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی




# بەمزوانە









# کتێبی هونەری ژیانسازیی لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن

خوێندنەوەیەکی نوێیە بۆ شێوازی ژیانکردنی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە سێ بەرگدا: بەرگی یەکەم: هونەری سەرکردایەتیکردن لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن. بەرگی دووەم: هونەری گفتوگۆکردن لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن. بەرگی سێیەم: هونەری بەختەوەری خێزان لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن هەر بەرگێکیان لە چەندین بەش پێکهاتووە و هەر بەشێکیش چەندین نموونەی ڕاستەقینەی لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن (درودی خوای لەسەر بێت) لەخۆگرتووە، تێکڕایان چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ماڵ و خێزان، هاوەڵانی، دەوروبەری، پاشان شێوەی گفتوگۆکردنی لەگەڵ هاوبەشداران، گاور و جولەکە، سەرکردەکانی جیهان، بکوژ و تیرۆرستان، ئەوجا لەگەڵ هاوەڵان و هەرزەکار و منداڵ و خێزانەکانی خراوەتە ڕوو. بەرگێکی دیکەی ئەم کتێبە تایبەتە بە شێوازی پەروەردەکردنی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) و ڕێباز و ڕێنماییەکانی لە بواری پەروەردە و چۆنیەتی بەختەوەرکردنی خێزان، لەگەڵ ماف و ئەرکی تاکەکانی خێزان لەسەر یەکتر.

نووسینی پرۆفیسۆر سلێمان بن عوض قیمان. وەرگێڕانی : تۆفیق کەریم.

ئێستا لە کتێبخانەکانی شار و شارۆچکەکانی کوردستان دەستدەکەون.

دابەشکاری سەرەکی: سلێمانی: کتێبخانەی ڕێنوین - هەولێر: کتێبخانەی ڕێدار.

دواخاڵ



# ئاوڕدانەوەیەك لە بەها باڵاكانی شارستانیەتی ئیسلامی

د. عەدنان هەورامانی

خوێندنی شارستانیەتی ئیسلامی لە پەیمانگاو زانكۆكانماندا گرفتارە بەدەست چەندین كەمو كورتیەوە، دیارترینیان پێشكەشكردنی ئەم شارستانیەتەیە بە پچڕ پچڕی، ئەمەش وەک لەتکردنی جەستەی ئەم شارستانیەتەیەو مایەی لەدەستدانی کەسایەتی و تایبەتمەندیەتی لە نێو شارستانیەتەکاندا، دواجار وەک چەند چالاکییەکی ڕۆشنبیری و زانیاری و مەدەنیانەی لێدێت لەم بوارەدا، بەچەند تایبەتمەندیێکەوە، ئیتر نابێتە دیدگاو بۆچوونی کۆتایی هەڵگرانی ئەم شارستانیەتە بۆ ژیان.

خوێندكارانمان قۆناغەكانی خوێندن تێدەپەڕێنن، بەڵام زانیاریەكی وردی تایبەتمەندیەكانی شارستانیەتی ئیسلامی نازانن، نازانن چی ئەم شارستانیەتە لەوانی تر جیا دەكاتەوە، بەڵكو توانای ئەوەیان نییە كە شانازی بەم شارستانیەتەوە بكەن، چونكە خوێندنی شارستانیەت دەبێت هەڵگری دیدێكی پەروەردەییانە بێت، بەڵام بەم جۆرە هەڵە مامەڵە كردنە ئەم لایەنە پەروەردەییە ون دەبێت و خوێندكار ناتوانێت پەنا بۆ ئەم شارستانیەتەی ببات لەبەرامبەر كایە گرنگەكانی ئەم جیهانە، بەڵكو هەندێكجار ئەنجامەكە پێچەوانە دەبێتەوە و پۆلێكی بێ شومار لە دەرچوان دژایەتی شارستانیەتەكەیان دەكەن و سەرسامی شارستانیەتەكانی تر دەبن، بەهۆی ئەو دیمەنە بریقەدارەی شارستانیەتی ڕۆژئاوا هەیەتی، بەمەش خوێندنی شارستانیەتی ئیسلامی دەبێتە چەكێك دژ بەخۆمان و متمانەی پێ لەدەست دەدەین و پێمان وادەبێت كە توانای مانەوەو كاردانەوەی نابێت لەم سەردەمەدا، ناتوانێت جارێتر داڕێژەرەوەی پاشەڕۆژی مرۆڤایەتی بێت.

گومانی تێدا نییە لە لێكۆڵینەوەی شارستانیەتی ئیسلامیدا ڕۆژئاوا پێش ئێمە كەوتوون، هەوڵە لەبەرچاوەكانی مێژوونووسی بەریتانی (ئەرنۆڵد تۆیبینی) لە دانراوە ناسراوەكەیدا بە ناوی (دراسة للتأريخ) ، مامەڵەیەكی وردی لەگەڵ شارستانیەتەكاندا كردووە بۆ ماوەی بیست نۆ ساڵ، بەدواداچوونی وردی بۆ مێژوو كردووە، دیارە هەموو شارستانیەتێكیش خاوەنی خەسڵەتگیری تایبەتمەندی خۆی بووە و ڕێخۆشكەر بووە بۆ شارستانیەتی دوای خۆی.

بەهەرحاڵ ، ئێمە لەمڕۆدا كە هەوڵی ئەوە دەدەین لە شارستانی ئیسلامی بكۆڵینەوە، زیاد لە هەموو كاتێك پێویستمان بە میتۆدێكی نزیك لەو میتۆدەی (ئەرنۆڵد تۆیبینی)یە، بە جۆرێك مامەڵە لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامی بكات، كە خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بێت لە سەرجەم بوارەكاندا، كاتێ زانیمان كە ئەم شارستانیەتە لە نەبوونەوە یەكسەر هەڵنەتۆقیوە، لە شارستانیەتەكانی تر بەشێوەیەكی میكانیكی تایبەتمەندی وەرنەگرتووە تا قەرزارباریان بێت.

لەمڕۆدا زیاتر لە جاران پێویستیمان بە لێكۆڵینەوەی شارستانیەتی ئیسلامییە، چونكە ئێمە

لەبەرامبەر بانگەشەی پێشکەشکردنی بەدیلێکی نوێ و پرۆژەیەکی شارستانی تازەداین، بەهۆی دروستبوونی ئەو بۆشاییە ڕۆحیەی کە زۆرێک لە سیستەم و بۆچوون و ئەزموونە دەستکردەکان هێناویانەتە کایە.

یەکەم وشەیەک کە لە ئەشکەوتی حیرا دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر) ، بە ڕستەی نەفی دەستی پێنەکرد، نەیفەرموو: ( لا تقتل ، لا تسرق ، لا تزن ... هتد ) بەڵکو بە ڕستەی ئیجاب و ئەرێنی دەستی پێکرد، جەختکردنەوە بوو لە ئەنجامدانی کردایێکی مەعریفی کە خوێندنە: [اقرأ باسم ربک الذي خلق * خلق الإنسان من علق * اقرأ وربک الأکرم * الذي علم بالقلم * علم الإنسان ما لم یعلم ] (سورەتی العلق: ١ ـ ٥)، خوێندنەوە و زانست و قەڵەم، ئەمانە وشە پێکهێنەرەکانی یەکەم سورەتێکن کە بۆ یەکەمجار دادەبەزێت.

هەر تەنها بەوەوە نەوەستاوە، بەڵکو واتای ئەم کایە مەعریفیە درێژ بوەتەوە بۆ زەمەنێکی دوورتر، تا ساتەوەختی دروست بوونی پێغەمبەر ئادەم (درودی خوای لەسەر) کە خودا فێری هەموو ناوەکانی کرد و دواتر بەخشیە نەوەکانی، تا جەستە و ژیریان ئامادەی ئاوەدانکردنەوەی جیهان بێت: [وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ] (سورەتی البقرة: ٣١ ــ ٣٣).

قورئانی پیرۆز جەخت دەکاتەوە لەوەی کە ئێمە ڕوو و پێش بڕوانین و لا نەکەینەوە بۆ دواوە، جگە لە چەند حاڵەتێکی پێویستدا نەبێت، ئەویش لە باب و باپیرانەوە کەلەپوورێکی زانستی و مەعریفی وەرگرین و بیکەینە ڕێنیشاندەر بۆ ئاگادار بوون لە ڕاست و هەڵەی پێگەی ئێستەمان، چونکە ئەگەر تەنها بۆ چاولێکردنێکی کوێرانە بێت، ئەوا بە عەیبە و نەنگی ئەژمار دەکرێت و پێچەوانەی ویستی ئەو ئیرادەیە کە قورئان بانگەشەی بۆ کرد: [قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا ؟] (یونس : ٧٨) ، [ إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ ] (الزخرف : ٣٣) ، ئەم جۆرە تەقلیدو شوێنکەوتنە ئیسلام بە توندی بەربەرچی دەداتەوە.

توینبی : کە مێژوو نوسێکی بەریتانی ناسراوە، ئاماژە بە دوو مامەڵە دەدات لەگەڵ کەلتوری باب و باپیراندا، مامەڵەیەکیان: تەقلیدێکی کوێرانەیە، ئەمەش لەقۆناغی شکستی شارستانیەتدا بوو، مامەڵەیەک کە دواکەوتنی شارەزایان و داهێنەرانە، ئەمەش بە قۆناغی گەشەسەندنی شارستانی ئەژمار دەکرێت، قورئانی پیرۆز یەکەمیان ڕەفز دەکات ، چونکە مایەی نشوستی و دواکەوتنە.

لە کۆتاییدا: قورئانی پیرۆز پانتاییەکی زۆری مێژوو بۆ ئێمە باس دەکات، تا بەدوای پەندو عیبرەتەکانیدا بگەڕێین و بۆ داهاتووشمان کەڵکی لێوەربگرین: [لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثاً يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدىً وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ] (یوسف : ١١١).